# برسێتی

کنووت هامسۆن

خاوەن خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب

حەمە قادر کردوویە بە کوردی



کنووت هامسۆن، نووسەری خاوەن نۆبڵی نەرویجی یەکێکە لە ڕێبەرە گەورەکانی ئەدەبیاتی مۆدێرن. ناوبراو کانگەی ئیلهام بووە بۆ دەیان نووسەری دوای خۆی و ڕۆمانی برسێتی ناودارترین ڕۆمانییەتی، کە کراوە بە دەیان زمانی جیهانی و سەدان و هەزاران وتار و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی لەبارەوە نووسراوە.

له زنجیره بڵاوکراوەکانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب: **(١٢٥)**

# برسێتی

## کنووت هامسۆن

**حەمە قادر**

**کردوویە بە کوردی**


- بەرگ: هورمەن عەلیزادە
- نەخشەسازیی ناوەوە: ئاوات کەریم مستەفا
- ڕێنووس و هەڵەچنی: غەزەلنووس
- بابەت: ڕۆمان
- چاپ: یەکەم
- چاپخانە: تاران- پەنجەرە
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: (٦٠٠٠) دینار
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(١١٥٣)ی ساڵی(٢٠١٦)ی پێ دراوە

**سلێمانی- مەیدانی پاسەکانی تووی مەلیک- نهۆمی زەمینی بازاڕی کتێب**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٠٧٧٠٣٥٧٣٧٥٧**

# برسێتی

کنووت هامسۆن

حەمە قادر
کردوویە بە کوردی

چاپی یەکەم
٢٠١٦

بەدەم هەڵدانەوەی توێژاڵەکانی شەو و ئازارەوە، بۆ هاوڕێیان:

ڕەوەز حەمەساڵح
ئاوات کەریم مستەفا

**کنووت پدرسۆن**، کە دواتر خۆی بە **کنووت هامسۆن** ناونا، لە ١٨٥٩ لە خێزانێکی گوندنشینی نەرویج لەدایکبووە. قۆناغی یەکەمی ژیانی خۆی لە باکووری نەرویج، لە ناو جووتیارەکانی ئەو ناوچەیەدا بەسەربرد و دواتر لە گەنجێتیدا ڕووی لە شار کرد و ژیانێکی پڕبەسەرهات و سەختی دەست پێکرد. **هامسۆن** خوێندنێکی ڕێکخراو و بەردەوامی نەبوو و دەتوانین بڵێین کەسێکی خۆڕاهێن بووە، جگە لە توانای ئەدەبی و خەیاڵی فراوان هیچ سەرمایەیەکی تری نەبوو، گەڕۆک بوو و بەردەوام شوێناوشوێن دەگەڕا، دڵی لە شوێنێک دانەدەمەزرا و بەردەوام لە هاتوچۆدا بوو و بۆ ژیانیشی دەستی داوەتە هەموو جۆرە کارێک. **هامسۆن** خۆی دەڵێت:

*"لە نەرویج بوومە مامۆستای قوتابخانە، بوومە کەناس، بوومە شاگردی دووکان و تەنانەت حەماڵیشم کرد، لە ئەمریکا جووتیار بووم، شۆفێری فارگۆن بووم، شاگردی بازرگانەکان بووم و هەندێ جاریش تەنانەت وتاری هونەری و ئەدەبیم پێشکەش دەکرد."*

بەشێکی زۆر لە گەنجێتی **کنووت هامسۆن**، بە برسێتی و دەربەدەری قورس تێپەڕی، نەیتوانی لە نەرویج بمێنێتەوە و بەرەو ئەمریکا هەڵهات. چەندین ساڵ لە ئەمریکا مایەوە، بەڵام ژیان لە ئەمریکای پێخۆش نابێت و لەوێشەوە دەستی بە سەفەری درێژ کرد بۆ ئەورووپا و وڵاتانی خۆرهەڵات. لە کۆتاییشدا لە تەمەنی ٥٢ ساڵیدا، توانی شتێک پارە کۆ بکاتەوە و لە گوندێکی باکووری نەرویج، هێمن و بێدەنگ ئۆقرە بگرێت و خەریکی نووسین بێت.

**هامسۆن**، لەماوەی ٩٢ ساڵ تەمەنیدا چەندان کتێبی ئەدەبی و ڕۆمانی نووسیوە، لە ١٩٢٠دا توانی بۆ ڕۆمانی **برسێتی** خەڵاتی نۆبڵی سویدی بباتەوە. بەرهەمەکانی ناوبراو، شێوازی نووسین و گرنگییەکەی لە لایەن دەیان نووسەری جیهانییەوە ستایش کراون. **هامسۆن** بە یەکێک لە پێشەواکانی بزوتنەوەی شەپۆلی هۆش لە ئەدەبدا دادەنرێت، بزوتنەوەیەک کە دواتر لە کتێبەکانی **مارسێل پرووست**، **جیمس جۆیس**، **ڤێرجینیا وۆلف** و ... درێژەی پێدرا. ڕەخنەگرەکان بە گشتی دان بە گرنگی و کاریگەریی ئەدەبی **هامسۆن** لە سەر ئەدەبی مۆدێرندا دەنێن؛ **هێرمان هێسە**، **کنووت هامسۆن**ـی بە نووسەرە خۆشەویستەکەی خۆی دەزانی. **هێمنگوەی** بەردەوام داوای لە **سکۆت فیتزجێراڵد** (نووسەری **گەتسبیی مەزن**) دەکرد کە کتێبەکانی **هامسۆن** بخوێنێتەوە. **ئەندرێ ژید**، **کنووت هامسۆن** لە ئاستی **دۆستۆیڤسکی**دا دەبینێت. **بۆکۆفسکی**، **هێنری میلەر**، **پۆل ئاوستەر** و چەندین نووسەری گەورەی تر شەیدایی خۆیان بۆ هامسۆن نەشاردۆتەوە، تەنانەت ئاماژە بەوە دەکرێت کە **کافکا** چیرۆکی (**هونەرمەندی برسێتی**) لە ژێر کاریگەریی ڕۆمانی برسێتیدا نووسیبێت.

**برسێتی**، یەکەم ڕۆمانی **هامسۆن**ـە کە لە ١٨٩٠ نووسیویەتی، ڕۆمانێک کە بازنەی ستایش و بەشاکارزانینی، ئێجگار فراوانە و سەدان و هەزاران وتاری ڕەخنەیی و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە نووسراوە. کاریگەریی لە سەر چەندین ڕۆمان و چیرۆکی دوای خۆی داناوە، دوو جار کراوەتە فیلم و لە لیستی ڕۆمانە شاکارە ئەدەبییەکانی چەندین ڕۆژنامەی جیهانیدا وەک کتێبێکی گرنگ، وەک کتێبێک کە پێش مردن دەبێ بیخوێنینەوە پۆلێن کراوە.

*****

نەرویجییەکان، ڕێز لەم نووسەرەیان دەگرن، بەڵام نایشارنەوە کە دڵیان لە **هامسۆن** ئێشاوە؛ ناوبراو، ئەندام و لایەنگری نازییەکان بوو،

خەڵاتە نۆبڵەکەی پێشکەش بە **گۆبلز** (وەزیری ڕاگەیاندنی **هیتلەر**) کرد و چەندین جار بە فەرمی سەردانی **هیتلەری** کرد، هەر ئەمەش وای کرد لە کاتی مەرگی **هامسۆن**دا، ئەوانەی پێشتر شانازییان بەم نووسەرە گەورەیەوە دەکرد، لە ڕێورەسمی ناشتنەکەیدا ئامادە نەبن.

*****

**هامسۆن**، لای خوێنەرانی ڕۆمان لە کوردستان نووسەرێکی ناسراو نییە، کتێبەکانی نەکراون بە کوردی و ئاوڕدانەوەی ڕاگوزەریشمان بۆ ئەم نووسەرە گەورەیە نەبووە. هیوادارم وەرگێڕانی ڕۆمانی **برسێتی** (کە ناودارترین ڕۆمانی ئەم نووسەرەیە)، دەرگایەک بکاتەوە لە سەر وەرگێڕانی بەپرۆژە و باشتری ئەم نووسەرە. سەرچاوەی سەرەکیی ئێمە بۆ ئەم وەرگێڕانە زمانی فارسی بووە، لە فارسیدا ڕۆمانی برسێتی سێ جار وەرگێڕدراوە، ئێمە پاش بەراوردکردن و هەڵسەنگاندنی هەر سێ وەرگێڕانەکە گەیشتینە ئەوەی باشترین وەرگێڕانیان ئەمەیە: (گرسنه، کنوت هامسون. دکتر غلامعلی سیار. ۱۳٤۵)، بێگومان ئەم وەرگێڕانە ئەگەرچی بەهۆی کۆنبوون و هاتنی دوو وەرگێڕانی تازەتر لە ئێران، تا ڕادەیەک لە بیر کراوە، بەڵام بەراوردکرنی هەندێ شوێن و زمانی کتێبەکە، ئەوەی سەلماند کە دوو وەرگێڕانەکەی تر نەیانتوانیوە زمانی کتێبەکە بەباشی بگوازنەوە، تەنانەت هەڵە و کێشەی سانسۆریشیان هەیە. ئەگەرچی **ئەحمەد گولشیری** (کە وەرگێڕێکی زۆر ناوداری ئێرانە) ئەم ڕۆمانەی وەرگێڕاوە و خوێنەرێکی زۆری هەیە، بەڵام وەک وترا **گولشیری** ڕۆمانەکەی یەکئاست و یەکزمان کردووە بە فارسی، کە ئەمەش بێگومان ناکۆکە لەگەڵ زمانی پاڵەوانی ڕۆمانەکە، کە گێڕەرەوەش خۆیەتی. پاڵەوانی ڕۆمانەکە نووسەرە، بەپێی دۆخە دەروونی و حاڵەتەکانی ناو ڕۆمانەکە، زمانی جیاواز بە کاردهێنێت؛ هەندێ جار زمانی فەرمی، هەندێ جار زمانی سەرجادەیی و هەندێ جاریش

شــاعیرانە و وەســفئامێز. لە زۆر شــوێندا نووســینی پەراوێــز بــۆ تێگەیشــتن لە مەبەســتی نووســەر زۆر گــرنگە، **گولشــیری** هــیچ پەراوێزێکی دانەناوە و هەڵەی زیاتریش، کە لێرەدا بواری نووسینیان نییە. هەرچۆنێک بێت ئەوەی کە سەرچاوە سەرەکییەکەی ئێمە لە ژێر چاودێریی سەفیری ئەوکاتی نەرویج لە تاران کراوە، هانیداین زیاتر پشتی پێ ببەستین. لە لایەکی دیکەشەوە بە یارمەتی هەندێ هاوڕێی عەرەبیزان هەندێ جار دەگەڕاینەوە بۆ وەرگێڕانە عەرەبییەکەی (الجوع. كنوت هامسون. ترجمها علي مولا. دار المدى)، چانسی ئەوەشمان هەبوو بە یارمەتی هاوڕێیەک، لە نەرویج جاروبار بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی نەرویجی، لە ناوی کەسەکان و شوێنەکاندا وردەکار بووین. بەگشتی پاش هەڵسەنگاندنی هەموو ئەم سەرچاوانە یەکلابووینەوە، کە باشترین سەرچاوە بۆ وەرگێڕانی ڕۆمانەکە بە زمانی فارسی، وەرگێڕانێکە کە ئێمە پشتمان پێ بەستووە. لێرەوە سوپاسی هەموو ئەو هاوڕێیانە دەکەم، لە کاتی هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان، بە زمانی عەرەبی و نەرویجی و ئینگلیزی و دەستخستنی هەر سێ وەرگێڕانە فارسییەکە یارمەتیدەری من بوون.

*****

یەکێک لە گرنگترین نووسینە ڕەخنەییەکان کە لە سەر ئەم ڕۆمانە نووسرابێت، وتارێکی **پۆل ئاوستەر**، نووسەری هاوچەرخی ئەمریکییە، کە ئێمە وەک پاشکۆیەک لە کۆتایی کتێبەکەدا دامانناوە. ئەگەرچی بە ڕای من ڕۆمان دەبێ بە ڕووتی و بەدەر لە هەر ڕەخنە و شیکارێک بچێتە بەردەم خوێنەرەکەی، بەڵام بەخۆشحاڵییەوە نووسینەکەی **ئاوستەر** ئەوەندەی هەوڵی فراوانترکردنی تاریکی و درزەکانی ناو ڕۆمانەکەی داوە، نەیویستووە ڕۆمانەکە ڕەمزشێکن بکات و کۆدەکانی بکاتەوە، ئەمەش ڕەنگە ئیشی هەر ڕەخنە و

ڕەخنەگرێکی ڕاستەقینە بێت، کە لە تەنیشت تاریکییەکی گەورەتر (ڕۆمانەکە)، تاریکییەکی دیکە دروست بکات، چونکە ئەگەر شتێک لە ئەدەبدا شایانی دۆزینەوە و بیرلێکردنەوە بێت، دەبێ لەم تاریکییەدا بدۆزرێتەوە؛ واتە یەکەم وانەی ئەدەبی مۆدێرن!

(حەمە)

ئەم بەسەرهاتە یادگاریی سەردەمێکە کە بە ورگی قوپاوەوە لە شاری **کریستیانیا**[1] ئاوارە بووم. کەس نییە پێ بخاتە ناو ئەم شارە سەیرەوە و پیایدا گوزەر بکات و کاری لێ نەکات...

لە کووخە فەقیرانەکەم، لە سەر چرپاکەم ڕاشکاوم، لە نهۆمی ژێرەوە گوێم لە زەنگی سەعات شەشە. ڕۆژ بووبووەوە و هاتوچۆی سەر پلیکانەکان دەستی پێ دەکرد. بەشێک لە دەرگای ژوورەکە بە ژمارە کۆنەکانی ڕۆژنامەی **مۆرن بلادە**[2] ڕووپۆش کرابوو؛ بەتەواوی دەمتوانی لە ناوەڕاستی ڕۆژنامەکە ڕیکلامی "بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی فانۆسە دەریاییەکان" و لای چەپیش بە پیتی درشت و زبر ڕیکلامی نانی تازەی **فابیان ئێلسن** بخوێنمەوە.

وەک عادەتی جاران، یەکسەر چاوم زەق کردەوە و بیرم کردەوە ئایا ئەمڕۆ شتێک هەیە پێی دڵخۆش بم یان نا؟ بەم دواییانە ئێجگار دەستکورت بووم، کەلوپەلی ماڵەکەم یەکبەیەک دەخستە ڕەهنەوە، بووبووم بە کەسێکی تووڕە و دڵناسک، جگە لەوەش سەرگێژەم

---

[1] مەبەست شاری "ئۆسلۆ"ی پایتەختی نەرویجە، کە لە کۆندا و لە کاتی نووسینی ئەم ڕۆمانەدا پێی وتراوە (Kristiania). لە دوای ساڵی ١٩٢٤ەوە پێی وتراوە "ئۆسلۆ". (و.ف)

[2] Morgen bladet: ڕۆژنامەی کۆنزەرڤاتیزمی نەرویژی کە بە شێوەی ڕۆژانە لە ئۆسلۆی پایتەختی نەرویژ بڵاو دەبووەوە. (و.ف).

هەبوو، هەربۆیە دوو سێ ڕۆژ لە چرپاکەم نەترازام و پێم لە ماڵ نەخستە دەرەوە، هەڵبەت هەندێ جاریش، یانی ئەگەر بەخت هەبوایە، بە نووسینی وتار لە ڕۆژنامەکان ئەوپەڕی پێنج کرۆنم دەست دەخست.

بەهەرحاڵ، ڕۆشنایی ڕۆژ بەرەبەرە زیاتر دەبوو، دەستم کرد بە خوێندنەوەی ڕیکلامێکی تەنیشت دەرگاکە، تا گەیشتمە ئەم ڕێکلامە؛ بۆ کڕینی کفن سەردانی خانمی ئەندرسۆن بکەن، لای ڕاست، لە دەرگای ژوورە گەورەکە بدەن، کە بە پیتی باریک و تێکەڵوپێکەڵ چاپ کرابوون و بەمجۆرە ماوەیەک خۆم سەرقاڵ کرد. هێشتا لە جێگەکەم هەڵنەسابووم و جلم لە بەر نەکردبوو، کە زەنگی سەعات هەشتی بەیانی لە نهۆمی ژێرەوە لێی دا، پەنجەرەی ژوورەکەم کردەوە و سەیری دەرەوەم کرد، چاوم بە کونجێکی حەوشەی ماڵەکە کەوت، کە تیایدا تەنافێکی جل هەڵواسرابوو. لەولاتریش پاشماوەی ئاگری کورەیەکی ئاسنگەری بەرچاو دەکەوت، چەند کرێکارێک سەرقاڵی خاوێنکردنەوەی ئەو شوێنە بوون. ئەنیشکم خستە سەر چوارچێوەی پەنجەرەکە و لە ئاسمانم ڕوانی و ئاشکرا دیار بوو ئەمڕۆ ئاسمان ساماڵ دەبێت. وەرزی پاییز، واتە وەرزی ئازار و شێوەنی سروشت هاتبوو. لەم کاتەدا هەموو شتێک ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت و لە ژیانەوە و دەبێتە ژان؛ لە ئێستاوە لە هەموو شوێنێک هەراوهوریا بەرپاخرابوو و ئەم هەرایەش بەرەو دەرەوە پەلکێشی کردم. ئەم ژوورە ڕووتوڕەجاڵە لە تابوتێکی بچووک دەچوو؛ لەگەڵ هەر هەنگاوێک تەختەکانی ژێر پێم دەلەرزین و دەیانجیڕاند، نە زۆپای هەبوو و نە کیلوونێکی ڕێکوپێک بە دەرگاکەیەوە! ڕاهاتبووم گۆرەوییەکانم لە شەودا بخەمە ژێرمەوە و لە سەری بخەوم، بۆ ئەوەی بەیانی کەمێک وشک بووبێتەوە. تاکە کەرەسەی سەرقاڵیم کورسییەکی بێشکەیی سوور بوو، کە شەوان لە سەری پاڵ دەکەوتم و سەرخەوم دەشکاند و دەکەوتمە دەریای بیرکردنەوەی جۆراوجۆر

و ســـەیرەوە. کە دەرگـــای خـــوارەوەش دەکـــرێتەوە و ڕەشـــەبایەک هەڵـــدەکات، دەنگێکـــی سەیروســـەمەرە لە بنـــی ژوورەکەوە بەرگـــوێ دەکەوێت، درز و کونی بەقەد لەپی دەست لە ڕۆژنامەی مۆرن بلادە دەم دەکاتەوە.

لە جێگەکەم هەستام، پەڕۆیەکی گرمۆڵەکراوم بەو هیوایەی شتێکی بۆ خواردن تێدابێت کردەوە، بەڵام هیچی تیا نەبوو و دیسان گەڕامەوە بۆ لای پەنجەرەکە، لە دڵی خۆمدا وتم خوایە خۆت باشتر دەزانی بۆ دەســـتکەوتنی کارێـــک هەمـــوو کونوقوژبنێـــک گەڕام و لە هەمـــوو دەرگـایەکم دا، نـاگەمە هیچ. شکسـتی یەک لە دوای یەک، ئەم هەمـوو بەڵێـنە بۆشـــە، ئەم هەمـوو ڕەتکـردنەوە بێمنەتـانەیە، ئەو هیوایـانەی جاروبار دەگەنە شتێک، بەڵام لەپڕ دەبنەوە بە نائومێدی و هەوڵگەلێک کە پەیتاپەیتا شکست دەهێنن، هەموویان ورەیان لێ بڕیوم! دواهەمـین جار ویستم ببمە خەزنەداری دووکانێک، بەڵام زۆر درەنگ ڕۆیشـتم و جگە لەوەش کەفالەتی پەنجا کرۆنم نەبوو. هەموو جارەکان لەمپەرێک دەهـاتە بەرپـێم، تەنـانەت خـۆم لە ناوەنـدی ئـاگرکوژێنەوە نـاونووس کرد، نزیکەی پەنجـا کەسـی خوازیـار هـاتبوون، هەمووومـان لە بەردەم ناوەنـدەکە کۆ بووبـووینەوە و سـنگمان دەرپەڕانـدبوو، تـا خۆمـان بە بەهێز و چاونەترس دەربخەین، بەرپرسێک بە ناوماندا دەگەڕا و هەڵی دەسەنگاندین، دەستێکی بە قۆڵماندا دەهێنا و چەند پرسیارێکی دەکرد، زۆر بە ئاسانی بە بەردەم مندا تێپەڕی، تەنیا سەرێکی جوڵاند و وتـی لەبەر چـــاویلکەکەت وەرت نـــاگرین. جـــاری دووەم بەبـــێ چـــاویلکە ڕۆیشـتم و ناوچـاوانم گرژ کرد، چـاوم وەک چەقۆیەک تیژ کردەوە، بەڵام دیسان هەمـان بەرپـرس لێوبەخەنـدە و بێبـاک بە لامـدا تێپەڕی، دیار بوو منی ناسـیوەتەوە، لەوەش ناخۆشتر جلەکانم کەمکەم هێندە شـڕ و پـیس بووبـوون، کە ئیتـر نەمـدەتوانی تۆزێـک بە حـورمەتەوە وەک کەسێکی ڕێکوپێک پێ بنێمە شـوێنێک و داوای کـار بکەم. لەبەر دۆخێکـی ســـەیر ســـەروماڵم هەمـــووی لە دەســـت دابـــوو، تەنـــانەت

شانەیەکیشم بۆ نەمایەوە؛ یەک کتێبم نەمابوو ئەو کاتانەی خەمی دنیا لە پەلوپۆم دەخات، بیکەمە هاوڕێم، هەموو هاوین ئیشم ئەوە بوو لە گۆڕستانەکاندا پیاسە بکەم یان بە **پارکی کۆشک**دا بگەڕێم. هەندێ جار لە سووچێکدا دادەنیشتم و وتارم بۆ ڕۆژنامەکان دەنووسی، لاپەڕەم ڕەش دەکردەوە و باسی هەموو شتێکم دەکرد؛ بیرکردنەوەی شێواوم خەیاڵپلاویی دەکرد و بیرکردنەوەی وەهماوی و بابەتی تازە و سەیری تێکەڵ دەکرد. چونکە لەبەر نائومێدی بێبایەخترین بابەتەکانم هەڵدەبژارد و چەندین سەعات بۆ نووسینی گێنگڵم دەدا، دواجاریش وتارەکە هەرگیز قبوڵ نەدەکرا. کە نووسینی پارچەیەکەم تەواو دەکرد، دەچوومە سەر نووسینی بڕگەیەکی نوێ و زۆر بەدەگمەن دەنا هەمیشە سەرنووسەری ڕۆژنامەکان دڵساردیان دەکردمەوە، بەردەوام بە خۆم دەوت دواجار ڕۆژی سەرکەوتنم دەگات! لێتان ناشارمەوە ئەوکاتەی دوانیوەڕوان دوای چەند سەعات ماندوویی، بەڕێکەوت وتارێک باش دەرچوایە، هەندێ جار پێنج کرۆنم دەخستە تەنکەی گیرفانمەوە.

دیسان لە بەردەم پەنجەرەکە لاچووم و لە دەستشۆرەکە نزیک کەوتمەوە، سەرئەژنۆی پانتۆڵەکەم بە کەمێک ئاو تەڕ کرد، بۆ ئەوەی تۆخ بێتەوە و تازەتر دیار بێت، پاشان وەکو هەمیشە قەڵەم و کاغەزم خستە گیرفانمەوە و لە ماڵ دەرچووم. بە پێدزکێ و بێدەنگ بە پلیکانەکاندا هاتمە خوارەوە نەوەک خانمی خاوەنماڵ پێم بزانێت، چونکە یەک کرۆنم پێ نەبوو و چەند ڕۆژێکیش بە سەر کرێی ژوورەکەمدا تێپەڕی بوو.

سەعات نۆی بەیانی بوو، دەنگی خەڵک و ئەسپوعارەبانەکانیش هەوایان پڕ کردبوو، دەتوت دەنگی پێی ڕێبوار و قامچی عارەبانەچییەکان وەکو کۆرسێک تێکەڵ بە هەرای کەیفوسەفای ئەو سپێدەیە دەبێت، جۆشوخرۆش و هاتوچۆیەک کە لە هەموو لایەکەوە دیار بوو، لە مندا وزەیەکی تازەی دروست دەکرد و دڵگەرمی

دەکـردمەوە. هەر بە خەیاڵمـدا نەهـاتبوو لەم هەوا تـازەیەی بەیانیـدا پیاسە بکەم، هەوای تـازە، هەڵمژینی سـوودی چی بوو، باسـی ئەوەم نەکـرد کە قەڵافەتیکـی دیوئاسـا و بەهێـزم هەیە و دەمتـوانی هەر بە هێزی شان ئەسپوعارەبانەیەک ڕاگیر بکەم! هەستێکی بەهێز و ناسک دەروونـی گرتبـوومەوە، بەو هەمـوو بێبـاکی و بەربـادییەی لە خۆمـدا دەمبینی، وەجد و خۆشـییەک داگیری کردبـووم، کە دەگەیشـتمە هەر کەس، یا هەر کەس بەلامـدا دەڕۆیشـت، بە وردی تەماشـام دەکرد، بە نەرمـی دەڕۆیشـتم و پۆسـتەرەڕیکلامی دیوارەکـانم دەخوێنـدەوە، لە یەک تەماشادا کە لە فارگۆنی کارەباییەوە ڕووی لە من دەکرد، دەیـان نهێنـی و ڕەمـزم دەخوێنـدنەوە؛ بچـووکترین و بێنرختـرن شـت کە لە بەردەممـدا دیـار و نادیـار دەبـوون کـاری تـێ دەکـردم و ڕۆدەچـوونە ناوم.

ئـای ئەگەر پیـاو لەم ڕۆژە خۆشـەدا، بەس پارووەنـانێکی هەبـوایە بـۆ ئەوەی گەدەی پـێ تێـر بکـات. بەزمـی ئەو سـپێدەیە مەسـتی دەکـردم، نەمــدەتوانی دڵخۆشــیی دەروونــم بشــارمەوە و لە خۆشــییا هەر لە خۆمەوە لە ژێر لێوەوە ورتەورتم بوو.

ژنێکـی کـامڵی ســەبەتەلەقۆڵ، لە بەردەم دووکـانی گۆشتفرۆشــیدا وەسـتابوو، بیـری لە گۆشـتی نـانی ئێـوارە دەکـردەوە، کە بە لایـدا تێپەڕیم، سەیرێکی کردم، تەنها یەک ددانی لە دەمدا مـابوو، بەجۆرێک تـوڕە و بێتـاقەت بووبـووم، کە بە سـەیرکردنی ئەو ژنە یەکسـەر ڕقـم هەستا، ددانە زەردە درێژەکەی لە پەنجەیەکی بچـووک دەچـوو، کە لە چەناگەی دەرچووبێت، تەنانەت هەستم کرد بە نیگاکەیدا دیـارە بیر لە گۆشتی نانی نیوەڕۆ دەکاتەوە! ئەم دیمەنە یەکسـەر مەیلی خـواردنی کـوێر کـردمەوە و تووشــی دڵەکزیـی کـردم. کە گەیشــتمە بـازاڕی گۆشتفرۆشــان یەکســـەر بەرەو فــوارەکە ڕۆشــتم و قومێـک ئــاوم

خواردەوە و لە سەرەوەم ڕوانی و بینیم بەپێی سەعاتەکەی کڵێسای ڤۆرفێلسرن[1]، سەعات دە بوو.
دیسان خۆم بە گەڕان لە کۆڵان و شەقامەکاندا سەرقاڵ کرد، لەخۆڕا خۆشحاڵ بووم و لەخۆمەوە لە شوێنێک دەوەستام و ڕێم دەگۆڕی، دواجار ڕۆیشتمە کۆلانێکەوە کە هیچ جۆرە ئیشێکم نەبوو لەوێ بیکەم، گوێم بەم دنیایە و شتەکانی ناوی نەدەدا، لەو بەیانییە دڵگیرەدا دەستبەتاڵ و ئاسوودە بەناو مرۆڤە بەختەوەرەکانی تردا، بەملاولادا دەڕۆیشتم. هەوا ڕووناک و کراوە و ڕۆحیشم خاڵی لە غوباری خەم.
دە دەقەیەک دەبوو کە پیرەپیاوێکی شەل، لە بەردەمم دەڕۆیشت، پاکەتێکی بەدەستەوە بوو و لە کاتی ڕێکردندا زۆری لە جەستەی دەکرد و بەوپەڕی هێزەوە تەقەلای بوو خێراتر بڕوات، لەتاو ماندوویی هەناسەی لێ بڕابوو. بیرم لەوە کردەوە یارمەتی بدەم و پاکەتەکەی لە دەست وەربگرم، بەڵام هیچ هەوڵێکم نەدا پێی بگەمەوە، لە سەروو کۆلانی گرنسن گەیشتمە هانس پۆلی، سڵاوێکی کرد و ڕۆیشت؟ بەڵام بۆچی وا خێرا؟ نەمدەویست یەک کرۆن پارەشی لێ قەرز بکەم، تەنانەت دەمویست ئەو بەتانییەی چەند هەفتەیەک لەمەوبەر، بە قەرز لێم وەرگرتبوو، بۆی بگەڕێنمەوە، دەمویست هەر کەمێک هاتمەوە سەرخۆم بەتانییەکەی بدەمەوە، چونکە من هەرگیز پێم خۆش نییە ماڵی کەسی ترم لا بمێنێت.
ڕەنگە لەمڕۆوە دەست بە وتارنووسین بکەم، بۆ نموونە دەربارەی "تاوانەکانی داهاتوو" یان بابەتی "جەبر و بژاردە" یان بابەتی تر، بنووسم. مەبەست ئەوەیە بابەتی وتارەکە هێندە سەرنجڕاکێش بێت، لانیکەم دە کرۆنم دەست بکەوێت... بەپێی ئەم بیرۆکەیە؛ پێویستییەکی زۆرم بە نووسین هەبوو، چونکە تەواو ئامادە بووم و مێشکم پڕ بوو

---

[1] کڵێسای گەورەی نەرویج.

لە بـابەت و بیـرۆکە. سـەرەتا دەڕۆمە پـارکی سلۆتز[1] و سـووچێکی تەریـــک دەدۆزمەوە و دوای ئەوەی وتـــارەکەم تەواو کـــرد، لەوێ پشـــوویەک دەدەم، بەڵام دیســـان ئەو پیرەپیـــاوە ســـەقەتەش بەو ڕێڕۆیشـتنە تـایبەتەی خـۆیەوە لە بەردەمـم دەڕۆیشـت، وەک ئەوەی ڕێگەیەکی درێژ و نەبڕاوەی لە پێش بێت! کەمکەم بوونی ئەم پیاوە شەلە، کە چەند هەنگاوێک لە پێشمەوە دەڕۆیشت تەواو توڕەی کردم، ڕەنـگە یەک ڕێگەمـان هەبێـت و ئەگەر وابێـت ناچـار بەدرێژایـی ئەو ڕێـگەیە، ئەو لەشـولارە نوقسـانەیم لەبەرچـاو دەبێـت! بە تـوڕەییەکی زۆرەوە پێموابوو لە سەر هەموو پێچێکدا، بە ئەنقسـەت دەوەسـتێت و دەیەوێـت بزانێـت مـن بە کـام ئاڕاسـتەدا دەڕۆم، دیسـان بـۆ ئەوەی بەجێی نەهـێڵم بەوپەڕی هێزی خـۆیەوە دەکەوێتە ڕێ و پـاکەتەکەی دەسـتی بە جـووڵەی جەسـتەی بەرزونـزم دەکـات، تـا زیـاتر سـەیری دەکەم تـوڕەتر دەبـم؛ بـوونی بـۆتە هـۆی ئـازاردانم و خەیـاڵی وەک ماخۆلیان کەوتۆتە گیانمەوە! بینینی بەهێواشـی ژیـانم لـێ تـاڵ دەکـات، ڕۆژێکـی وا خـۆش و پـاکوبێگەرد لە پیسـی و ناشـیرینی دەئاڵێنێـت، شۆسـتەکەی بە مـوڵکی خـۆی دەزانـی و لە مێروویەکـی زەبەلاح و لەپەلوپۆکەوتـوو دەچێـت، کە دەیەوێـت بە کەللەڕەقییەکـی تەواو لەم جیهانە خاکییەدا، شوێنێک بۆ خۆی بکاتەوە. لەبەرئەوەی نەمدەویست لەوە زیـــاتر بـــبمە گاڵتەجـــاڕی ئەو، کە هەردووکمـــان گەیشـــتینە بەرزاییەکە، ڕێگەکەم لار کـردەوە و لە پشـت جامخـانەی دووکانێـک وەسـتام تـا ڕێـگە بە ڕکـابەرەکەم بدەم دوور بکەوێـتەوە، بەڵام دوای ئەوەی پـاش چەنـد خولەکێـک دیسـان دەسـتم کـردەوە بە ڕۆیشـتن، بینینم لە شوێنی خۆی وەستاوە و دیسان لە بەردەمم قوت بۆتەوە.

---

[1] Slottz parken: یان پارکی پاشایەتی، بەشێکە لە کۆشکی پاشایی نەرویج و شوێنێکی گشتییە بۆ حەوانەی خەڵکی ئۆسلۆ. (و.ف)

یەکسەر سێ‌چوار هەنگاو ڕۆیشتمە پێشەوە و یەخەم گرت و کێشام بە شانیدا، بەناچاری وەستا و ماوەیەک لە یەکتر ڕامایین. لە کۆتاییدا ملی لار کردەوە و وتی:

- "بێزەحمەت شتێک پارەم دەوێ شیر بکڕم."

دامرکامەوە. دەی شکور ئیسراحەتم کردا گیرفانم گەڕام و وتم:

- "دەتەوێ شیر بکڕی، بەڵێ؟ هەیهوو! ئەم ڕۆژگارە پارە بووە بە کیمیا، بەڕاستی نازانم چەندت پێویستە؟"

پیاوەکە وتی:

- "لە دوێنێتەوە تا ئێستا لە **درامەن**[1] بووم و هیچم نەخواردووە، هێشتا هیچم نەخواردووە و یەک فلسم پێ نییە."
- "کرێکاریت؟"
- "بەڵێ، شاگردی پینەچیم، پۆستاڵ دەدرووم."
- "چی؟"
- "پۆستاڵ دەدرووم، دەزانم پێڵاویش بدرووم."

پاشان وتم:

- "کەواتە ئێستا بابەتەکە جیاوازی تێکەوت، چەند دەقەیەک لێرە بوەستە، بڕۆم بزانم شتێک پارە بهێنم."

بەخێرایی لە شەقامی **هایل** لێژ بوومەوە. لە نهۆمی یەکەمی بینایەک کە لە سەرەتای کۆڵانەکەدا بوو، ناسیاوێکی زیرەکم هەبوو، کە لەبری دانانی شتێک قەرزی دەدا، بەڵام تا ئەو ڕۆژە نەچووبوومە لای، هەر کە گەیشتمە ژێر دەرگای بینا گەورەکە، بەخێرایی هێلەکەکەم لە بەرم داکەند و گرمۆڵەم کرد و خستمە ژێر باڵم، بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم و لە دەرگای دووکانەکەم دا. دوای سڵاو و سەردانەواندن، یەکسەر هێلەکەکەم فڕێ دایە سەر مێزی پێشوازی.

پیاوەکە وتی: کرۆن و نیوێک زیاتر نادەم!

---

[1] Drammen: یەکێک لە بەندەرەکانی نەرویج کە ٤٢ کیلۆمەتر لە باشووری خۆرئاوای ئۆسلۆ دوورە و یەکێکە لە ناوەندە بازرگانییەکانی ئەو وڵاتە. (و.ف)

وتم: عەیبی نییە زۆر سوپاس! ئەم هێلەکە کەمکەم تەسک دەبێتەوە، ئەگەرنا بەمزوانە دەستم لێی نابێتەوە.
پارەکەم بە وەسڵی هێلەکەکەوە وەرگرت و هاتمە دەرەوە، هەر بەڕاستی چەند بیرۆکەیەکی باش هاتبوو بە خەیاڵمدا! جگە لەوەش ئەگەر لەو پارەیەی پیرەمێردەکەم گل بدایەتەوە، شتێکیش بۆ خۆم دەمایەوە و دەکرا ژەمێکی باشی بەیانیانی پێ بخۆم، جگە لەوەش هەوڵ دەدەم بەر لە ئاوابوون وتاری "تاوانەکانی ئایندە" تەواو بکەم.
هێواش‌هێواش ژیان وا خەریکە خۆش دەبێت، بە خێرایی ڕۆیشتمە لای پیاوەکە تا بەڕێی بکەم، هەندێک لە پارەکەم پێدا و وتم:
- "ها فەرمووا زۆرم پێخۆش بوو پێش هەموو کەس هاتیتە لای من!"
پیاوەکە، هەر پارەکەی وەرگرت دەستی کرد بە تەماشا و هەڵسەنگاندنی من، بۆ وا چاوی تێبڕیبووم؟ دەمبینی چاوی لە سەرئەژنۆی پانتۆڵەکەم هەڵناگرێت، چەند چاوبرسی و بێچاوڕووە! پیاوێکی گاڵتەجاڕە! شەرمی نەکرد و وای دەزانی هەر لەبەرئەوەی سەروشێوەم ڕەشوڕووتە، ئیتر هەژار و دەستکورتم، نەیدەزانی من هەر ئەو کەسەم خەریکی نووسینی وتاری دە کرۆنیم؛ نەیدەزانی من بەشی پێویست ئیشم کردووە و لە داهاتوو ناترسم. گریمان لە ڕۆژێکی وا خۆشدا حەزم کردووە دەستم بڵاو بێت، پەیوەندیی بەم کابرایەوە چییە؟
نیگای پیاوەکە بەجۆرێک تووڕەی کردم کە بڕیارم دا، پێش جیابوونەوە تەمێی بکەم، هەربۆیە شانەکانم هەڵتەکاند و وتم:
- مامە گیان! ئەم سەیرکردنە ناشیرینە چییە! تۆ خەریکە، کە کرۆنێکم بۆ هێناویت، هەر بە چاو دەمخۆیت. بۆ وا سەیر سەرئەژنۆی پانتۆڵەکەم دەکەیت؟
پیاوەکە سەری بردە دواوەوە و نای بە دیوارەکەوە و دەمی داچەقاند، ڕەنگە لە ناو کەللەسەری ئەم داماوەدا بیرکردنەوەی سەیر هەبووبێت؛ ڕەنگە پێی وابووبێت بەم قسەیە مەبەستم سوکایەتی و

سەرکۆنەکردنییەتی، یان دەمەوێ بەخشندەییم بدەمەوە بە ڕوویدا، چونکە دەستی درێژ کرد پارەکەم بداتەوە، من پێم بە زەویدا کێشا و سوێندم خوارد پارەکە وەرناگرم و دەبێ هەڵی بگرێت، ئایا من بەبێ هیچ مەبەستێک ئەم هەموو زەحمەتەم دابووە بەرخۆم؟

کە بە وردی بیر دەکەمەوە، لە بیرمە قەرزێکی کۆنم لایە، ڕەنگە بەڕاستی کرۆنێکی ئەم پیاوەم لابووبێت و سەروسەودای لەگەڵ کەسێکی خۆشمامەڵەی وەک مندایە، کە چاکی و باشییەکەم سنووری نییە؛ بە کورتی ئەم پارەیە هیی خۆی بوو!

- کورە برا، شایانی نییە و سوپاسی ناوێت! زۆریش خۆشحاڵم شتێکی وام کرد، بڕۆ خوا ئاگای لێت بێت!

ئەمەم وت و لێی جیابوومەوە، هەرچۆنێک بێت لەم پیاوە نوقسانە کە بووبووە کێشە بۆم، ڕزگارم بوو و ئارامییەک بۆ دڵم گەڕایەوە. لە کۆلانی پایل ـەوە هاتمە خوارەوە و لە بەردەم دووکانێک وەستام، لە پشت جامخانەکەوە جۆرەها خواردن دانرا بوو.

بڕیارم دا بڕۆمە ژوورەوە و شتێک بکڕم و بەدەم ڕێگەوە بیخۆم. نیوکرۆنەکەم خستە سەر مێزی پێشوازی و داوای پارچەیەک پەنیر و سەموونم کرد. ژنە دووکاندارەکە بێ ئەوەی سەیرم بکات، بە گاڵتەوە پرسی:

- "بایی هەموو پارەکە بەس نان و سەموون؟

بەبێباکییەوە وەڵامم دایەوە:

- "بەڵێ، بایی پەنجا ئۆرا[1]، بێزەحمەت!

نان و پەنیرەکەم وەرگرت و زۆر بەڕێزەوە خواحافیزیم لە پیرەژنە خرپنەکە کرد، گرجوگۆڵ بە سەر پەرژینەکەدا خۆم هەڵدایە ناو باخی لای کۆشکی پاشا، ئەوەندە گەڕام تا لە شوێنێکی دوور کورسییەکی چۆڵم دۆزییەوە و یەکسەر لەسەری دانیشتم، بە چڵێسییەوە دەستم

---

[1] یەکەی دراوی نەرویج وەک دانیمارک و سوید، کرۆنە. ئۆرا بەشەکانی کرۆنە و یەک کرۆنی نەرویجی دەکاتە سەد ئۆرا. (و.ف)

کــرد بە هەڵلوشــینی خــواردنەکە، بەرەبەرە هــاتمەوە ســەرخۆم. مــاوەیەکی زۆر بــوو خــواردنێکی ئەوەنــدە تێروپــڕم نەخواردبــوو، کەمکەم تێر و ئارام دەبوومەوە؛ وەک ئارامبوونەوەی دوای گریانێکی زۆر و خــاڵیکردنەوەی دڵــی پــڕ. هەســتم بە هێزێکــی زۆر دەکــرد لە خۆمدا، نووسینی وتارێک لە سەر بابەتێکی بەردەست و ئاسان وەک "تاوانەکانی ئایندە" هەرگیز ڕازیی نەدەکردم، چونکە هەموو کەس پێی دەنووسرا و تەنها بە گەڕانەوە بۆ مێژوو و کەڵەکردنی چەند بابەتێک، وتارەکە دەنووسرێت. ئێستا خۆم ئامادە دەبینی کاری گەورەتر بکەم، بڕیــارم دا وتارێک لە ژێر ناونیشــانی "مەعــریفەی فەلســەفی" لە ســێ باسدا بنووسم و هەڵبەت لە هەر شــوێنێک دەرفەت ڕێبکەوتایە گاڵتەم بە سەفسەتەکانی **کانت**[1] دەکرد... بەهەرحاڵ، هەر کە ویستم بنووســم، ســەیرم کــرد قەڵەمەکەم دیــار نییە، قەڵەمەکە لە گیرفــانی هــێلەکەکە و هێلەکەکەش لە دووکانی ڕەهنەکەیە.

خوایە گیان، بۆچی هەمیشە هەموو شتێک کۆ دەبێتەوە بۆ ئازاردانی مــن! بە تــوڕەییەوە جنێــوم بە ئەرزوئاســمان دا، لەســەر کورســییەکە هەســتام و لەخــۆڕا دەســتم بە پیاســە کــرد بە نــاو ڕێڕەوەکــانی پارکەکەدا. بێدەنگییەکی تەواو هەمــوو شــوێنێکی داپۆشیبوو، تەنها لە دوورەوە، نزیــک کۆشــکی پاشــا چەنــد ژنێکــی پەرســتیار گالیســکەی منداڵەکانیان پاڵ پێوەدەنا، جگە لەمە هیچ شتێک لە هیچ شــوێنێک دیــار نەبوو.

زۆر توڕە بووم و بە بێتاقەتییەوە بە بەردەم کورسییەکاندا دەهــاتم و دەچووم، بەڵام لە هەمــوو لایەکەوە دەبــاری! لەوە خراپتریش دەبێت؟ لەبەر لەتەقەڵەمێــک کە دە ئــۆرا ناهێنێــت، دەبــوو وتارێــک بە ســێ باسەوە لەناو بچێت. باش بوو ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ شــەقامی **پایل** و قەڵەمەکەم وەربگرمەوە! ئەوەندە کات مــات بوو، پێش قەرەبــاڵغبوونی

---

[1] ئیمانوێل کانت، (١٧٢٤- ١٨٠٤) فەیلەسووفی ناوداری ئەڵمانی.

شـــەقامەکە بەشـــێک لە وتـــارەکەم بنووســـم، جـــگە لەوەش کەس چووزانێـت، ڕەنـگە نووسـینی وتـاری "مەعـریفەی فەلسـەفی" ببێـتە سەرچاوەی بەرهەمـی مەزن، ڕەنگە خەڵکانێک بە خوێندنەوەی بگەنە ئەوپەڕی کامەرانی و دڵخۆشی؛ لە دڵمدا دەموت ڕەنگە ئەم کتێبە بۆ زۆرێک لە گەنجان سوودی هەبێت. کە باش تاوتوێم کرد، پێم باش بوو نابێ هێرش بکەمە سەر "کانت"، باشترە خۆم لەمە دوور بگرم، ئەوەندە بەس بوو کە گەیشتمە مەسەلەی "کات و شوێن" بابەتەکە بئـــاڵۆزکێنم و بە لێـــزانییەوە سەفســـەتە بـــکەم، بەڵام بە ئاســـانی نەمدەتوانی واز لە "ڕێنان"[1] (ئەم قەشە پیرە) بهێنم. بەهەرحاڵ ناچار بووم وتارێک بە قەد چەند ستوونێک بنووسم، چونکە بە هەر نرخێک بووە، دەبوو لەو دۆخە ترسناکەم ڕزگارم بێت، پارەم نەبوو کرێی ماڵەکەم بدەم، هەموو بەیانییەک کە لە سەر پلیکانەکەوە دەموچاوی مۆن و سەیرکردنی ناخۆشی خانمی خاوەنماڵم دەبینی، هەموو ئەو ڕۆژەم لێ دەبوو بە قوزەلقورت، تەنانەت لە خۆشترین ساتەکانیشدا تاکە بیرکردنەوەی تێکەڵوپێکەڵ کە دەهاتە بەرچاوم و ژیانی لێ تاڵ دەکردم، هەر ئەمە بوو.

بەهەرحـاڵ، بەپەلە لە پـارکەکە هـاتمە دەرەوە و ڕووم لە دووکـانی ســـووخۆرەکە کـــرد، تـــا قەڵەمەکەم وەربگـــرمەوە، کە لە **مەیـــدانی کۆشک**ـەوە هـاتمە خوارەوە، بە لای دوو ژندا تێپەڕیم و دەستم بەر قـۆڵی کراســـی یەکێکیـــان کەوت، چـــاوم هەڵبـــڕی و ســـەیرم کـــرد، دەموچاوێکی پڕ و کەمێک ڕەنگپەڕیوی هەبوو، لەناکاو بزەیەکی کرد و ئەم بـــزەیە جـــوانییەکەی دوو هێنـــدە کـــرد، نـــازانم هۆکـــاری زەردەخەنەکەی چی بوو، ڕەنگە قسەی ڕێبوارێکی بیستبێت، ڕەنگە بیرکردنەوەیەکی نەوتراو بە خەیاڵیدا تێپەڕیبێت، ڕەنگە لەبەرئەوەی کە دەستم بەر قۆڵی کەوت پێکەنی بێت! مەمکە قوتەکانی لەرەیەکی

---

[1] ئێرنێست ڕێنان، بیرمەند و تیولوجیستی فەڕەنسی (١٨٢٣- ١٨٩٢).

کرد و بە توندی دەسکی چەترەکەی گرت؛ دەمویست بزانم بیر لە چی دەکاتەوە؟ هەرچۆنێک بێت کەمێک وەستام و ڕێگەم دا پێشم بکەوێت، ئەم بەرکەوتنە بەڕادەیەک منی حەپەساندبوو، کە هێزی ئەوەم لە خۆمدا شک نەدەبرد زۆر لێی دوور بکەومەوە.
بابەتی قەڵەمەکە، بێتاقەتی کردبووم و پەست بووم، بەهۆی ئەو هەموو خواردنەی ترنجاندبوومە گەدەی بەتاڵم، بێزار بووم. لەپڕ بیرکردنەوەیەکی ترسناکم بە خەیاڵدا هات و بیرم لە شتی سەیر کردەوە، حەزم کرد ئەم ژنە بترسێنم؛ بەو مانایەی دوای بکەوم و ئازاری بدەم، دیسان بە لایدا تێپەڕیم و پێشی کەوتم، بۆ ئەوەی سەیری بکەم و جوان لێی ڕابمێنم، بەپەلە گەڕامەوە، ئێستا وەستاوم و زەقزەق سەیری دەکەم... هەر لەخۆوە وشەی "ئیلایالی"[١] هاتە سەر زمانم، ئەم ناوە ژنانەیەم کە نەرمییەکی شاعیرانە و سەرنجێکی توند و دڵفریوانەی تێدایە، خۆم دام هێنابوو، کە گەیشتمە نزیکی، لەسەر نووکەپێ وەستاوم و بە پەلەپڕوزێوە وتم:

- "خانم کتێبەکەتان ون کردووە!"

لە کاتی وتنی ئەم وشانەش دڵم لە سینگمدا دەیترپاند. ژنەکە لە هاوڕێکەی پرسی:

- "کتێبەکەم؟" و ڕۆیشت.

---

[١] لە دەقە نەرویجییەکەدا وشەی Ylajali نووسراوە، ڕەگوڕیشەی ئەم وشەیە دیار نییە، وادیارە وشەیەکی داهێنراوە لە لایەن نووسەرەوە. کاراکتەری سەرەکی لە چەند شوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا مەیلی دروستکردنی وشەی هەیە و دەکرێ ئەمەش وشەیەکی داهێنراو بێت بۆ بانگکردنی خۆشەویستەکەی. لە سەرچاوە جیاوازەکاندا وەرگێڕەکان ئەو ئازادییەیان داوە بە خۆیان کە وشەکە وەک وشەیەک بۆ بانگکردنی مەعشوقەیەک دەستکاری بکەن، ئەگەرچی ڕەنگە ئەم وشەیە نەتوانێت شیعرییەتی خۆی لە زمانی کوردیدا بگەیەنێت، بەڵام بەوپێیەی دروستکردنی وشەی نوێ لە لایەن کاراکتەرەکەوە بەشێکە لە ناوەڕۆک و مانای دەقەکە، ئەم وشەیە وەکو خۆی دادەنێینەوە وەکچۆن وەرگێڕی عەرەبیش هەروای کردووە. (و.ک).

کەمکەم هەستی جارزکردن لە مندا تاوی سەند، دوای ژنەکە کەوتم. هەرچەند دەمزانی کارێکی خراپ دەکەم، بەڵام خۆم پێ ڕانەگیرا. ئەم تینوتاوەم بەرادەیەک بوو، کە جڵەوم لەدەست دەرچووبوو، ملکەچ و رازیی کردبووم و هاوکات شیتانەترین خەیاڵ و کرداری تیا دەچاندم، هەرچەند خۆم سەرکۆنە دەکرد کە ئەم کارە گەمژانەیە، هیچ کاریگەریی نەبوو. لە پشتی ئەم ژنەوە رەفتاری سەیرم دەنواند و چەند جارێک بە لایدا تێپەڕیم و بە ئەنقەسەت کۆکەی توند و تورەم دەکرد و بە هێمنی و لەسەرخۆ چەند هەنگاوێک پێشی دەکەوتم، لەم کاتەدا هەست دەکەم چاوی بڕیوەتە پشتەملم و لە شەرما خەریکە دەبمە تنۆکێک ئاو، لەخۆمەوە پشتم دەچەمێنمەوە. تازە خەریک بوو هەستێکی تازەم تیا دەوروژا، هەستم دەکرد لە ناوچەیەکی دوور، لە جیهانێکی دابڕاو لەم دنیایە، دەڕۆم، هەستم دەکرد ئەوە من نیم کە لە پشتی چەماوەوە لە سەر شۆستەکەدا هەنگاو دەنێم. دوای چەند خولەکێک ژنەکە گەیشتە کتێبفرۆشی پاشا[1]، نەیدەزانی من پێش ئەو گەیشتبوومە ئەو شوێنە، کە بە لامدا تێپەڕی ڕۆیشتمە پێشتر و وتم:

- "خانم، کتێبەکەتان ون کردووە!"

بە دەنگێکی پەستەوە وتی: "کام کتێب؟ لە هاوڕێکەی پرسی "تۆ دەزانی باسی کام کتێب دەکات؟"

دواتریش لە شوێنەکەی وەستا. لەو شڵەژانەی چێژی زۆر وەردەگرم، ئەو گومانەی لە چاویدا دەیبینم چێژی زۆرم دەداتێ. بیرکردنەوەی دۆشداماوە و ئەقڵی بەم پرسیارە ناشکێت، کام کتێب؟ کتێب و کاغەزێک بوونی نییە، ئەو هەر کتێبی پێ نەبووە، بەڵام گیرفانەکانی دەگەڕێت، چەند جارێک سەیری دەستەکانی دەکات، ئاوڕ دەداتەوە و سەیری کۆڵانەکە دەکات، بە هەموو تواناوە زۆر لە مێشکی دەکات تا بزانێت مەسەلەکە چییە و مەبەستم کام کتێبەیە، رەنگی دەگۆڕێت و

---

[1] Pascha BookStore

گوێم لێیە هەناسەسوار بووە، تەنانەت قۆپچەی کراسەکەشی وەک دوو چاوی زەقی تەنیشت یەک، لێم دەڕوانن.
لەم کاتەدا هاورێکەی قۆڵی ڕادەکێشێت و دەڵێت:
وازی لێبێنە، سەرخۆشە، سەیرکە چەندی خواردۆتەوە.
ئەگەرچی لەوکاتەدا ئاگام لە خۆم نەمابوو و گیرۆدەی هێزێکی سەیر و تەمومژاوی بووم، بەڵام بچووکترین شتم لە دەوروبەرمدا دەبینی و ئاگاداری بووم، بۆ نموونە لەم چەلەحانێیەدا سەگێکی گەورەی قاوەیی بە کۆڵانەکەدا تێپەڕی و لای مەیدانی **لۆند** بەرەو **تیڤوولی** کەوتەڕێ، ملبەندێکی تەنگی زیویی لە ملدا بوو. هەروەها لە سەرەوەی کۆڵانەکە، پەنجەرەی یەکێک لە ماڵەکان کرایەوە و کارەکەری ماڵەکە بە قۆڵی هەڵکراوەوە سەری هێنایە دەرەوە، دەستی کرد بە سڕینی شووشەی پەنجەرەکە. ئاگاتان لێیە چۆن بە وردی سەرنجم داوەتە هەموو شتێک، زۆر هۆشیار و وریا بووم، وەک ئەوەی لەناکاو ڕۆشناییەکی زۆر لە چواردەورم لە شتەکانەوە دەردەچوون و دەرژایە دەروونمەوە، هەموو شتێکم بە ئاشکرا و بەڕوونی دەبینی. ئەو ژنانەش لە پێشەوە دەڕۆیشتن هەردووکیان پەرێکی شین بە کڵاوەکەیانەوە بوو و قردێلەی ئاوریشمی سکۆتلەندیش لە ملیاندا.
نەوەک ئەم دوانە خۆشک بن؟
بەهەرحاڵ، هەردووکیان ڕێگەیان لار کردەوە و لە بەردەم دووکانی **سیسلەر** فرۆشیاری دەفتەری نۆتەی موزیک وەستان و دەستیان کرد بە چپەچپ، دواتر لە هەمان ڕێگەی سەرەتاوە گەڕانەوە، دیسان بە بەردەم مندا تێپەڕین و ڕۆیشتنە نێو شەقامی زانکۆ و ڕوویان لە مەیدانی **سانت ئۆلاف**[1] کرد. لە هەموو ئەم ماوەیەدا، تا ئەو شوێنەی

---

[1] Saint olaf مەیدانێکی گەورەیە کە لە ناوەڕاستی ئۆسلۆدایە و پێنج شەقامی لێ دەبێتەوە، یەکێکیان دەگاتەوە بە کۆشکی پاشا و یەکێکی تریان دەچێتەوە لای زانکۆ. (و.ف)

ئـازایەتیم ڕێـی بـدایە، لێیـان نەبـوومەوە و هەنگاوێـک لێیـان دوور نەدەکەوتمەوە، لەناکاو هەردووکیان گەڕانەوە و نیگایەکی نیوەترسـاو و نیوەفزوولیـان گـرتە مـن، کەمتـرین مەبەسـتی سـوکایەتی لە سـەیرکردنیاندا نەبـوو، تەنـانەت ناوچاویشـیان گـرژ نەکردبـوو، خـۆڕاگرییەک کە لەبەرامـبەر ڕەفتـاری نەشـیاوی منـدا هەیـانبوو، بەڕادەیەک شـەرمەزاری کردم کە سـەرم شۆڕ کرد و لە ئەزێتدانیان پەشیمان بوومەوە، تەنها دەمویست بۆ دڵنیابوونەوەش بێت چاویان لەسەر هەڵنەگرم، ئەوەندە بە سەیرکردن دوایان بکەوم تا لە بەرچاو ون دەبن.

گەیشتنە ماڵی ژمارە ٢ کە بینایەکی چوار نهۆمی گەورە بوو، جارێکی تر ئاوڕیان دایەوە و ڕۆیشتنە ژوورەوە، منیش نزیک فوارەکە پاڵم بە داری چراگازییەکەوە دا و گوێم هەڵخست، دەنگی پێیان لە پلیکانەکانی نهـۆمی یەکەمـدا ون بـوو، ئێسـتا مـن بە لای داری چراگـازەکەدا تێپەڕیوم و خەریکە تەماشـای مـاڵەکە دەکەم؛ لەم کـاتەدا ڕووداوێکی سـەیر دەقەومێـت، لە نهـۆمی سـەرەوەی بینـاکەدا، چەنـد پەردەیەک لادەدەرێـن و مـاوەیەک دواتـر پەنـجەرەکە دەکـرێتەوە و سـەرێک دەردەکەوێت، دوو چاو بە نیگایەکی تیژ و کاریگەر لە من دەڕوانن.

بە هێمنـی وشـەی **ئیلایـالی**ـم وتەوە و هەسـتم کـرد لە شـەرما سوورهەڵگەڕاوم، بۆچی هاتوهـاواری نەدەنایەوە و داوای یارمەتی لە خەڵک نەدەکرد؟ بۆچی لەو سەرەوە یەکێک لە ئینجانەکانی بە سەرمدا نەدەکێشـا؟ بـۆچی کەسـی نەدەنـاردە خـوارەوە و منـی لە مـاڵەکە دەرنەدەکرد؟ بەڵام نەخێر، هەردووکمـان بێدەنگ و مـات چاومـان لە یەکتـر گیـر بووبـوو، چەنـد خەیـاڵی سـەیر لە نێـوان کـۆڵان و پەنجەرەکەدا ڕەت دەبوون بێ ئەوەی وشەیەک بوترێت.

کە سـەر وەردەگێڕێت، گیـانم دەکەوێتە لەرزین و زەبرێکـی نەرم بەر ڕۆحم دەکەوێت، شانێک لە پشتەوە دیارە و پشتی کەسێک دەبینم کە لە کۆتایی ژوورەکەدا ون دەبێت، هەر ئەمە و هیچی تر! وەک ئەوەی

مەبەستێکی لەم ڕەفتارەی هەبێت، ئەم هاتوچۆیە و ئەم شێوازی شانڕاوەشاندنە و دوورکەوتنەوە لە پەنجەرە، ئاماژەیەک بوو بۆ من، ئەم دەربڕینە ناسک و سەرلەبەر تانەیە، کاری لە ڕەگوڕیشەی هەناوم کرد و هەستم بە خۆشی و کامەرانییەکی بێسنوور کرد، پاشان بە هەمان ڕێگەدا گەڕامەوە و بە کۆلانەکەدا خل بوومەوە، نەمدەوێرا ئاوڕ بدەمەوە و نەمدەزانی ئایا دیسان هاتۆتە بەر پەنجەرەکە یان نا؟ تا زیاتر بیرم لەمە دەکردەوە زیاتریش دەشڵەژام، بە هیچ شێوەیەک نەمدەتوانی بەرگەی ئەوە بگرم کەسێک لە پشتەوە چاوی لەسەرمە، دوور نەبوو دیسان هاتبێتە پشت پەنجەرەکە و ئاگای لە جووڵەکانمە، هەربۆیە خۆم قنجوقیت دەکرد و بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن.

بەهێواشی قاچم سڕ دەبوو و کە زۆریشم لە خۆم دەکرد شێوازی ڕۆیشتنم ڕێکوپێک بێت، گوماناوی و ناڕێک هەنگاوم دەنا.

بۆ ئەوەی خۆم وا دەربخەم بێباک و هێمنم، دەستم لەخۆوە بەرز و نزم دەکردەوە، تفم هەڵدەدایە سەر زەوییەکە و لوتم بەرەو ئاسمان هەڵدەبڕی، بەڵام ئەم یارییانە سوودی نەبوو، خۆبەخۆ هەستم دەکرد دوو چاوی تیژ دوام کەوتووە و هەر ئەمەش ئازاری دەدام، لەشم دەلەرزی و تەزوویەکی سارد بە گیانمدا دەهات، دواجار خۆم بە یەکەم کۆلاندا کرد و بەرەو کۆلانی پایل ڕۆیشتم، بەشکو قەڵەکەم وەربگرمەوە.

قەڵەمەکم بێ کێشە وەرگرتەوە، پیاوەکە خۆی هێلەکەکەی هێنا و یەکبەیەک گیرفانەکانی گەڕا، چەند وەسڵێکیشی تیابوو، هەڵم گرت و سوپاسی میهرەبانی و چاکیی دووکاندارەکەم کرد.

شەیدای ڕەفتار و ئاکاری ئەم پیاوە بووبووم، لەپڕ بیرم هاتەوە چەند باشتر بوو ئەگەر وەک کەسێکی بەڕێز و ڕێکوپێک خۆم پێ بناساندایە، هێشتا چەند هەنگاوێک بەرەو دەرگاکە دوور نەکەوتبوومەوە، وەک ئەوەی شتێکم لە بیر کردبێت گەڕامەوە،

پێویست بوو چەند وشەیەک قسەی لەگەڵ بکەم و ڕوونی بکەمەوە، هەربۆیە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی لە ژێر لێوەوە دەستم کرد بە ورتەورت، دواتر قەڵەمەکەی دەستم لە هەوادا بادا و وتم:

- "پێتان وانەبێت لەبەر قەڵەمێکی ئاسایی ئەو ڕێگە دوورودرێژە گەڕاومەتەوە، ئەم قەڵەمەی دەیبینن چیرۆکێکی سەیری هەیە و ئێوە نازانن کە چی وای کرد بگەڕێمەوە، ناوبانگ و گرنگییەک کە بەندە ئێستا هەیەتی، هیی ئەم قەڵەمە ناچیز و بێنرخەیە، بە کورتی پێگەیەک کە لەم ژیانەدا هەمە لە بەرەکەتی ئەم قەڵەمەوەیە، لەوە زیاتر قسەم نەکرد. پیاوەکە هاتە نزیک مێزی پێشوازی و بە فزوولییەوە وتی:

- "سەیرە!"

دواتر بێباکانە درێژەم بە قسەکەم دا:

- "بەڵێ، هەر سێ بەرگی کتێبی "مەعریفەی فەلسەفی"یم بەم قەڵەمە نووسیوە."

چۆن دەکرا ناوی ئەم کتێبەی نەبیستبێت؟ کابرا هەر بەڕاستی وای دەزانی ناوی ئەو کتێبەی بەرگوێ کەوتووە و منیش هەلەکەم قۆستەوە و وتم:

- "بەڵێ، ئەم کتێبە لە لایەن بەندەوە نووسراوە! هەربۆیە هۆگریی من بۆ ئەم قەڵەمە نیشانەی سەرسوڕمان نییە، ئەم قەڵەمە ئێستا ئیتر وەک بوونەوەرێکی زیندوو وایە لام و دنیایەک دەهێنێت، هاوکات هەرگیز میهرەبانی و بەخشندەییەکەی لە بیر ناکەم و لە دڵەوە سوپاسی دەکەم... هەڵبەت یادەوەرییەک بەم گرنگییە لە بیر ناکرێت، پیاویش قسە دەکات؛ ڕەفتاری من ئاوایە، ئەوە هیچ، ئەم قەڵەمەش شایانی ڕێز و بەرزڕاگرتنە... بەهەرحاڵ خواحافیز!"

کە لە دەرگاکە ڕۆیشتمە دەرەوە، لە کەسێکی کاریگەر و ناودار دەچووم کە بەتەمایە پیشەیەکی گرنگ بۆ کەسێک بدۆزێتەوە، بەدەم دوورکەوتنەوەوە، ئەم سووخۆرە بەڕێزە دووجار لەبەردەممدا

نووشــتایەوە. مــن بەهــۆی نۆکەردۆســتییەوە گەڕامەوە و دیســـان خواحافیزیم لێ کرد.
لە ســەر پلیکانەکـان ژنێکم بینی کە جانتـایەکی بچووکی بە دەســتەوە بـوو، ئەویـش کە سەروفەسـاڵی بە ویقـار و لەخۆبـایی منـی بەرچـاو کەوت، بە تـرس و لەخۆبردنەوە خۆی لادا و ڕێگەکەی بۆ کـردمەوە، بـۆ ئەوەی خـۆم بچـووک نەکەمەوە، لەخـۆمەوە دەســتم کـرد بە گیرفانمـدا شـتێکی بـدەمێ، بەڵام زۆر شـڵەژام چونکە یەک فلسـم پێ نەبـوو و سەرشـۆڕ بە بەردەمیـدا تێپەڕیم، مـاوەیەک دواتـر جیـرەی دەرگـای دووکـانی ســووخۆرەکە بەرز بـووەوە، تێگەیشــتم ژنەکەش بەرەو ئەوێ دەڕۆیشـــــت، لە بەردەم دەرگـــــای چـــــوونەژوورەوەی دووکانە سـیاجێکی ئاسـن هەبوو، لەپڕ گوێم لە بەرکەوتنی دەسـتێک بـوو لەگەڵیـدا، خـۆر لە باشـووری ئاسـمانەوە دیـار بـوو و نـزیکەی نیوەڕۆ بوو.
کـاتی دەسـتبەتاڵی و تەماشـا دەهـات و جرتوفرتێک لە شـاردا دەسـتی پێ دەکـرد، لێشـاوی خەڵک لە شـەقامی **کـارل یۆهـان**[1] شـەپۆلی دەدا. زەردەخەنە لە سەر هەموو لێوەکان بوو، سـڵاوکۆڕینەوەش لە هەمـوو لایەکەوە، لەوکاتەدا چەند کەسیکم بینی کە نزیک **زانکۆ** لە سـووچێکدا وەستان و لە ڕێبوارەکان ڕاماون، ئانیشـکم نووسـاند بە کەمەرمەوە و خۆم بچووک کـردەوە و بە جۆرێک بە نـاو خەڵکدا تێپەڕیم، نەمبینن، بە دەم بیرکردنەوە لە شتی جۆراوجۆرەوە بە لای **مەیدانی کۆشکەوە** ڕووەو ســــەرەوە ڕۆیشــــتم، خەڵکــــانێکم دەبینـــی بە قـــژی کـــاڵی خۆشڕەنگەوە سەریان ڕادەوەشاند و کامەران و کەیفساز دیار بـوون. وەک ئەوەی پانتــایی ئەم ژیــانە کـۆڕێکی گەورەی ســەمایە، چـونکە

---

[1] Karl johan: شـەقامێکی سـەرەکی لە ئۆسـلۆ کە لە وێسـتگەی ئاسنەڕێ لە نزیکی بەندەرەوە دەست پێدەکات و تا کۆشکی پاشا درێژ دەبێتەوە، ئەم شـەقامە گەورە و جـوانە، شـوێنی پیاسـەی خەڵکـی شـار و ناوەنـدێکی گرنگـی حکـومی و ئوتێـل و ڕیستۆرانتە گەورەکانی ئۆسلۆیە. (و.ف)

سرت و نەرم لە هەموو لایەکەوە پیاسەیان دەکرد و بە هێمنی بە لای یەکتـردا تێـدەپەڕین، لەم چـاوانەدا ئاسـەواری خەم و خەفەت دیـار نەبوو، لە سـەر شـانیان باری دەرد و ئـازار نەبوو، ڕەنگە لە هەمـوو دەروونی ئەم خەڵکە بەختەوەرەدا، کەمترین ئازاری دەروونـی نەبێت. منـیش لە نـاو ئەم خەڵـکە دڵخۆشـەدا دەڕۆیشـتم، ئەگەرچـی هێشـتا تازەپێگەیشتوو و گەنج بووم، بەڵام دڵخۆشیم بە خۆمەوە نەدیبوو.

لە بەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە بۆچی دەبێ ئاوهـا ئاشکرا زوڵمـم لـێ بکرێـت، بـۆچی دەبـێ لە مـاوەی چەنـد مانگێکـدا ئەو هەمـوو چەرمەسـەری و ئـازارە بچێژم؟ لە هەمـوو لایەکەوە بەڵایەکـی تـازە دەهات، ڕێگەم لە هەموو لایەکەوە لـێ گیرابوو؛ چیتر ئەو چالاکییەی جاران و دڵخۆشـییەی پێشـووم نەمـابوو، نەدەکرا پـێ بنێمە شـوێنێک یان لە سوچێکدا کزەڵە بکەم، بیرکردنەوەی ترسناک و خەیـاڵی پووچ و ناڕەوا هەڵئەکوتنە سەرم، کەمکەم خەمی ڕەنگاوڕەنگ لە دەروونـم کەڵەکە دەبـوون، دەسـت لەنـاو دەسـت هێـزی ژیانمیـان وەک پەڕی کایەک دەهێنا و دەبرد، بینینی گوڵێکی زەرد لە سەر سینەی کەسێک، یـان سـەگێک کە بە لامـدا تێـدەپەڕی، بیرکردنەوەمـی دەشـڵەژاند و مـاوەیەکی زۆر بیرکردنەوەمـی سـەرقاڵ دەکـرد، نەمـدەزانی دەردم چییە.

ئایا پەنـجەی خواوەند نیشـانەی لـێ گرتووم؟ خـوا دوژمنـایەتی چییە لەگەڵ مـن؟ ئێسـتا ئەگەر ویسـتی ئەو وایە ئـازاری بەنـدەیەکی بـدات، بۆچی یەکێک لە بەندەکانی لە ئەمریکای باشوور هەڵنابژێرێت؟ عەقڵـم بە وەڵامـی ئەم پرسـیارە ناشـکێت کە خـوای بالادەسـت، بـۆ منـی قوڕبەسـەر و بێـدەرەتانی بـۆ تـاقیکردنەوەی زۆر و تێرکردنـی ئـارەزووی خـۆی هەڵبـژاردووە؟ ئەم کـارەی خواوەنـد سـەیر بـوو، مـرۆڤ بـڕاوە وەهـا یەخەی منـی گرتـووە؟ کەسـێکی وەک پاشـای کتێبفرۆش و هنشنی مەلەوانـی کەشتی، لە بەردەستی بوون، لەوان گەڕاوە و هـاتۆتە بـۆ گیـانی مـن! بەدەم پیاسـەوە لەم بـابەتە ورد

دەبوومەوە و لە چارەسەری ئەم مەسەلە ئاڵۆزە ڕادەمام، ڕەخنەی توند و قورسم لە خۆپەرستیی خوا دەگرت، بەڵێ، من بووبووم بە قوربانیی هەموو بەندەکانی و سزای ئەوانی لە من وەردەگرت.

بەهەرحاڵ، دواجار کورسییەکم دۆزییەوە و لە سەری دانیشتم، بەڵام دیسان ئەو بابەتە بیرکردنەوەی سەرقاڵ کردمەوە و نەیدەهێشت بیر لە شتێکی تر بکەمەوە، هەموو کێشە و بەڵاکانی من لە یەکەم ڕۆژی بەهارەوە دەستی پێ کرد، هەر لەو ڕۆژە، لاوازی کەوتبووە گیانم و بەکاوەخۆ زیاتریش دەبوو، لەوکاتەدا ئەوەندە ماندوو و لەرزۆک بووم و پێیەکانم بەڕادەیەک سست بووبوون، کە هێزی ڕۆیشتنم بەملاولامدا نەبوو، وەک ئەوەی پۆلێک گیانەوەری نادیار دزەیان کردۆتە قووڵایی بوون و دەروونم، هێواش هەموو هێزی لەشم دەمژن. ئایا ویستی خوا ئەوەیە تەواو لە پەلوپۆم بخات و لەناوم ببات؟

لەناکاو هەستام و لەخۆڕا بڕیارم دا، لەبەردەم ئەو کورسییەی لەسەری دانیشتبووم پیاسە بکەم، لەم کاتەدا قورسترین ئازارم دەچەشت، تەنانەت دەستەکانم بەڕادەیەک ئازاریان دەهات کە نەمدەتوانی ئاسایی ڕایان بگرم. دواهەمین خواردنم بەڕادەیەک قورس بوو کە گێژی دەکردم و دڵەکزێمی زیاتر کردبوو، هەستەکانم شڵەژاو و پەرێشان و گەدەم پڕ و قورس بوو، چاوم بڕیبووە زەوی و بێ هیچ مەبەستێک ئەمسەراوسەرم دەکرد، ڕێبوارەکان وەک گورزەباریکی ڕووناکی لە بەرچاومدا ڕەت دەبوون و دەردەکەوتن و دیار نەدەمان.

دواجار چەند پیاوێکی موحتەرەم چوونە سەر ئەو کورسییەی لە سەری دانیشتبووم، هەر لەگەڵ دانیشتن چەند جگەرەیەکی چروتیان داگیرساند، بە دەنگی بەرز دەستیان کرد بە زۆربڵێیی و چەلەحانێ، ئەوەندە تووڕە بووم زۆری نەمابوو بیکەمە شەڕ، بەڵام خێرا ڕێم لەخۆم گرت و ڕێگەکەم لار کردەوە بۆ کۆتایی پارکەکە، لەوێ

کورسییەکم دۆزییەوە و یەکسەر لە سەری دانیشتم، دیسان بیرۆکەی خوا هاتەوە بۆ گیانم: ئەمەیان ئیتر پاساوی نەبوو، کە بۆچی هەر کات کارێکم بدۆزیبایەتەوە لەپڕ دەهات و هەموو زەحمەتەکانمی دەکردە بلقی سەرئاو، چیم ڕێسا بوو دەیکردەوە بە خوری، خۆ من بەندەیەکی ڕازی و ملکەچ بووم، جگە لە پارووە نانێکی مەمرەومەژی لە ڕۆژێکدا داوای هیچم نەکردووە.

بە دروستی وردبووبوومەوە، هەر کات ماوەیەکی زۆر برسێتیم بچەشتایە، مێشکم بەهێواشی لە ئیش دەکەوت و لەناو کاسەی سەرمدا دەپووکایەوە، کاسەی سەرم ئەوەندە بۆش و سووکەڵە دەبوو، کە قورساییەکەیم لە سەر لەشم هەست پێ نەدەکرد، وەک ئەوەی جەستەم سەری پێوە نەمابێت، لەم کاتانەدا ئەگەر چاوم لە کەسێک ببڕیایە چاوم زیاد لە پێویست دەرتۆقیو و زەق دەبوون و هەر بە کراوەیی و نیگەران دەمانەوە.

لە سەر کورسییەکە دانیشتم و نغرۆی ئەم بیرکردنەوانە بووم، زیاتر و زیاتر تووڕەیی و بێتاقەتیم لە خوا تاوی دەسەند، کە بۆچی ئەم هەمووە دژ بە بەندە بێتواناکەی ناهەقی دەکات، ئەگەر مەبەستی خواوەند بەمجۆرە ڕەفتارانەی ئەوە بێت کە بە کەڵەکەکردنی بەڵا لە سەر ڕێم، بە ئازاردانم لە خۆی نزیکم دەخاتەوە، بێگومان لە هەڵەدایە، چاوم ڕوو لە سەرەوە کردبوو، هاوکات لەگەڵ ئەوەی قیرسیچمە و بێتاقەت، فرمێسک لە چاوم دەهاتە خوار، دواهەمین حساباتی خۆم لەگەڵ خوای ئەرزوئاسمان یەکلا کردەوە، لەم کاتەدا هەندێ قەناعەتی ئاینییم هاتەوە یاد و ئاوازی کتێبی پیرۆز لە گوێمدا زرنگایەوە، لەکاتێکدا بە گاڵتەوە سەرم ڕادەوەشاند، لە بەرخۆمەوە کەوتمە ورتەورت، ئاخر بۆچی دەبێ بۆ پارووەنانێک و قومێک ئاو ئەوەندە لە هەوڵدا بم؟ پاروویەکی قوڕ ئەم هەموو نیگەرانی و سەرلێشێواییە دەهێنێت؟ پاروویەک کە لەم گەدە بۆگەنەدا دەڕزێت و لەشێکیش ڕۆژێک دەبێتە نێچیری مارومێروو؟ مەگەر خوای ئاسمان کە ڕۆژێک

مەلەکانی ئاسمان ڕەوانە دەکات[1]، ئاگای لەم بەندە بچکۆلەیەی خۆی نەماوە؟ نا، خوای گەورە دەیەوێت بەم ڕێگایە بەندە بێتواناکەی تاقی بکاتەوە و لە خێر و بەرەکەتی خۆی بەشی بدات.
بەڵام بەڕێکەوت پەنجەی خواوەند دەستی بۆ تاڵەکانی ئەعسابم بردووە و تانوپۆی شێواندووە و ئەوکاتەش دەستی لابردووە، هەندێ تاڵ قرتاون و ئێستاش جێپەنجەی جێماوە و برینێکی کردۆتە مێشکم، پاش ئەوە خواوەند بێ ئەوەی ستەمێکم لێ بکات جێی هێشتووم، بەڵێ، لەوە بەدوا تەنیا و بێخەمخۆر بەو برینە خوێناوییەوە، لەم دنیایەدا ئاوارە و سەرگەردانی کردووم، خوای میهرەبان هەر ئەمەی کردبوو و بۆ ئازاردانیشم بەوە کەمتر ڕازی نەبوو.
با هەڵی کردبوو، دەنگی مۆسیقایەک کە سەرچاوەکەی **مەیدانی خوێندکاران** بوو، لەگەڵ خۆی دەهێنا، وادیار بوو سەعات لە دووی پاشنیوەڕۆ لای داوە.
لەم کاتەدا کاغەزێکم دەرهێنا شتێک بنووسم، بەڕێکەوت وەسڵی بەشداربوون لە سەرتاشخانە لە گیرفانم کەوتەخوارەوە. کە ژماردم بینیم تەنیا شەش دانەیان ماوە و لەخۆمەوە وتم: خوایە شکور! هەر باشە کە چەند هەفتەیەک دەتوانم سەروفەساڵم بە بەلاش چاک بکەم و لانیکەم سەروشێوەیەکی ڕێکوپێکم هەبێت.
بە بینینی ئەم سەروەتوسامانەی بۆم ماوەتەوە دڵخۆش بووم. وەسڵەکانم بەوردی ڕێکوساف کرد و لە شوێنێکی گونجاوی گیرفانم دامنا، بەڵام هەرچیم کرد نەمتوانی شتێک بنووسم، لەگەڵ نووسینی چەند دێڕێکدا بیرکردنەوەم هیچی تیا نەدەما و بێتاقەت دەبووم کە نەمدەتوانی لە سەر نووسین چڕی بکەمەوە، بچووکترین شت

---

[1] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتەی کتێبی پیرۆز: "لە مەلەکانی ئاسمان بڕوانن کە نە دەڕوێنن و نە دەدروون و نە پاشەکەوت دەکەن، باوکە ئاسمانییەکەی ئێوە بەخێویان دەکات. ئایا ئێوە لەوان باشتر نین؟" (ئینجیلی مەتیو- دەروازەی شەشەم- ئایەتی ٢٦). (و.ف)

بیرکردنەوەی دەشێواندم و بەرەو شوێنێکی تر ئاراستەی دەکرد، بە بینینی هەر شتێک هەستێکی نوێم تێدا دەوروژا، مێشی گەورە و بچووک لە سەر کاغەزەکە دەنیشتنەوە و ڕێگری کارەکەم بوون، تا چەندیش بە توندی و بەدەمم فووم لێ دەکردن، بێسوود بوو، چ جڕوجانەوەرێکی قیرسیچمە و ناحاڵی بوون، لە سەر دوو قاچی دواوەیان بە کاغەزەکەوە نووسابوون و بەوپەڕی هێزیانەوە پێداگریان دەکرد، لنگی لەرزۆک و باریکیان دەنوشتایەوە، بە هیچ شێوەیەک نەدەکرا بیانجووڵێنی، قاچیان لە سەر لۆچی کاغەزەکە یان نیشانەیەک، وەک قولاپ گری دەدا و خۆیان دەنووساند بە خاڵێکەوە و توند پێوە دەلکان، تا ئەو کاتەی جەنابیان تاقەیان بچێت، ئینجا بفڕن.

ئەم مێرووە وردە جاڕزکەرانە، ماوەیەکی زۆر بیرکردنەوەمیان سەرقاڵ کرد، قاچم خستە سەرقاچ و بەپێداگرییەوە سەرقاڵی تەماشاکردنیان بووم، لەم کەینوبەینەدا، لەناکاو دەنگی ناسکی کلارنێتێک کە لە **مەیدانی خوێندکاران**ەوە دەهات، گوێی ختووکە دەدام و بیرکردنەوەمی بەرەو شوێنێکی تر برد، لەبەرئەوەی هیوام نەمابوو وتارەکە بگەیەنمە هیچ شتێک، کاغەزەکەم خستەوە گیرفانم و پاڵم بە کورسییەکەوە دا، بە ڕادەیەک مێشکم ڕووناک و کراوە بوو، کە بێ هیچ هەوڵێک دەمتوانی لە وردترین بیرکردنەوەکان حاڵی بم و بیهێنمە بەرچاوم. جەستەم لە دۆخێکدا بوو، دەمتوانی بە باشی چاو ببڕمە سینگ و قاچم، دەمبینی بەهۆی بەرزونزمی هەناسەم قاچم وردەجووڵەیەکی دەکرد، نیوەهەستاو خۆم بە تەماشای قاچەکانمەوە خەریک کرد، ئەوکات وەهمێکی سەیر هاتە خەیاڵم کە تا ئەو کاتە هەستم پێ نەکردبوو، لەرەیەکی نەرم و خۆش دەهاتە نێو ئەعسابمەوە، وەک ئەوەی گورزەتیشک بە ناو لاشەمدا تێپەڕ دەبێت. کە سەیری پێڵاوەکانم دەکرد، وەک ئەوەی کۆنەیارێک یان ئەندامێکی دابڕاوی لەشم ببینمەوە، ئەم هەستە ئەندامەکانی لەشم دەلەرێنێتەوە

و فرمێسـک لە چاومـا قەتـیس دەبێـت، وەک ئەوەی بینینـی پـێڵاو، دەنگێکی دڵگیر لە دەروونمدا زیندوو بکاتەوە.
لەپڕ خۆم سەرکۆنە کرد، کە چەند کەسێکی دەروونلاوازم و یەکسـەر گەڕامەوە دۆخی سروشتیم، بە خۆم پێکەنیم کە چۆن بوومەتە گاڵتەی ئەم جـۆرە هەسـت و بیرکـردنەوە قۆشـمە و پەرتەوازانە، هەوڵـم دا هێـزی لۆجیـک و بەڵگانـدنی ئەقڵـیم بگەڕێـنمەوە و چاوەکـانم تەنـگ دەکردەوە، تا بەر بە فرمێسکەکانم بگرم، ئەمجارە بە چاوێکی تر و بە وردییەکی تەواو لە پێڵاوەکانم ڕامـام، لەگەڵ هەر لەڕینەوەیەک کە بە قـاچمم دەبەخشـی، پێڵاوەکانیشـم حـاڵەتێکی جیاوازیـان وەردەگـرت، کەمـکەم هەسـتم بە شـێوە و قەبـارەی ڕاسـتەقینەی کـرد، دەمبینـی لێوارەکانی دڕاو و کۆن بوون و چرچبوونی چەرمەکە و پینەی سپی، کە لە هەمـوو لایەکەوە شـێوە و شـێوازێکی تایبەتیـان پێدەبەخشـی، وەک ئەوەی بەشـێک لە کەسـایەتی و ژیـانم لە ناویانـدا تـوابێتەوە، بەڕادەیەک وام دەزانـی ئەم پـێڵاوانەش لە هەناسـە و ژیـانی منـدا هاوبەشـن و بۆنی هەناسـەیان دەگـاتە لـووتم... مـاوەی سـەعاتێک ئەم هەستە زەین و خەیاڵمی داگیر کردبوو، لەگەڵ خۆم چەلەحانێم دەکرد و بەڵگە و هۆکارم دادەتاشی.
لەم کاتەدا پیرەپیـاوێکی لەڕولاواز هـات و سـووچێک لە کورسـییەکەی داگیـر کـرد، دیـار بـوو زۆر بەپێ ڕۆیشـتووە، چـونکە هەر کە دانیشـت هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و وتی:
"ئای، ئای، ئای، ئای، ئای، ئاااای هاوار!"
هەر دەنگـی گەیشـتە گـوێم، دەتـوت گێژەڵـووکەیەک لە نـاو مێشـکمدا هەڵـی کـرد و چـی تیـابوو گسـکی لێـدا، ئەوکـات ئەو بیـرۆکەیە بە خەیاڵمدا هات، ئەم خەیاڵپلاوییە بێسەروبەر و بیرکردنەوە پەرتەوازانە یادگاریی ماوەیەکی زۆر پێش ئێستان؛ ڕەنگە یەک دووسـاڵی پێشـوو، کە ئەم بیرکـردنەوە و وەهمـانە گیرۆدەیـان کردبـووم، بە جۆرێـک

تەنانەت بە زەحمەت بیرم دێتەوە، ئەهـ برا، پێڵاو چییە ئینسان بیری لێ بکاتەوە، پێڵاو پێڵاوە و ئەم هەڵیتوپەڵیتانەی ناوێت.

دەستم کرد بە سەیرکردنی پیرەپیاوەکە، دەمویست بزانم چ جۆرە زەلامێکە و چی لە باردایە؟ وادیار بوو هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشی تیا نییە، بە هیچ شێوەیەک سەرنجڕاکێش نەبوو، با شتێکی هەبوو، ڕۆژنامەیەکی کۆنی بە دەستەوە بوو، کە لە لاپەڕەکانی ناوەوە ڕیکلامی زۆر هەبوون، وادیارە شتێکی لێوە پێچاون، بە هیچ شێوەیەک نەمدەتوانی چاو لە ڕۆژنامەکە هەڵبگرم، هەستی فزولی و پرسوجۆم زیاتر بووبوو، بیرم لەوە دەکردەوە بۆ نموونە نەوەک ئەم ڕۆژنامەیە کۆپییەکی تایبەت و دانسقە و سەیر بێت! زیاتر فزوول دەبووم و بەکاوەخۆ شوێنەکەم لە سەر کورسییەکە دەگۆڕی، هەڵبەت دوور نییە ئەم کاغەزانە لەبری ڕۆژنامە، بەڵگەنامەی گرنگ و ترسناک بن و گریمان لە شوێنێکی شاراوەوە دزرابن، تەنانەت ئەگەری ئەوەشم دادەنا ڕەنگە ڕێکەوتننامەی نهێنی یان دەسیسە و بەڵێننامەی شاراوە بن.

پیاوەکە بێباک دانیشتبوو و بیری دەکردەوە.

ئەم پرسیارەشم لە خۆم دەکرد؛ بۆچی وەک ئەو خەڵکە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە و ناوەکەی بە ئاشکرا نەخستۆتە ڕوو، ڕەنگە ئەمەش فێڵێک بێت، بەدەر لەمەش بە هیچ شێوەیەک نەیدویست ئەو پاکەتەی ڕۆژنامەی لێوە پێچاوە دابنێت و تەنانەت وادیارە متمانەی بەوەش نەبوو بیخاتە گیرفانییەوە.

بێگومان شتێک لەم پاکەتەدا شاراوەتەوە! ڕاستییەکەی لەتاو فزوولی و لەوەی کە مەحاڵ بوو بچمە بنجوبناوانی ئەم نهێنییە، وەختبوو شێت دەبووم، بەهەرحاڵ چاوم ڕوو لە سەرەوە بەرز کردەوە، ڕەنگە شتێک بدۆزمەوە بیدەمە پیاوەکە و بەم بیانووە سەری قسەی لەگەڵ بکەمەوە، بەڵام تاکە شتێک بۆم دۆزرایەوە وەسڵەکانی سەرتاشخانە

بوو، ئەوەشم بەخێرایی شاردەوە، لەناکاو ناوی خوام لێ هێنا و دەستم بۆ پاکەتەجگەرە چەرمەکەم برد و وتم:
"جگەرە نافەرمووون؟"
پیاوەکە جگەرەی نەویست و زۆریش سوپاسی کردم، تاقەتی دووکەڵی نەبوو، بەو مانایەی لەبەرئەوەی چاوەکانی تەقریبەن کوێر بوون، بۆ ئەوەی خراپتر نەبێت جگەرەی تەرک کردبوو، بەڵام دەستپێشخەرییەکەی منی پێخۆش بوو، لێم پرسی ئەگەر چاوەکانی نوقسان بن، کەواتە هیچ شتێک تەنانەت ڕۆژنامەشی بۆ ناخوێنرێتەوە، لە وەڵامدا وتی بەڵێ ناتوانم بخوێنمەوە.
ئەوسا سەیرێکی کرد و بینیم هەردوو چاوی پەڵەیەکی سپی لە سەرە و حاڵەتێکی شوشەیی هەیە، نیگاکەشی لێڵ بوو، هەستی ڕقی تیا دەورووژاندم، هەر چۆنێک بێت لێی پرسیم:
"خەڵکی ئەم ناوە نیت؟"
وەڵامم دایەوە نەخێر و دیسان پرسیارم لێ کرد:
"تەنانەت ناتوانیت ڕۆژنامەش بخوێنیتەوە؟
وتی:
"با بەڵام بە ئاستەم."
دواتر ڕوونی کردەوە، بە شێوازی قسەکردنمدا وای زانیوە بێگانەم و پێی وابوو قسەکردنم بەڵگەی ئەوەیە، ئەوەشی وت کە گوێی بەڕادەیەک سووکە کە وردەکاریی شێوەقسەی هەموو کەسێک دەناسێتەوە، بۆ نموونە دەتوانێت شەوان ئەو کاتەی هەموو خەوتوون دەنگی دراوسێکەی ببیستێت...
داواجار پرسی:
"لە بیرم چوو پرسیار بکەم ماڵەکەتان لە کوێیە."
یەکسەر وەڵامم دایەوە:
"ماڵی ژمارە ٢ مەیدانی **سانت ئۆلاف**."

هەڵبەت ئەم درۆیەم پێشتر لە مێشکمدا سازاندبوو، بێ ئەوەی لە دڵەوە مەبەستی درۆکردنم هەبێت، ئەم وەڵامم خستە بەردەستی.
پیاوەکە وتی بەڕاستتانە؟ دواتر باسی ئەوەی کرد هەموو کونوکەلەبەرەکەی مەیدانی **سانت ئۆلاف** وەک لەپی دەستی دەناسێت، بۆ نموونە بیری کەوتەوە لەوێ چەند چراگاز و دوو دار و فوارەیەکی لێیە و دیسان پرسیاری کردەوە:
- "فەرمووتان ماڵی ژمارە چەند؟"
منیش کە وەسوەسەی ڕۆژنامەکە بێتاقەتی کردبووم، بۆ ئەوەی قسەکە ببڕێنمەوە هەستام و لەبەرئەوەی دەمویست بە هەر نرخێک بووە ئەم مەتەڵە هەڵبێنم پرسیم:
- "ئەی ئێوە ناتوانن ڕۆژنامە بخوێننەوە بۆچی..."
پیاوەکە بە هیچ شێوەیەک هەستی بە گێژاوی دەروونی من نەکرد و دیسان درێژەی دایێ و وتی:
- "پێمwایە فەرمووتان ژمارە ٢ بەڵێ؟ ڕۆژانێک هەموو کرێچییەکانی ژمارە ٢م دەناسی، ناوی خاوەنماڵەکەتان چییە؟"
لە وەڵامدا یەکسەر وشەی **هاپۆلاتی**یم[١] دەرپەڕاند.
هەڵبەت ئەم ناوەم یەکسەر ساختە کرد و لەخۆمەوە دروستم کرد، خستمە خزمەتی، چونکە دەمویست بەمشێوەیە لە کۆڵ خۆمی بخەمەوە تا لەوە زیاتر بێتاقەتم نەکات.
پیاوەکە بێ ئەوەی یەک واو لەم ناوە قەڵەو و ساختەیە لە بیر بکات، وەک پشتڕاستکردنەوەیەک دووبارەی کردەوە:
- "بەڵێ، فەمووتان **هاپۆلاتی**؟"
من دۆشداماو سەیرم دەکرد، ئەویش شێوەیەکی زۆر جیدی و بیرمەندانەی هەبوو، سەیرەکە ئەوە بوو هێشتا من ئەم ناوە ساختە و بێمانایەم نەدرکاندبوو، پیاوەکە وای دەردەخست پێشتر ئەم ناوەی بیستووە و ئەم کەسە دەناسێت، لەم کاتەدا پاکەتەکەی لە سەر

---
[١] Happolati

کورسییەکە دانا و لەناکاو هەستی پرسوجۆم ورووژا و تێگەیشتم لە سەر پەڕەکانی ڕۆژنامەکە چەند پەڵەچەورییەک دیارە.
پیاوەکە دیسان پرسی:
- "ئایا خاوەنماڵەکەتان دەریاوانە؟ کاتی قسەکردن دەنگێکی گاڵتەجارانەی نییە؟ ئەگەر لە بیرم نەکردبێت لە دەریادا خزمەتی کردووە."
- "فەرمووتان دەریا؟ ڕەنگە براکەی بفەرمووی و ئەویان بناسن، چونکە لەڕاستیدا ناوی ئەویان "ئی. ئا. هاپۆلاتی"یە و وەکالەتی بازرگانی هەیە."
پێموابوو بەم ڕوونکردنەوەیە ڕازی بێت و وازم لێ بێنێت، بەڵام کابرا دارێک نەبوو بەم بایە بلەرزێت، بۆ ئەوەی سەرەداوی قسەکەی لە دەست دەرنەچێت وتی:
- " بیستوومە کابرایەکی وریا و ئیشکەرە."
- "بەڵێ دەڵێی ددانی مارە! سەری چاک لە مامەڵەی بازرگانی دەردەچێت، وەکالەتی هەموو شتێکی هەیە لە گەنمی چین و خوری و پەڕی ڕوسیا و پێستە و هەویری تەختەوە بگرە تا دەگاتە مەرەکەب و ..."
لەم کاتەدا پیرەپیاوەکە هاتبووە سەر زەوق، قسەکانی پێ بڕیم و وتی:
- "ئەوە بەڕاستە! ئای لەو زۆڵە!"
کەمکەم قسەمان خۆش دەبوو و ئاگام لەخۆم نەدەما، یەک لەدوای یەک درۆم ڕیز دەکرد، دیسان لە جێگەکەم دانیشتمەوە، بابەتی ڕۆژنامە و بەڵگەنامەی نهێنیم تەواو لەبیر کرد، زۆر کەیفساز بووم و قسەکانم بە کابرا دەبڕی، ساویلکەیی و دەبەنگییەکەی مکوڕتری دەکردم، بێباکانە درۆی بۆ بکەم و ئەوپەڕی هەوڵ بدەم بیترسێنم و بیهێنمە سەر چۆک؛ بۆ نموونە لەبەر شتێک لێم پرسی ئاگای لەوەیە

کە هاپۆلاتی ئامێرێکی داهێناوە کە مەزامیری تەورات بە کارەبا چاپ دەکات؟ پیرەپیاوەکە دەرپەڕی و وتی:

- "چی چی.... چیی کارەبایی داهێنا؟"
- "بەڵێ، پیتی کارەبایی دروست کردووە کە لە تاریکیدا هەڵ دەبن، بەڕاستی کارێکی سەیر و سەرسوڕمێنە، ملیۆنەها کرۆن سەرمایەی بۆ ئەم کارە داناوە، تەنەکەچیی ماڵەکان و چاپخانەکانی شەو و ڕۆژیان ناوەتە سەریەک، بیستوومە حەوتسەد پسپۆڕی بە موچەی بەرزەوە دامەزراندووە و هەموویان پۆلپۆل خەریکی کارن."

لێرەدا پیاوەکە هەر ئەوەی پێکرا بە هێواشی بڵێت:

- "باشە قسەکەمان گەیشتە کوێ؟"

یەکبەیەک باوەڕی بە قسەکانم دەکرد، بەڵام بە هیچ شێوەیەک دۆشدامانی خۆی دەرنەدەخست، ئەمە کەمێک دڵساردی دەکردمەوە، چونکە چاوەڕێ بووم بەم هەموو درۆودەلەسەیە بترسێت و بشلەژێت.

دیسان چەند درۆیەکی بێسەروبەرم، کە ڕاستییەکەی بەڕێکەوت هاتە سەر زمانم بۆ کرد و پێم وت:

- " ئاگات لەوەیە کە ئەم بەڕێز هاپۆلاتییە کە ناومان هێنا، نۆ ساڵ لە ئێران وەزیر بووە؟"

دواتریش تێمگەیاند ئایا دەچێتە خەیاڵییەوە وەزارەت لە ئێران چ پێگە و شکۆیەکە؟ بەڵێ وەزارەتی ئەوێ لە پاشایەتی ئێرە گرنگترە و دەتوانین بڵێن ئەو خۆی پلەی "شا"ی هەبوو (ئەگەر پیاوەکە لە وشەی "شا" تێبگەیشتایە!). هەڵبەت بۆ ئەمە هیچی لێ نەهات و دواجار جێگەی خۆی کردەوە، دواتر چیرۆکەی کچەکەی، ئیلایالی‌م بۆ گێڕایەوە کە شازادەخانمێک بوو، لە ڕەچەڵەکی پەریزادەکان! سێسەد غولام و نۆکەر لە دەوری و لە سەر جێخەوێک لە گوڵی زەرد دەخەوت، جوانترین ئادەمییەک بوو تا ئێستا بینیومە! بەر لەعنەتی خوا بکەوم ئەگەر درۆ بکەم، یان ئەگەر هەرگیز شازادەیەکی وام لە

خەونـدا ببینییـت. پیرەپیـاوەکە کە چاوەکـانی بە هێمنــی لە ئەرزەکە بڕیبوو، لە جێگەکەی دەرپەڕی و وتی:
"پەح! یانی ئەوەندە جوان بوو؟"
"جوان چییە، بێقەزا بی، بتێک بوو بنیام لە بەردەمیدا دەهاتە سەر چۆک، نیانی و ویقارەیەکەی وەها بوو دڵی شازادە و عەوامی دەپێکا، جووتێک چاو لە ئاوریشمی خاو، باسکێک وەک عەنبەری سارا، نیگای وەک ماچێک دڵی دەکردە ئاو، دەنگی وەک قومێک شەرابی کۆن سەرمەستی دەکردی، بەم وەسفانەوە دەتانەوێ دولبەر و ناسک نەبێت؟"
دیار نەبوو پیرەپیاوەکە داڵغەی لە کوێیە، وای دەزانی باسی کەسێکی ئاسایی و بێخەوش دەکەم؛ بە کورتی ئەم ژنە ئایەتێکی ئاسمانی بوو و تەنیا لە حیکایەتی پەرییەکاندا وێنەی دەبینین.
ئەمجارە پیرەپیـاوەکە مـات بووبـوو و بەردەوام دەیـوت بـارەکەڵا، بـارەکەڵا! بێبـاکی و ساردوسـڕییەکەی بێزاری دەکردم، کار گەیشتە ئەوەی دەبـوو بە گەرموگوڕییەوە قسـە بکەم و تەنیـا خـۆم گـوێگری خۆم بم.
بابەتی بەڵێننامەی نهێنی و گرێبەستی شاراوە و دزراوم تەواو لە بیر کردبـوو، ئەگەرچـی پاکەتەکە کەوتبـووە نێـوان هەردووکمـانەوە، هیـچ حەزم نەدەکرد بـزانم چـی تێدایە، کەمـکەم خۆیشـم کەوتبـوومە ژێـر کاریگەریی ئەو چیرۆکـانەی گێڕابوومەوە، خوێن لە سـەرما دەکوڵا و زمـانم هەر خەریکـی درۆ دەرپەڕانـدن بـوو، قســەکانم لە بەرچـاو دەبوونە وێنە. ئێستا بە سەروشێوەی پیاوەکەوە دیار بوو دەیەو ـ بڕوات، چونکە لەناکاو هەستا و بۆ ئەوەی قسەکە بگۆڕێت وتی:
"بەڕاست دەڵێن ئەو کابرایە، یانی **هاپڵاتی** موڵکوماڵێکی زۆری هەیە."
ئەم پیرەپیاوە کوێرە قێزەونە چۆن دەیوێرا ناوێکی سەیر کە من دام هێنـاوە، ئـاوا لەخـۆڕا بهێنێتە سـەر زمـانی و یـاری پـێ بکـات، وەک

ئەوەی ئەم ناوەش وەک ئەو ناوە ڕیسوا و بازاڕییانەیە کە هەموو دووکاندارێک لە سەر تابلۆی دووکانەکەی دەینووسێت.

لای ئەو گۆکردنی ناوەکە ئاستەم نەبوو، یەک پیتیشی بەهەڵە نەدەوت، هەر لە سەرەتاوە ئەم ناوەی لە خەیاڵدا هەڵکۆڵرابوو، ئەم مەسەلەیە ئازاری دەدام، توڕەییەکی قووڵم بۆ ئەم پیاوە تێدا دروست بووبوو، چونکە هیچ شتێک ئەوی بەدگومان و دڕدۆنگ نەدەکرد و خۆشی نەدەشڵەژاند، بەهەرحاڵ بێدەبەرستانە لە وەڵامیدا وتم:

- "ڕاستییەکەی ئاگام لەم بابەتە نییە، عەرزم کردن کە ئەم بەڕێزە **یۆهان ئارێنت هایۆلاتی**یە و هەڵبەت پیتە یەکەمەکانی ناوەکەی ئاشکرایە و پێویستی بە وتن نییە".

پیاوەکە بە دەنگی گرژی من حەپەسابوو، جارێک وشەی **یۆهان ئارێنت هایۆلاتی** دووبارە کردەوە و دواتریش بێدەنگی لێ کرد، منیش هەر بۆ توڕەکردنی وتم:

- "باش بوو ئەگەر ژنەکەیتان ببینیایە... زەلامی وا زەبەلاح نابێتەوە! ئەها هەر بیریشی لێناکەنەوە کە چ دەعبایەک بوو: لەو جنۆکە قەڵەو و زەبەلاحە دەگمەنانەیە، هەڵبەت، لەو کابرایە دوور نەدەکەوتەوە؛ بەڵێ زەلامێکی وا..."

پیرەپیاوەکە هیچ کام لە درۆ شاخدارەکانی منی بێوەڵام نەدەهێشتەوە، بە هێمنی و بێباکی وەڵامێکی دەدایەوە، تەنانەت لە هەڵبژاردنی وشەکانی ورد دەبووەوە، نەوەک وشەیەک نەشیاو لە دەمی دەرچێت و توڕەم بکات، دواجار پەتم پچڕاند و هاتمە دەنگ و بە سەریدا هاوارم کرد:

- "هەر بەراستی بەخێربێیتەوە! وا دەزانن پێم خۆشە درۆتان لەگەڵ بکەم؟ ڕەنگە هەر باوەڕیش نەکەن کەسێک بە ناوی **هایۆلاتی** بوونی هەبێت؟ من هەرگیز پیرەمێردێکی وا ناجسن و بێحەیام نەدیووە! دەردی ئێوە چییە؟ ڕەنگە پێتان وابێت بەم فشوفیشاڵەوە لەبەرئەوەی پاکەتێک جگەرەم لە گیرفان نییە، کابرایەکی لاتوپووتم و یەک

ئەستێرەم بەو ئاسمانەوە نییە! با ئەوەشتان عەزر بکەم من کەسێک نیم ئەم یارییانەم پێ بکرێت، خوا شایەتە رێگە بە ئێوە و کەسی تریش نادەم ئاوام لێ بکات؛ ئەمە عەرز و ئەمە گەز!"
پیاوەکە لە جێگەکەی هەستابوو و بە دەمی داچەقیو و بێدەنگ تا کۆتایی گوێی لەخۆفشکردنەوەی من گرت، دواتر پاکەتەکەی لە سەر کورسییەکە هەڵگرت و بە هەنگاوی پیرانە و هەڵەداوان ملی رێگەلمەکەی گرت، بەرەو سەرەوە رۆیشت. من لە جێگەکەی خۆم دانیشتبووم و لە پشتەوە دەمبینی کەمکەم لە بەرچاوم بچووکتر دەبێتەوە، لە هەموو تەمەنمدا لە پشتەوە کەسم نەبینیوە ئەوەندە شێوەیەکی هەرزە و گلاوی هەبێت، هەربۆیە هیچ پەشیمان نەبووم کە بەوجۆرە بەر جنێوم دا... لەبەر ئەوە هیچ پەشیمان نەبووم.
خۆر دەچووە ئاسۆی خۆرئاواوە و ئاوا دەبوو.
چپەچپێکی نزم لە درەختەکانی دەوروبەرەوە بەرز دەبووەوە، پەرستیاری منداڵەکان کە لەو ناوە نزیک جۆلانێکان پۆلپۆل لە دەوری یەکتر خڕ بووبوونەوە، دانیشتبوون، بە گالیسکەی بچوک خۆیان بۆ رۆیشتن ئامادە دەکرد، من هێمن و سووکەڵە، تینوتاوی پێشوو لە دەروونمدا بە هێواشی دادەمرکایەوە.
نانی زۆریشم خواردبوو و ئەوەندەش بێزاری نەدەکردم، مەنگ و داهێزراو و خەواڵوو بووم، بە گشتی زۆر باش بووم، بەدەم پاڵدان بە کورسییەکەوە چاوەکانم داخست و بە هێواشی ئاگام لە خۆم نەما و چاوم گەرم بووبوو. زۆری نەمابوو خەوم لێ بکەوێت، کە لەپڕ پاسەوانی پارکەکە دەستی خستە سەرشانم و وتی:
"ئێرە شوێنی خەوتن نییە!"
هەستام و وتم:
"بێگومان وایە!"
لەوکاتەدا دۆخی کارەساتباریی خۆم هاتە بەرچاوم، ئێستا ئیدی دەبێ دەستبەکار بم و بیر لە چارەیەک بکەمەوە؛ زۆر بۆ کار گەڕابووم،

بەڵام سـوودی نەبـوو، ئەو داخوازییـانەی بـۆ ئـیش لـێم کرابـوون مـاوەیەکی زۆری بەسـەردا تێپەڕیبوو، ئیدی گرنگ نەمـابوو و جگە لەوەش داخوازییەکان هی کەسی ناسراو و گرنگ نەبوون، ئەو هەموو ڕەتکـردنەوەیەش لەو هـاوینەدا، تەواو دڵسـاردی کردبـوومەوە. بەهەرحاڵ کاتی کرێخانووەکە هاتبوو و پێویستی بە چارەیەک هەبوو، چونکە ئیشوکارەکانی تر دەکرا دوابخرێت.

دیسان قەڵەم و کاغەزەکەم دەرهێنا و بێ ویستی خۆم لە سووچێکی کـاغەزەکەدا ژمـارەی سـاڵی ١٨٤٨م نووسـی، خـۆزگە لایەنـی کەم بابەتێـک دەیتـوانی بەوپەڕی هێـزەوە کەمەندکێشـم بکـات، ئیلهـامێکی دەروونیم پێ ببەخشێت و وشـەگەلێک بهێنێتە نـاو مێشکمەوە؛ پێشـتر ناوبەنـاو حـاڵەتی وام تـووش دەبـوو و خۆشـحاڵی دەکـردم، لەم سـاتانەدا بەوپەڕی کەمتەرخەمیـیەوە دەمتـوانی پـارچەیەکی درێـژ بنووسم و باشیش دەردەچوو.

هەر لەوێ، لە سـەر هەمـان کورسـی دانیشـتووم و دەیـان جار ژمـارە ١٨٤٨ لەسـەر کـاغەزەکە دەنووسـم، بە هەمـوو شـێوەکان، پـان، درێـژ، لار دەینووسـم و بەردەوام چـاوەڕێم بابەتێـک بـۆ نووسـین بێـتە خەیـاڵمەوە، بیرکـردنەوەی مەحـف و پەرتەوازە پۆلپـۆل لە ئاسـمانی مێشکمدا دەفڕن، ئـاوابوونی هەتـاو خەمگین و هەستەوەرترم دەکات، پـاییز هـاتووە و سروشـت چـۆتە سـوڕی متبـوون و خەوتـنەوە، لە ئێستاوە مێشومەگەس و مێرووی هـاوینە، پاییز گەستبوونی، هەموو بوونەوەرەکان بە سەر دارەکان و لە داوێنی خاکدا کەوتوونەتە خۆ و نـیگەران و دڵتەنـگ بـۆ مـانەوەی خۆیـان تەقەلا و چنگەکـڕێ دەکەن، خرۆشێک کەوتۆتە نێو جیهانی مێرووەکانەوە و ئەم بوونەوەرە ورد و ڕۆحلەبەرانە بۆ دواجار دەجەنگن، بەڵام لەبەرچی و سوودی چییە؟ سـەروکەڵلەی زەردی خۆیـان لە نـاو گیاکـانەوە دەردەهێـنن و قـاچە باریکەکانیان هەڵدەبڕن، شاخۆلکەی درێژیان دەلەرێتەوە، هەر ئەوکاتە مێـرووی دامـاو لەپـێ دەکەوێـت، تەقەلایەتـی و پەلەقـاژێ دەکـات و

سەراونخون دەبێت و گیان دەسپێرێت، هەناسەی ساردی یەکەم سەرما کەوتۆتە سەر گۆنای گیاکان و هەریەکەیانی بە جۆرێک زەردەڵە و بزرکاو کردووە، گەڵا ئازارچەشتوو و سەرگەردانەکان لە سەر ئەرزەکە خشەخش دەگەڕان، وەک دەنگی تاقمێک کرمۆکەی ئاوریشم کە گەڵا بجوون، دەناڵێنن، وەرزی خەزان لە ناو ئەم شینوشەپۆرە لەرۆزکەدا دەردەکەوێت، گۆنای سووری گوڵەکان وەک بڵێسەی لێ دێت و دواتر وەک خوێن و بە یەکجاری دەدرەوشێتەوە، لەم وەرزەدا لە ڕوخساری نەخۆشێکی سیلاوی دەچێت.
منیش هەست دەکەم لەم دنیا خەوزەدەیەدا وەک مێرووپەکی ناچیز لە سەر لێواری گیانداندام و تیاچوونم نزیکە.
ترس و لەرزێکی غەریب بەسەرما زاڵ دەبێت، هەڵدەسم و بە هەنگاوی خێرا و درێژەوە، لە ڕێرەوەکانی باخەکەدا پیاسە دەکەم و دەستم گرێ داوە و هاوار دەکەم، نەخێر ئەمە ژیان نییە من دەژیم! دەبێ ئەم چارەسەر بکەم! دیسان لە جێگەکەم دادەنیشم و قەڵەمەکەم بە دەستەوە دەگرم، دەمەوێ بابەتێک بخەمە سەر کاغەز، خێرا کرێماڵەکەم دێتەوە بیرم و تێدەگەم ئاوا وتار نانووسرێت، دواجار هەرچۆنێک بێت هەستەکان چڕ و بیرکردنەوەم کۆ دەکەمەوە، چەند لاپەڕەیەکم وەک پێشەکی بۆ چوونە نێو باسەکە نووسی، پێشەکییەکە باش دەرچوو و دەروازەیەکی باش بوو بۆ هەموو جۆرە نووسینێک، بۆ نموونە لەگەڵ سەفەرنامە یان وتاری سیاسی و هەموو جۆرە پارچە ئەدەبییەک دەگونجا، دواتر بڕیارم دا ناوەڕۆکێک بدۆزمەوە و بیخەملێنم، ئیدی قسە لە سەر کەس یان بابەتێک بێت، یان هەر شتێکی تر کە لە قەڵەمەوە بێتە دەر، بەڵام هەرچیم کرد سەرنەکەوتم، کەمکەم مێشکم پەرتەوازەتر و تێکچڕژاوتر بوو، وەک ئەوەی بەشێک لە مێشکم لە ئیش کەوتبێت، کەللەسەرم تەواو بەتاڵ دەبووەوە، وەک تەنێکی بۆش و سووکەڵە لەسەر سەرم دەمایەوە، هەست دەکەم سەرتاپام خاڵی بووەتەوە و مێشکم هەڵپچڕاوە و هیچی تیا نەماوە، بە

ئـازار و ژانەوە چەنـد جارێـک پەیتاپەیتـا هـاوارم کـرد: ئەی خـوای ئاسمانەکان، خوایە، پەروەردگار، فریام کەوە!
گڤەی بـا خرۆشـی دەخسـتە نێـو گەڵاکـانەوە، بـاوبۆرانێکی بەهێـز لە ئانوساتی هاتندا بوو، جارێکی تر نائومێدانە چاوم بڕییە کاغەزەکان و نوشـتانمەوە و بە هێواشـی خسـتمە گیرفـانم، هەوا سـارد دەبـوو و هێلەکیشم لە بەردا نەبوو، قۆپچەکـانم تـا سـەرەوە هەڵپێکـا و دەسـتم خستە گیرفانمەوە و لە جێگەکەم هەستام و کەوتمە ڕێ، خۆزگە یەک جـار، تەنیـا یەک جـار و تەواو، بەخـتم بـوایە و ڕێگەچـارەیەک دەرکەوتایە.
تا ئێستا دووجار خاوەنماڵ بە نیگاکانی داوای کرێی دواکەوتووی لێ کردبووم، منیش سەرشۆڕ و لێزانانە بە سڵاوێکی کورت خۆم دەرباز کردبوو، بەڵام ئەگەر جارێکی تـر چاوی لە چاوم گیـر بوایە، هێزی ئەوەم نەبـوو پرکێشـی وا بـکەم، ڕێـگەیەک نەبـوو جـگە لەوەی سووکوباریک بابەتەکەی تێ بگەیەنم و ژوورەکەی بۆ چۆڵ بکەم، تا کەی ئاوا بێسەروبەر دەتوانم بژیم؟
کە گەیشتمە بەردەرگای دەرەوەی پارکەکە، دیسان پیرەپیاوەکە کە بە تـوڕەییەوە لە کـۆڵم خسـتبووەوە، بینـیمەوە، پـاکەتە پـڕنهێنییەکە کە ڕۆژنـامەی لـێ پێچـابوو، لە تەنیشـتی و بە کراوەیـی دانرابـوو، بە جووتەچاوی خۆم بینیم لە پاکەتەکەدا جگە لە خواردن هیچی تیا نییە، پیـاوەکەش بە چـوارپەل خەریکـی خـواردن و هەڵلوشـینییەتی، وتـم بڕۆمە لای و داوای لێبووردنی لـێ بکەم، بەڵام کە خـواردنەکەیم بینـی پەشـیمان بـوومەوە، پیرەپیـاوەکە بە پەنـجەی قڵشـاو کە لە چڕنـووکی داڕزاو و هەڵواسـراو دەچـوو، بە جـۆرێکی پـیس پـاڕووە چەورەکەی گرتبوو، بە بینینـی ئەم دیمەنە هێڵنجم هـات، بـێ ئەوەی هـیچ بڵێم بە بەردەمیدا تێپەڕیم، ئەویش بێ ئەوەی هـیچ لە دەموچاویدا بگۆڕێت بە چاوانێک کە وەک چەرم قـایم و وشـک بـوون، بەرەو لای مـن ڕامـا و نەیناسیمەوە، منیش وەک ئەوەی نایبینم بە ڕێگەکەمدا ڕۆیشتم.

له بەردەم هەموو ڕۆژنامەیەکی داکوتراوی دیوارەکان دەوەستام و داخوازیی تایبەت بە دەرفەتی کارم دەخوێندەوە، ئەم جارە بەختم دەرکەوت و شتێکی بەسوودم دۆزییەوە: بازرگانێکی خەڵکی "گرۆنلاند" پێویستی بە کەسێک بوو کە هەموو عەسرێک چەند سەعاتێک، ئۆفیسەکانی بۆ ڕێکوپێک بکات، پێدانی موچەشی دواخستبوو بۆ ئامادەبوونی ڕاستەوخۆ، ناونیشانی بازرگانەکەم نووسی و له دڵەوه پەنام بۆ خوا برد یارمەتیم بدات، کەس له من گونجاوتر بۆ ئەم کارە بوونی نەبوو، هەڵبەت ئەگەر پەنجا ئۆرایان بدایە، کە زۆریش باش بوو، بەڵام بە چل ئۆراش ڕازی بووم، باقییەکەی بە دەست چارەنووس بوو. له کاتی گەڕانەوەدا له سەر مێزەکە کاغەزێکم بینی، خانمی خاوەنماڵ تکای کردبوو کرێماڵەکە پێشوەخت ڕەوانە بکەم ئەگەرنا بەخێرایی ژوورەکە چۆڵ بکەم.

هەڵبەت نابێ بابەتەکە وەک فەرمانێک لێک بدەینەوە، چونکە فەرمان نەبوو، بەڵکو له تکا و پاڕانەوە دەچوو، ڕەنگە ئەویش له دڵەوە حەزی لەم داوایە نەبێت، چونکە له کۆتایی کاغەزەکەدا نوسیبووی:

"لەگەڵ ڕێزی زۆر و قووڵ **مادام گوندرسن**".

بەهەرحاڵ، یەکسەر داخوازییەکەم بە ناونیشانی ناوەندی بازرگانی **کریستی**، ژمارە ۳۱ی شەقامی گرۆنلاند نووسی و خستمە پاکەتەوە، تا له سندوقی پۆستەکەدا دای بنێم، دواتر دیسان گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، له سەر کورسییەکە دانیشتم و بیرکردنەوە نوقمی کردم، تاریکیی شەو کەمکەم زیاتر و خەستتر دەبوو.

دیسان ئیشوکارم گرێی تێدەکەوت و خۆڕاگریش زەحمەتتر، سبەی زۆر زوو له خەو هەستام، کە چاوم کردەوە هێشتا هەوا تاریک بوو، ماوەیەک دواتر، سەعاتی دیوارەکەی نهۆمی ژێرەوە، سەعات پێنجی سپێدەی ڕاگەیاند.

ویستم دیسان بخەوم، بەڵام بە هیچ شێوەیەک خەو نەچووە چاوم، بێدار و خەوزڕاو بووم و هەزاران بیرۆکە بە خەیاڵمدا دەهات، لەناکاو

چەند دێڕێکی جوان هاتە بیرمەوە، تا ئێستا دێری وەها جوان و ناسک و بەهێز نەهاتبووە زەینمەوە، چەند خۆش بوو ئەگەر لە چیرۆکێک یان نووسینێکی تردا جێی بکەمەوە، بەدەم ڕاکشانەوە دێڕێکم دووبارە دەکردەوە و هەستم بە نایابییەکەی دەکرد! کەمکەم دوای ئەوە دێڕی تر دەهاتن و بە یەکجاری خەویان لێ زڕاندم، لە سەر چرپاکەم دادەنیشم و قەڵەم و کاغەز هەڵدەگرم و دەست دەکەم بە نووسین، توانام ورووژاوە، وشەکان یەک لە دوای یەک بەسەرمدا دادەبارین و لە دوای یەک ڕیز دەبن، بە هۆیانەوە ناوەڕۆکێک دروست دەبێت؛ دیمەنی جۆراوجۆر لای یەک کەڵەکە دەبن، پرۆسە و دیالۆگی چیرۆکەکان دێنە خەیاڵمەوە.

حاڵەتێکی ئاسوودەیی زۆر قووڵ لە خۆمدا هەست پێ دەکەم.

بەحەپەسانەوە دەنووسم، بێ وەستان لاپەڕە دوای لاپەڕە ڕەش دەکەمەوە، لەو کاتەدا ئەوەندە بیرکردنەوەی جۆراوجۆر و فراوان دێتە خەیاڵمەوە، کە بە ناچاری هەندێ بابەتی لاوەکیم بیر دەچێت، چەند هەوڵ دەدەم ناتوانم هەموو ئەم بیرۆکە نایابانە بەخێرایی بخەمە سەر کاغەز، سەرتاپام بووە زەوق و کەیف، بە جۆرێک نوقمی بابەتەکەم وەک ئەوەی لە جیهانی غەیبەوە ئیلهامم بۆ ڕەوانە بکرێت.

ئەم حاڵەتە شیرین و خۆشە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت.

کە دەست لە قەڵەم بەر دەدەم، نووسینەکە تەواو دەکەم، دەبینم بیست سی لاپەڕەم ڕەش کردۆتەوە، ئەگەر ئەم نووسینە پەرشانە بەڕاستی نرخێکیان هەبوایە، ڕەوتی ژیانم بە یەکجاری دەگۆڕا!

بەهەرحاڵ، لە چرپاکەم دێمە دەرەوە و خۆم دەگۆڕم، هەوا ڕووناکە و ئێستا دەتوانم دێڕەکانی ڕیکلامی ئۆفیسی فانۆسە دەریاییەکان تا ڕادەیەک بناسمەوە؛ بەردەم پەنجەرەکە بەڕادەیەک ڕووناکە کە هەموو شتەکان ئاشکرا دەبینم و تەنانەت دەتوانم بنووسم، یەکسەر دەست دەدەمە پاکنووسکردنی کاغەزی ڕەشنووسەکان، ئەم خەیاڵە ئەدەبییانە سەرلەبەر ڕووناکی و ڕەنگن، سەرم سوڕدەمێنێت چۆن

ئەو بابەتە دانسقانە هاتووە بە خەیاڵمدا، ئافەرین بۆ خۆم دەکەم و دانی پێدا دەنێم هەرگیز نووسینێکی وەها جوانم نەخوێندۆتەوە، لە دڵخۆشیدا سەرم گێژ دەبێت و پڕ دەبم لە بەختەوەری، دەبینم توانا شاراوەکانم زۆر نایاب دەرکەوتووە و زەوقی ئەدەبیم سەرلەنوێ بوژاوەتەوە، کە نووسینەکەم هەڵدەسەنگێنم، لە یەکەم خوێندنەوەدا نرخەکەی بە پێنج کرۆن دەخەمڵێنم، هەڵبەت پێنج کرۆن بێ هیچ مامەڵە و چەلەحانێیەک، هەرچەند دوور نییە لەبەر گرنگیی کارەکە دە کرۆنیش بدەن، بەڵام هەرگیز ئامادە نیم بەرهەمێکی بەوجۆرە ڕەسەن و داهێنەرانە بە فەخری بڵاوبکەمەوە و هیچم نەدەنێ، چونکە دەزانم وێنەی نییە و بە هەموو کەس نانووسرێت! پێموایە تەنانەت ئەگەر لە دە کرۆن کەمتریش بدەن، عەیبە وەری بگرم.

ژوورەکەم زیاتر ڕوونـاک دەبووەوە، چاوێکم گرتە دەرگاکە و تێگەیشتم بە هەولێ زۆر پێتە وردەکانی پۆستەرەڕیکلامەکە بخوێنمەوە "بۆ کرینی کفن، سەردانی خانمی ئەندرسۆن بکەن، لای ڕاست، لە دەرگای ژوورە گەورەکە." لە لایەکی ترەوە ماوەیەکی زۆر بوو لە سەعاتەکەوە زەنگی سەعات حەوتی بەیانی بەرز بووبووەوە.

خێرا هەستام و ڕام کردە ناوەڕاستی ژوورەکە، بە ویژدانەوە بڵێم لە کاتێکی باشدا مادام گۆندرسن ئیزنی دابووم، چونکە ئێستا ژیان لە ژوورێکی وادا شایستەی من نییە، ئای لەم ژوورە! پەنجەرەکانی بە پەردەی ناشیرینی بازاڕی ڕازاوەتەوە، دیوارەکانیشی بەشی پێویست بزمار و گیرەی پێوە نییە، بۆ هەڵواسینی جلوبەرگ. کورسییە ڕزیوەکەی سووچی ژوورەکە لە ڕاستیدا وێنەیەکی گاڵتەجاڕی ئەو کورسییە بێشکەییانەیە، بە سەیرکردنی لە پێکەنینا دەقرتای، ئەم کورسییە بەڕادەیەک نزم و کورت بوو، کە تەنانەت باڵاناوەندێکیش نەیدەتوانی بە ئاسوودەیی لە سەری دابنیشێت، ئەوەندە بچووک و تەسک بوو، کە هاتنەدرەوە لێی پێویستی بە پاژنەهەڵکێش بوو! بە کورتی ئەم ژوورە بۆ ئەوانەی سەروکاریان لەگەڵ کتێب و قەڵەمە و

ئیشی فیکری دەکەن، گونجاو نەبوو. هەرچۆنێک بێت من بە هیچ شێوەیەک ئامادە نەبووم لێرە بژیم.
بەردەوام خەیاڵم لای نووسینەکەم بوو، ناوبەناو ڕەشنووسەکانم لە گیرفانم دەردەهێنا و چەند بەشێکیم دەخوێندەوە، لە خۆشیدا شاگەشکە دەبووم، لەم کاتەدا بیرم لە ماڵگواستنەوە کردەوە، ویستم پلانەکەم جێبەجێ بکەم، بوخچەی کەلوپەلەکانم ڕاکێشایە دەرەوە، ئەم بوخچەیە پەڕۆیەکی پانی سوور بوو، ناوەڕۆکەکەی چەند یەخەیەکی پاک و چەند ڕۆژنامەیەکی گرمۆڵەکراو بوو، کە پاشماوەی خواردنەکەم تێکردبوو و لەگەڵ خۆم هێنابووم، بەتانییەکەشم قەد کرد و بەشی پێویست کاغەزی سپیم خستە گیرفامەوە، دەبینن هەموو سەروماڵی من هەر ئەمانە بوون! دواتر بۆ ئەوەی دڵنیابمەوە هیچم بەجێ نەهێشتووە، هەموو کونوکەلەبەرەکانی ژوورەکە گەڕام و لەبەرئەوەی هیچم نەدۆزییەوە ڕۆیشتمە لای پەنجەرەکە و سەیری دەرەوەم کرد.
هەوا تاریک و شێدار بوو. لای ئاسنگەرییەکە کە گڕی تێبەربووبوو کەس نەدەبینرا، لە ناو حەوشەکەی خوارەوە، تەنافێکیان کە لەم دیوارەوە بۆ ئەو دیوار هەڵواسیبوو، لە ژێر تەمی ئەو بەیانییەدا گرژ بووبوو. لەبەرئەوەی دەمێک بوو ئەم دیمەنانەم دەناسی و خووم پێوە گرتبوون، هیچیان بە لامەوە تازە نەبوون، هەربۆیە لەبەردەم پەنجەرەکە دوور کەوتمەوە.
بەتانییەکەم خستە ژێر باڵم، کڕنووشێکی درێژم بۆ سەرۆکایەتی "نووسینگەی فانۆسە دەریاییەکان" و کڕنووشێکی دیکەشم بۆ "کفنەکانی خانمی ئەندرسن" برد، دەرگاکەم کردەوە و ڕۆیشتمەوە دەرەوە. لەپڕ کەوتمەوە بیری خانمی خاوەنماڵ، دەبوو تێی بگەیەنم سەروکاری لەگەڵ کەسێکی بێوەیدایە و جگە لەوەش نەدەکرا ئاگای لە ماڵگواستنەوەی من نەبێت، دەشمویست نامەیەکی بۆ بنووسم، لەوەی چەند ڕۆژێک پێش کۆتایی هاتنی کاتی کرێماڵەکە لە

ژوورەکەیدا مابوومەوە، بە نووسراو داوای لێبووردنی لێ بکەم، سوپاسی میهرەبانییەکەی بکەم، بیرکردنەوە لەوە ماوەیەکی زۆر لە قوڕبەسەری و چارەڕەشی ڕزگارم بووە، بەڕادەیەک هێزی زیاتر دەبوو کە بەڵێنم بە خاوەنماڵ دا، ئەم چەند ڕۆژە سەردانی دەکەم و پێنج کرۆنی بۆ دەهێنم، مەبەستم ئەوە بوو بەم کارەم بیسەلمێنم کرێچییەکەی، کابرایەکی بێوەی و دەستپاکە، کاغەزەکەم نووسی و خستمە سەر مێزەکە، کە گەیشتمە بەر دەرگای ماڵەکە، ماوەیەک وەستام و یەک جاری تر ئاوڕم دایەوە، نوقمی دڵخۆشی بووم، چونکە هەستم دەکرد گەڕاومەتەوە بۆ دۆخی ئاسایی خۆم، هەر ئەم بابەتەش هەستێکی خۆش و ڕۆحهەژێنی لە دڵمدا دروست دەکرد! لە ناخی دڵەوە سوپاسی خوا و هەموو خەڵقی خوام دەکرد، سپێدەی هەمان ڕۆژیش، لە بەردەم چرپاکەم کەوتبوومە سەرچۆک و بە دەنگی بەرز شوکرانەبێژی یارمەتییەکانی خوا بووبووم، چونکە دەمبینی خوا هاواری پرسوێی دوێنێی منی وەڵام داوەتەوە، لە بەرەکەتی خۆی بێبەشی نەکردووم، ئەو دڵخۆشییە و ئەوەشی نوسیبووم هەر بەهۆی ئەمەوە بوو، بە خۆم دەوت، بەڵێ ئەمە کاری خوا و بەرهەمی بەخشندەیی خوایە، لەتاو جۆشوخرۆشی دەروونم دەگریام، ناچار بووم گوێقوڵاخ بم ئایا دەنگێک لە پلیکانەکانەوە دێت یان نا، دواجار بڕیاری ڕۆیشتم دا، دواتریش بێدەنگ و بێ ئەوەی کەس بمبینێت، لە پلیکانەکانەوە هاتمە خوارەوە و لە دەرگای ماڵەکە هاتمە دەرەوە، کۆڵانەکان بەهۆی بارانی بەیانییەوە تەڕ و ڕوون بوون، هەورە سارد و پڕبارانەکان بە ئاسمانی شارەوە هەڵواسرابوون، لە هیچ شوێنێکەوە ڕووناکیی خۆر دیار نەبوو.

دیار نەبوو سەعات چەندە، من وەک جاران بەرەو بینای بەندیخانە دەڕۆیشتم، لە نیوەی ڕێگەکەمدا بینیم سەعات هەشت و نیوە، هێشتا دوو سەعاتی مابوو بۆ کاتەکەی خۆی، سەردانی نووسینگەی ڕۆژنامە پێش سەعات دە و ڕەنگە تا یانزەش بێسوود بوو، دەبوو

ئەم ماوەیە لە خۆڕا پیاسە بکەم، شتێک بدۆزمەوە هیچ نەبێت نانێکی سادە بخۆم، ئەگەر ئەو ڕۆژەم بە برسێتی بڕۆیشتایە باکم نەبوو، چونکە لەمەبەدوا پشت بە خوای گەورە ڕۆژگاری بەلا و لێقەومان وەک کابووسێکی ڕەش لە کۆڵم بۆتەوە.

تاکە شتێکی جاڕسی دەکردم بەتانیی سەوزی ژێر باڵم بوو، جوان نەبوو شتێکی وام بە دەستەوەیە، دەبوو بزانم چۆن بیر لە من دەکەنەوە؟ بەدەم ڕێگەوە بەتەمابووم تا پێش تەواوکردنی کارەکانم، بەتانییەکە لە شوێنێک دابنێم، لەناکاو هاتە بیرمەوە سەردانی دووکانی سۆمب بکەم، بەتانییەکە لە شتێک بپێچن تا جوانتر دەربکەوێت، بە بردنی بەتانییەکە بۆ نوسینگەی ڕۆژنامە شەرمەزار نەبم، بەهەرحاڵ چوومە نێو دووکانەکە و بەتانییەکەم دا بە یەکێک لە شاگردەکان، سەرەتا سەروسیما و دواتریش بەتانییەکەمی هەڵسەنگاند، باش هەستم بەوە کرد کە لە کاتی وەرگرتنی بەتانییەکە، شانەکانی بە هێمای سوکایەتی هەڵتەکاند و هەڵبەت زۆر وریا بوو پێی نەزانم، ئەم جووڵەیەم پێناخۆش بوو و بە دەنگی بەرز وتم:

- "ئەری، کەمێک وریا بن! دوو قاپی گرانبەها لە ناو بەتانییەکەیە و دەمەوێت لەگەڵ ئەم پاکەتە ڕەوانەی بەندەری **ئیزمیری** بکەم."

ئەم قسەیە قووڵ کاری لە شاگردەکە کرد، لەوەی سەرەتا بابەتەکەی بە سووکی گرتبوو، هەستی بە شەرمەزاری کرد و بێدەنگ داوای لێبوردنی کرد، کە پاکەتەکەی باش پێچایەوە و ئامادەی کرد، من خۆم وەک کەسێک دەرخست کە تا ئێستا چەندین جار کەلوپەلی گرانی ڕەوانەی **ئیزمیر** کردووە، بە نیگایەکی لەخۆبایی سوپاسم کرد، لە کاتی چوونە دەرەوە لە دووکانەکە خۆیشی بە هەڵەداوان هات و دەرگاکەی بۆ کردمەوە.

دواتر بە ناو ئەو خەڵکەدا کە لە مەیدانی **بازاڕی گەورەدا** دەڕۆیشتن، بەدەم پیاسەوە تێپەڕیم و هەوڵم دا بە بەردەم ژنانی گوڵفرۆشدا تێپەڕم، بینینی گوڵی گەورەی سوور بە ڕەنگی گڵپەی ئاگر، لە ژێر

ئاسمانی خۆڵەمێشی ئەو بەیانییەدا، دەیوروژاندم، زۆر حەزم دەکرد چڵێک بدزم، نرخی گوڵەکانم پرسی، بەڵام مەبەستم ئەوە بوو لە نزیکەوە سەیریان بکەم، ئەگەر شتێک پارەم هەبوایە قیروسیام لێ دەکرد و چڵێکم دەکڕی، دواتریش بە پارەکۆکردنەوە جێگەکەیم پڕ دەکردەوە.

کە سەعات بوو بە دە، ڕۆیشتمە نووسینگەی ڕۆژنامەکە، سەرنووسەر هێشتا نەهاتبوو، کابرای **مقەست**[1] هەندێ ڕۆژنامەی کۆنی ئەمدیواودیو دەکرد، وەک بڵێی بۆ شتێک دەگەڕێت، لە سەر داوای ئەو، بابەتە درێژەکەمی دەدەمێ و باسی گرنگییە زۆرەکەی بۆ دەکەم، ئەوەش دەڵێم هەر لەگەڵ هاتنی سەرنووسەر، بیداتە دەست خۆی، خۆیشم هەر ئەمڕۆ دێمەوە و وەڵامەکەی لێ وەردەگرمەوە.

کابرا، کە سەری بۆ ناو ڕۆژنامەکان شۆڕ کردبووەوە وتی: زۆر باشە! بەڵام ئەگەرچی دەمزانی قسەکانمی بێباکانە وەرگرتووە، هیچم نەوت، بەڵکو ئامـاژەیەکی بێدەربەستانەم کرد و ڕۆیشتمە دەرەوە. کاتم زۆر بوو، بریا لانیکەم هەوا خۆش بوایە، هەر بەڕاستی هەوایەکی ناخۆش بوو، نە بایەک دەهات و نە فێنکیش بوو! ژنان لە چاوەڕوانی هەر ئەگەرێکدا، چەترەکانیان بە کراوەیی بەدەستەوەبوو، کڵاوی خوری پیاوانیش ناشیرین و قۆشمە دەردەکەوت.

پیاسەیەکی ترم بە ناو بازاڕدا کرد، دیسان گوڵە سوور و سەوزەکانم تەماشا کرد، لەم کاتەدا دەستێک بەر شانم کەوت و گەڕامەوە بینیم یومفرووە[2]، سڵاوی کرد، بەڵام وەڵامی سڵاوەکەیم بە دەنگێکی

---

[1] کابرای مقەست، ناوێکە بۆ ئەو کەسەی کە بابەتە گرنگەکانی ڕۆژنامە، بە مقەست دەبڕێت و کۆیان دەکاتەوە و ئەرشیفیان دەکات، لەبەر کارەکەی ئەم نازناوەیان پێداوە. لە وەرگێڕانە ئینگلیزیی و عەرەبییەکەشدا وشەی مقەست بە کارهاتووە. (و.ک).

[2] لە نەرویجییەکەدا jomfruen بەکارهاتووە، لە ئینگلیزییەکەدا (Missy) لە فەڕەنسییەکەدا (Demoiselle)، کە سەرجەمیان بە مانای کچێکی خوار تەمەن بیست-

حەپەساوەوە دایەوە، چونکە حەزم لە چارەی نەبوو و نەمدەویست بزانم چی دەوێت.

نیگایەکی پرسوجۆکەرانەی گرتە پاکەتە گەورە و پێچراوەکەی ژێر باڵم و پرسی:

- "ئەوە چییە پێتە؟"

بێباکانە وتم:

- "هیچ نییە، کراسێکم لەو دووکانە کڕیوە، چونکە تێگەیشتم نابێ ئەوەندەش پەڕپووت بم و دەبێ کەمێک ئاگام لە خۆم بێت و بۆ جلوبەرگ دەستقونجاو نەبم."

مات و حەپەساو سەیری کردم و بە هێواشی پرسی:

- "باشە با واز لەوە بێنین، دەنگوباس چییە؟"
- "باشترە لەوەی بیری لێ دەکەیتەوە".

دیسان پرسی:

- "کەواتە ئیشوکاری سەرپێیت دەست کەوتووە؟"

بە سەرسوڕمانەوە وتم:

- "حەیفت نەکرد ئیشوکاری سەرپێیی؟ لە ناوەندی بازرگانیی **کریستی**، لای کابرا قەڵەوەکە، ژمێریارم."

هەنگاوێک لێم دوورکەوتەوە:

- "وەڵا نازانی چەندم پێخۆشە، بەڵام بەو مەرجەی پارەکەت بە فیڕۆ نەدەیت، دەی باشە خواحافیز!"

---

بیستوپێنج ساڵ یان بە مانای پاکیزە بەکار دەبرێت، بەڵام لەڕاستیدا ئەم کەسە مێ نییە بەڵکو نێرە! هەربۆیە ناچار گەڕاین بۆ مانایەکی خوازەیی بۆ وشەکە کە لە ئینگلیزییەکەدا هەندێجار وەک تانەیەک بۆ کەسێکی چارسەکەر بەکاردێت، لە کوردیدا وشەی (مووی لووت: ئەوەندە ئیزعاجە ئەڵێی مووی لووتە) بەکاردەهێنین، بەڵام ناکاتە ئەو وشەیە. هەرچەند بەپێی سروشتی ئەم دیالۆگە دەشێت ئەم مانایە ڕاست بێت. ئاشکرایە کە مەبەستی هامسۆن لەم ناوە، ناوێکی خوازراوە؛ بۆیە ناچاربووین نەرویجییەکە وەک خۆی دابنێین. (و.ک).

بەلام هێشتا نەڕۆیشتووە دەگەڕێتەوە، بە گۆچانەکەی هێما بۆ پاکەتەکەی دەستم دەکات و دەڵێت:

"ئێستا کە وای لێهات بە پێویستی دەزانم بۆ دروونی جلوبەرگ خەیاتەکەی خۆمت پێ بناسێنم، لەم شارە لە ئیزاکن باشترت دەست ناکەوێت، بە تایبەتی پێی بڵێ من تۆم ناردووە!"

باشە بۆچی دەستی دەخستە کارەکانمەوە؟ چ پەیوەندییەکی بەوەوە هەیە دەچمە لای کام خەیات؟ بینینی ئەم بوونەوەرە بێئیشوکارە، بە جلوبەرگی زاخاودراوەوە توڕە و پەستی دەکردم، بە ڕەقی ئەو دە کرۆنەی قەرزارم بوو، پێم وتەوە و پێش ئەوەی لێو بکاتەوە پەشیمان بوومەوە، ئەوەندە شڵەژا بووم لە ڕووم نەدەهات سەیری ناوچاوی بکەم، بە خۆشحاڵییەوە لەم کاتەدا ژنێک لێمان نزیک کەوتەوە، بە بیانووی کردنەوەی ڕێگە بۆ خانمەکە، لە یەکتر دوور کەوتینەوە و منیش ڕۆیشتم.

ئێستا ئەم کاتە درێژەی چاوەڕوانی چۆن تێپەڕێنم و چی بکەم؟ بە گیرفانی بەتاڵ ناکرێ بڕۆمە کافتریایەک و ناسیاویشم نەبوو ئەم کاتانە سەردانی بکەم، بێ ئیشوکار بەرەو سەرەوەی شار ڕۆیشتم، کەمێک لە نێوان بازاڕ و شەقامی گرنسن پیاسەم کرد، ڕۆژنامەی ئافتن پۆستن[1]ی سەر دیوارەکەم خوێندەوە. کەمێکیش لە شەقامی کارل یۆهان پیاسەم کرد و لە ڕێگەی یەکەمەوە تا سەروو گۆڕستانی فۆرفێلسرن[2] هاتم و لەوێ لە سەر بەرزاییەکەی لای نوێژخانەی گۆڕستانەکە دانیشتم. بێدەنگییەک تەواو لە ئارادا بوو و شێی هەواش سست و بێتاقەتی دەکردم و بەدەم سەرخەوشکاندنەوە خەیاڵاتم

---

[1] Aftenposten: ڕۆژنامەی گرنگ و کۆنزەرڤاتیزمی نەرویجی، کە عەسران لە نەرویج بڵاو دەبێتەوە و بەناوبانگترین ڕۆژنامەی ئەو وڵاتەیە و ڕۆژانە سەدان هەزار دانەی لێ چاپ دەبێت. (و.ف)

[2] Var frelsers Gravlund: گۆڕستانێکی گەورە و ناودارە لە ناوەندی شاری ئۆسلۆ، کە گۆڕی نووسەرە گەورەکانی وەک ئەبسن و بیۆنسن لەوێن. (و.ف)

دەکرد... کات تێدەپەڕی. ئایا دەکرا بڕیاری ئەوە بدەم ئەو نووسینەم شاکارێکی بچووکی هونەرییە و لە جیهانی غەیبەوە وەک ئیلهامێک پێم بەخشراوە؟ ئایا هەندێ شوێنی نوقسان نییە؟ بە هەمموو ئەمانەشەوە دوور نییە قبوڵ نەکرێت؛ دوور نییە بەوپەڕی بێباکییەوە ڕەتی بکەنەوە، ڕەنگە شتێکی ئاسایی و لەڕاستیدا نووسینێکی خراپیش بێت، کەس چووزانێت ڕەنگە ئێستا فڕێ درابێتە سەبەتەی زبڵەوە؟ کەمکەم خۆشحاڵییەکەم بچوکتر دەبووەوە، بەم حاڵەشەوە بە یەک جووڵە هەستام و لە گۆڕستانەکە چوومە دەرەوە.

لە کۆڵانی **ئاکێر** لە پشت جامخانەی دووکانێکەوە سەیری سەعاتی سەر دیوارەکەم کرد، بینیم کەمێک لە نیوەڕۆ تێپەڕیوە: زیاتر نائومێد بووم چونکە دڵنیا بووم زۆر لایداوە لە نیوەڕۆ و بێگومان پێش سەعات چوار جەنابی سەرنووسەر نایەتە ئۆفیسی ڕۆژنامەکە، گریمانەی جۆراوجۆرم دادەنا، بەڵام نەمدەزانی چارەنووسی نووسینەکەم دەگاتە چی، لەمبارەوە زۆر بیرم دەکردەوە و زۆر کەم پێموابوو نووسینەکەم شتێکی باش و شایستەی لێ دەرچووبێت، چونکە لە کاتی نووسیندا گێژ و خەواڵوو بووم و لە دنیای وەهما پیاسەم دەکرد!

ئەگەر وابێت هەمموو ئەمرۆ لەبەر هیچ خۆم دڵخۆش کردبوو. بە هەنگاوی درێژ شەقامی **ئۆلوڤالم**[1] تێپەڕاند و لە گردی **سانتاهانسەوە**[2] بەرەو ناوچەیەکی بەتاڵ و فراوان ڕۆیشتم، لەوێشەوە بەرەو کۆڵانە باریکەکانی گوزەری **داربڕەکان** و بە ناوەڕاستی زەویی هەرێز و کێڵگەکاندا تێپەڕیم، دواجاریش پێم نایە جادەیەک کە سەرەتا و کۆتاییەکەی دیار نەبوو. لەوێ کەمێک وەستام

---

[1] Ullevaal: پەراوێزی شاری ئۆسلۆ کە ئەمڕۆ ئیدی بووەتە بەشێک لە ئۆسلۆی پایتەخت. (و.ف)

[2] St. Hans Haugen: بەرزاییەکی چڕ و سەوز و فراوانە، لە باکوری شاری ئۆسلۆ لای شەقامی ئۆلۆوال و مەیدانی سانتاس هانس. (و.ف)

و بڕیـارم دا لە کوێـوە هـاتووەم بگەڕێمەوە. ئەم ڕۆیشـتنە گەرمـی کردبوومەوە و لە کـاتی گەڕانەوە داهێزراو و شـەکەت بووبووم... لە ڕێگەدا دوو گالیسکەم بینی وێنجەیان بـارکردبوو و جوتیارەکانیش لە سـەر پشـت لە سـەر بـارەکە لێـی کەوتبـوون و گۆرانیـان دەوت، دەموچـاوی هەردووکیـان خڕ و سـەرڕووت بـوون و بێئاگا و بێبـاک پـاڵکەوتبوون، هەسـتم کـرد ڕەنـگە پرسـیارێکم لـێ بـکەن، تـانەیەکم تێبگرن و گاڵتەم پێ بکەن، کە گەیشتمە لایان یەکێیـان بـانگی کردم و پرسی:

- "ئەوە چییە لە ژێر باڵتا؟" دیسان پرسی "سەعات چەندە؟"
- "ڕێک نازانم، بەڵام پێموایە نزیک سێی دوانیوەڕۆیە."

هەردووکیـان دایـان لە قاقـای پێکەنـین و عارەبانەکەیـان بەرەو مـن ئاژوو. لەپڕ هەسـتم بە کزانەوەی گوێم کـرد بەهـۆی قـامچییەکەوە و کڵاوەکەم بەرز بوویەوە، ئەم نێرەکەرە بێشەرمانە خۆیان پێ ڕانەگیرا تێپەڕن و گاڵتەم پێ نەکەن.

بەتـوڕەییەوە دەسـتم بـۆ گـوێم بـرد، کـڵاوەکەم کە کەوتبـووە چاڵەئاوێکەوە هەڵگرت و ڕۆیشتم.

لای گردی **سانتایۆهان**، پیاوێکم بینی و وتی لە چواری عەسر لایداوە، سەیرە، سەعات چوار بوو، ئاوا زوو لە چوار لایدا بوو! هەنگاوەکـانم خێراتـر کـرد و هێـزم دایە بەرخـۆم زووتـر بـگەمە شـار و ئۆفیسـی ڕۆژنـامەکە. ڕەنـگە سەرنووسـەر پێشـتر هاتبێت و ئێسـتا ڕۆیشـتبێت. ناوبەنـاو ڕام دەکـرد، جاروبـار هەنگـاوی خێـرام هەڵـدەگرت و هاوسەنگیم تێکدەچوو و شانم بەر ئەسپوعارەبانەکان دەکەوت، هەوڵم دەدا لە ڕێبوارەکـان تێـپەڕم، پێشـبڕکێم لەگەڵ ئەسـپی عارەبانەکـان دەکـرد و چـیم پـێ بکـرایە دەمکـرد بـۆ ئەوەی زوو بـگەمە ئۆفیسـی ڕۆژنـامەکە. دواجـار کە گەیشـتمە ژێـر دەرگـای بینـاکە، خـۆم گرمـۆڵە کـرد و بە یەک هەنگـاو چـوار پێپلیکـانەم بـڕی و سـەرکەوتم و لە دەرگـام دا، وەڵام نەبـوو، ڕەنـگە سەرنووسـەر ڕۆیشـتبێتە دەرەوە،

بێگومـان ڕۆیشـتووە! بەڵام دەرگـاکە قوفـڵ نەکـراوە. هەوڵ دەدەم دەرگاکە بکەمەوە، جارێکی تر لە دەرگا دەدەم و دەڕۆمە ژوورەوە.
سەرنووسەر لە پشت مێزەکەیەوە دانیشتووە، ڕووی کردۆتە پەنجەرە و قەڵەم بەدەست ئامادەیە شتێک بنووسێت. بە هەناسەبڕکێوە سڵاو دەکەم و نیـوەی دەموچـاوی ڕوودەکـاتە مـن، سـاتێک دەڕوانێـت و سەرێک ڕادەوەشێنێت و دەڵێت:

- "هێشتا کاتم نەبووە نووسینەکەتان بخوێنمەوە."

لەوەی نووسینەکەی نەدڕاندووە و نەیخستۆتە ناو سەبەتەکەوە زۆر خۆشحاڵ بووم و لە وەڵامدا وتم:

- " هەڵبەت ئێوەش مافی خۆتانە، پێویست بەم پەلەپەلەش ناکات، ئیشەڵا تا چەند ڕۆژێکی تر و ڕەنگە...."

قسەکەی بڕیم.

- "سەیری دەکەم، جگە لەوەش ناونیشانی ماڵی ئێوەم لایە..."

لە بیرم چوو پێی بڵێم ئیتر من ناونیشانم نییە! هەرچۆنێک بێت گفتوگۆکەمان تەواو بوو و چەمیمەوە و هاتمە دەرەوە و ڕۆیشتم.
دیسان هیوایەک هاتەوە بە گیانما، هێشتا کار لە کار نەترازابوو و بەپێچەوانەشەوە هیوایەک مابوو. دیسان دەستم کردەوە بە خەیاڵات: ڕاوێژگەی باڵای دیوانی خوا ڕایان لە سەر ئەوە دابوو، کە بگەمە ئامانجەکەم، مەبەستی منیش هیچ نەبوو جگە لە گەیشتن بە پارە، واتە تەنیا دە کرۆنم بۆ نووسینەکەم دەویست....
خۆزگە لانیکەم شوێنێک هەبوایە ڕۆژی تیا بکەمەوە، باشە ئێستا بزانم کوێ ماوە بگەڕێم! بەڕادەیەک نوقمی ئەم بیرکردنەوەیەم ڕێک لە ناوەڕاستی شەقامەکە دەوەستم، لە بیرم دەچێت لە کوێم لە چەقی شەقامەکە وشک دەبم و ڕێکوڕاست جووڵە ناکەم، لە دارێک دەچم لە ناوەڕاستی دەریا چەقێنراوە و لە هەموو لایەکەوە شەپۆلەکان بەرەو ڕووی لای دێن. کوڕێکی ڕۆژنامەفرۆش ڕۆژنامەی **ویکینگ** دەخاتە بەرچاوم.

نای لەوە.... چاو دەکەمەوە و دەبینم ڕێک لە بەردەم دووکانی **سۆمب** وەستام و گیانم دەلەرزێت، دەترسم پاکەتەکەی ژێر باخەڵم ببینن، پاکەتەکە دەخەمە بەردەمم و دەگەڕێمەوە و ڕێگەکەم لار دەکەمەوە، دەترسم لە پشت جامخانەکەوە منیان بینیبێت و بە شەرمەزاری و دڵەڕاوکێوە بە خێرایی لە **کۆڵانی کلێساوە** دادەگەڕێم.

بە بەردەم چێشتخانەی **ئینگربێت**[1] و هۆڵی شانۆکەدا تێدەپەڕم و بەرەو بینای **لۆشن** پێچ دەکەمەوە، بە ئاڕاستەی دەریا ڕوو لە قەڵای سەربازی دەڕۆم. دواجار لە سووچێکی کورسییەک دادەنیشم و دیسان دەچمەوە نێو بیرکردنەوەوە، ئێستا چۆن پەناگەیەک بۆ شەو بدۆزمەوە؟ کولانەیەک هەیە شەو لێی بخەوم؟ غیرەتم نایەڵێت دیسان بگەڕێمەوە ژوورەکەی خۆم، چونکە نەمدەویست بێوەعدی بکەم و بە ڕەقەوە ئەم بیرۆکەیەم لە بیر کرد، تەنانەت لە دڵەوە و بە بزەیەک گاڵتەم بۆ ئەو کورسییە سوورە قۆڕە کرد.

لەناکاو لە خەیاڵمدا وێنای دەکەم لە ژوورە کۆنەکەم کە لەسەر گردی **هیگدەیە**، دانیشتووم و لەسەر مێزەکەم سینییەکی پڕ لە نانی مرەبایی دانراوە، لەپڕ سینییەکە شێوە دەگۆڕێت و نانەکانی شێوەی تر وەردەگرن، سفرەیەک دەبینم وەک بەفر سپی و خاوێن کە نانی تازەی زۆریان لە سەر هەڵچنیوە، لە سوچێکدا چەتاڵێکی زیوین بە پلێک گۆشتەوە، بەڵێ گۆشتی برژاو، دانراوە! لەناکاو دەرگای ژوورەکە دەکرێتەوە و خانمی خاوەنماڵ چایەکی ترم بۆ دەهێنێت.

ع خەونوخەیاڵێکی خۆشە! بە خۆم دەڵێم ئەگەر شتێکم خواردبێت دیسان ژانەسەر و تا و وڕێنەم تووش دەبێت، دیسان هەمان خەیاڵپلاویی بێمانا و بێسەروبەر دێتەوە بۆ گیانم، چونکە هەرسم بۆ نەدەکرا و گەدەم باش خواردنی وەرنەدەگرت، نەخۆشی و

---

[1] Ingrebet: یەکێک لە ریستورانتە کۆن و ناودارەکانی شاری ئۆسلۆ. (و.ف)

بێزارییەکی تایبەت لەم کاتانەدا بەردەبووە گیانم و ئەمەش تایبەت بوو بە مەزاجی من.

ڕەنگە ئەگەر شەویش دابێت بتوانم قوژبنێک بۆ خەوتن بدۆزمەوە، پەلەکردن باش نییە، ئەگەر شوێنێکیش نەبێت لە دارستان دەخەوم، هێشتا کاتی سەهۆڵبەندان نییە و قەراغ شاریان لێ نەسەندووم و دەکرێ بە جۆرێک ڕۆژ بکەمەوە.

لە دوورەوە دەریا بە ئارامی و ویقارێکی تایبەت، شەپۆلی دەدا و کەشتی و بەلەمەکان بە سینگی سافی خۆیانەوە ڕووکاری خۆڵەمێشی دەریاکەیان دەقڵشاند، لە هەردوو لاوە دوو هێڵی تەریب دەردەکەوت، دووکەڵیکی چڕ و پان لە دووکەڵکێشەکانەوە دەردەچوو، بە خولخواردن بە هەوادا بڵاو دەبووەوە، دەنگی خنکاوی ماتۆڕەکەیان لە هەوای شێداردا پێچی دەخوارد و دەنگی دەدایەوە، نە هەتاوێک و نە بایەک، لە پشتمەوە دارە تەڕەکان هەبوون. ماندوو بووم و سەرما ڕۆدەچووە ناو کەمەرمەوە، چەند ساتێک دواتر هەستم کرد پێڵوەکانم دەنیشن و چاوم داخست... لەپڕ هەستام و بینیم دەورم تاریک بووە و سەرم گێژ و لەشم سڕ بووە، پاکەتەکەم خستەوە ژێر باڵم و کەوتمە ڕێ، بۆ ئەوەی خۆم گەرم بکەمەوە هەنگاوی خێرام هەڵدەگرت، دەستەکانم لەناو یەکدا دەگووشی و قاچە سڕەکانم هەڵدەگلۆفی.

گەیشتمە وێستگەیەکی ئاگرکوژێنەوە. چەند سەعاتێک خەوتبووم و ئێستا نۆی شەو بوو، لەم کاتەدا لە خۆم دەپرسی ئەخیرەن چی بکەم و بەرەو کوێ بڕۆم؟ کە چاوی حەپەساوم بینای ئاگرکوژێنەوەی بینی بیرم لەوە کردەوە چۆنە هەر لێرە کەمین بگرم، لەگەڵ دیارنەمانی پاسەوانەکە، خۆم بخزێنمە یەکێک لە دالانەکانەوە؛ بەم خەیاڵەوە بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم تا سەری قسە لەگەڵ پاسەوانەکە بکەمەوە، بەڵام هەر منی بینی تەورەکەی دەستی هێنایە پێشەوە، هەڵبەت تیرێک و دوو نیشان بوو؛ بە ڕوالەت دەیویست ڕێزی

پێویست بنوێنێت و له ناوەوە خۆی مات دابوو بزانێت چیم دەوێت و دەڵێم چی، بە بینینی تەورەکە کە لێوارە تیژەکەی ڕووی لە من بوو، لەرزەیەک کەوتە گیـــانمەوە، وەک ئەوەی بەرکەوتـــنە ســـاردەکەیم چەشتبێت، لە بەرامبەر ئەم پیاوە چەکدارەدا زمانم لە ترسا گۆ ناکات و لەخـۆڕا دەکشـێمەوە دەکشـێمەوە، نـاوێرم دەم بـکەمەوە و هێـواش هێواش دێمە دواوە.

بـۆ ئەوەی حەیـام نەچێـت خـۆم وا دەردەخەم بـۆ شـتێک دەگەڕێـم، دەســت دەخەمە ســەر ناوچـاوم و دیـار نـامێنم. کە گەیشــتمە ســەر شۆســتەکە وەک ئەوەی لە مەترســییەکی گەورە دەربــاز بــووبم، بە خێرایـــی دوور دەکەومەوە و هەســـت دەکەم ڕزگـــارم بـــووە. ســەرمابردوو و برســی و دڵتەنـگ بـووم و لە شـەقامی **کـارل یۆهـان** پیاسەم دەکرد، دواتر بە دەنگی بەرز دەستم بە جنێودان کرد و باکم نەبوو کەسیک گوێی لە دەنگم بێت.

نزیـک **ئیســتەرتینگ**[1] ڕێـک لە بەردەم پەیـکەری شـێردا، زنجیـرەیەک بیرکردنەوەی تازە هاتە خەیاڵمەوە و لەناکاو کەوتمەوە بیری یەکێک لە ناسیاوەکان، کە نیگارکێش بوو. بەڵێ، لەبەر ئەم گەنجە نیگارکێشە لە **تیڤوولی** لەگەڵ جەماعەتێک تێکەوتبووم و نەمهێشـتبوو زللەی لـێ بدەن، دوای ئەوەش چەندین جار سەردانم کردبوو.

لەم کاتەدا پەنجەکانم گووشـی و چـوومە نێو کۆڵانی "تۆردنشلد".[2] لە بەردەم دەرگـایەک کە کـارتی ســەردانکردنی بەنـاوی "س. زاکاریـاس بارتێل"ـی لە ســەر بـوو وەســتام و لە دەرگـام دا. خاوەنمـاڵ دەرگـای کـردەوە، بـۆگەنی بیـرە و تـوتنی لـێ دەهـات و وای دەکـرد ڕقت لێـی بێتەوە.

کە بینیم وتم:

---

[1] Storting: پەرلەمانی نەرویج. (و.ف)

[2] Tordenskjod: ناوی یەکێک لە دەریاسالارە گەورەکانی نەرویج، کە هاوچەرخی ناپلیۆن بووە و لە جەنگی گەورە و گرنگی دەریاییدا بەشداری کردووە. (و.ف)

- "شەو باش!"
- "شەوباش! سەیرە! تۆی؟ بۆ وا دەرەنگ هاتی؟ سەیرکردنی کانڤاسی نیگارکێشان لە ڕووناکی چرای نەوتیدا خۆش نییە، لەو جارەوە کە هاتیتە ئێرە تا ئێستا یەک دنیا تابلۆم کێشاوە، هەڵبەت ئیشی بچووکیشم کردووە، بەڵام ئێستا هیچ سوودێکی نییە و دەبێ ڕۆژ بێتەوە."

هەرچەندە نەمدەزانی باسی کام تابلۆیە دەکات، بەڵام وتم با ببینم! وەلامی دایەوە:

- "بەڕاستی ناتوانێت، چونکە لەبەر ڕووناکیی چراکەدا هەموو شتێک زەرد دەردەکەوێت و جگە لەوەش شتێکی تریش هەیە..."

لەم کاتەدا نزیک کەوتەوە و بە گوێمدا چرپاندی:

- "ئەمشەو کچۆڵەیەکم لایە و خۆت دەزانی بە هیچ شێوەیەک ناکرێت."
- ئێستا کە وای لێهات دەی با لێی گەڕێین."

هەنگاوێکم بۆ دواوە نا و خواحافیزیم کرد و ڕۆیشتم. بەمجۆرە چار نەبوو جگە لەوەی بڕۆمە دارستان و شوێنێک بۆ مانەوە بدۆزمەوە. ئەگەر لانیکەم زەوییەکە ئەوەندە شێدار نەبوایە، دەکرا جۆرێک بەڕێی بکەم.

دەستێکم هێنا بە بەتانییەکەدا بۆ ئەوەی کەمکەم بە خەوتن لە دەرەوە ڕابێم، بەڕاستی بۆ دۆزینەوەی جێگایەک هەموو ئەو ڕۆژە ئەوەندە ئەملاولام کردبوو، گیانم دەرچووبوو و بێتاقەت و شەکەت بووبووم؛ بەڕاستی چ چێژێک لەوە زیاترە بە یەکجاری خۆم بدەمە دەست قەزاوقەدەر و بابەتەکە لە بیر بکەم، هیچ زۆر لە مێشکم نەکەم و هەر بەو جۆرە بە کۆڵان و شەقامەکاندا بسوڕێمەوە.

لە ڕێگەی هاتوو گەڕامەوە و بەرەو زانکۆ ڕۆیشتم. بەپێی سەعاتەکەی زانکۆ دەی شەو بوو، ڕێگەی شارم گرتەبەر، لە سەر بەرزایی هیگدە، لە بەردەم دووکانێکی وردەفرۆش قاچم سڕ بوو و وەستام، جۆرەها خواردن بە شێوەیەکی جوان لە پشت جامخانەکە

ڕیز کرابوون، نەدەکرا سەیریان نەکەم. پشیلەیەکیش لای نانێکی سپی خڕ پاڵکەوتبوو، لە پشتەوە دنیایەک چەوریی بەراز و چەند شوشەیەکی پڕ لە بروێش دەبینرا.

ماوەیەک سەیری ئەم سفرانەم کرد، بەڵام لەبەرئەوەی پارەم پێ نەبوو وازم هێنا و ڕۆیشتم.

زۆر لەسەرخۆ دەڕۆیشتم، بە وێستگەی **مایرستوین**دا[1] تێپەڕیم و دیسان هەر ڕۆیشتم و ڕۆیشتم، چەند سەعات ڕۆیشتم تا گەیشتمە بێشەی **بێگشاد**[2]. لای جادەکە کەمێک دانیشتم بۆ ئەوەی بحەوێمەوە و دواتر بۆ شوێنێکی گونجاو گەڕام، هەندێ زبڵ و لقەدارم کۆ کردەوە لە شوێنێکی لێژ و وشک جێخەوێکم بۆ خۆم خۆش کرد، پاکەتەکەم کردەوە و بەتانییەکەم دەرهێنا؛ ماندوو و شەکەت و بەهۆی ڕۆیشتنی زۆرەوە پشتم ئازاری هەبوو، ماوەیەک جوڵام و تەپاوتلم کرد تا بگەمە دۆخێکی ئاسوودە، گوێم کە بەهۆی قامچییەکەوە بریندار بووبوو ئاوسا بوو و ئازاری دەدام، نەمدەتوانی لە سەری بخەوم. پێڵاوەکانم داکەند و کاغەزی گەورەی پاکەتەکەم لێ پێچا و خستمە ژێر سەرم. داروبەرد بێدەنگ و هێمن و نوقمی تاریکی بوون، بەڵام لە بەرزاییەکانەوە دەنگی هەمیشەیی بوونەوەرەکان کە وەک چرپەیەکی دوور و یەکئاست هەرگیز نەدەکوژایەوە، بەرگوێ دەکەوت، ئەوەندە گوێم لەم چرپە ناکۆتا و ماتەمینە گرت تا کەمکەم ئاگام لە خۆم نەما. بەڵێ ئەم دەنگە دڵگیرە سروودی شەوانەی ئەستێرەکان بوو، نەغمەی پێکەوەیی تەنە ئاسمانییەکان بوو کە لە سەر سەرمەوە بە ئاسمانی بەریندا تێدەپەڕین... بۆ ئەوەی ترس لەخۆم دوور بخەمەوە، بە دەنگی بەرز پێدەکەنیم و دەموت: ڕەنگە ئەم دەنگە دوورە، پاڕانەوەی

---

[1] Majorstuen: لە گەڕەکە تازەکانی نەرویج کە ئەوکات بەشێک بوو لە پەراوێزی شار. (و.ف)

[2] Bogstad: بێشەلانێکی جوان و دڵگیرە، کە پێنج کیلۆمەتر لە ئۆسلۆوە دوورە و کۆشکێکی کۆن و مۆزەخانەیەکی بچووکیشی هەیە. (و.ف)

شــــەیتانە یــــان شــــیوەنی کونــــدەپەپووەکانە بێــــت، کە لە خەرابــــاتی کەنعــانەوە[1] دێت. هەســتامەوە و دیســان ڕاکشــام، پێڵاوەکــانم لە پێ کردەوە و کەوتمەڕێ، دیسان ڕاکشام و ترساو تا سپێدە تەقەلام بوو، دواتــر خەوم لــێکەوت. کە چــاوم کــردەوە ڕۆژ بووبــووەوە، گومــانم دەکرد نزیکی نیوەڕۆ بێت، پێلاوەکانم لە پێ کرد و بەتانییەکەم قەد کرد و بەرەو شــار کەوتمەڕێ، ئەمڕۆش دیســان کەوەڕۆژ بــوو و لە سەرمادا دەلەرزیم، قاچەکانم سست و بێگیان بوون، ئاو بە چاومدا دەهــاتە خــوارەوە، وەک ئەوەی بەرگەی ڕۆشــنایی ڕۆژ نەگــرن. ســێ ســەعات لە نیــوەڕۆ تێپەڕی بــوو، ئــازاری برســێتی تــاوی دەســەند، بەردەوام هێڵــنجم دەدا و ئێجگــار لاواز بووبــووم، بە دەم ڕێــگەوە ناوبەناو سەرم دەکرد بە کونێکدا و دەڕشامەوە، چوومە نــاو **ئوتێلی گشتی** و سەیری مینیۆی خواردنەکەم کرد، شانم لەتاو سوکێتی خۆم هەڵتەکانــد، وەک ئەوەی گۆشــتی ســارد و شــلەی بەراز بە خــواردن حســاب نەکەم. لەوێــوە بەرەو **مەیــدانی ئاســنەڕێ** ڕۆیشــتم، لەپــڕ سەرگێژەیەکی بێوێنەم تووش بوو، بێ ئەوەی گوێی بدەمێ بەردەوام بــووم لە ڕۆیشــتن، بەڵام زیــاتر تێک دەچــووم و ناچــار بــووم لە ســەر پلیکانەیەک دانیشــم. ڕۆحــم تەواو گــۆڕا بــوو، وەکئەوەی لە دەروون و بوونمــدا پەردەیەک لادەچــوو یــان ڕســتێک لە مێشــکمدا دەپچــڕا. چەنــد جارێــک هەناســـەی قــووڵم هەڵمــژی و تاســاو و واقوڕمــاو وشــک بووبووم، هۆش و حەواسم لە جێی خۆی بوو، چونکە سووکەئازاری گــوێم (شــوێنی بــرینەکەی دوێنــێ) بە باشــی هەســت پێــدەکرد، ئەو ناسیاوەشم ناسییەوە کە بەوێدا تێپەڕی و هەستام و سڵاوم لێکرد. ئەم بەڵا تــازە و ئەم ئــازارە نوێیە چی بوو کە لە ســەر بەڵاکانی تــرم کەڵەکە دەبوون؟ ئایا درێژەی بەســەرهاتەکەی دوێنێ شــەو و بەهــۆی خەوتــنەوە بــوو لە ســەر زەوی شــێدار، یــان ڕەنــگە لەبەر برســێتی و خاڵیبوونی گەدە بێت؟ هەر ئەم ژیــانەی مــن دەژیــم زۆر قــوڕ و بێمانــا

---

[1] Canaan

بوو، سوێند بە حەزرەتی مەسیح هەر بەڕاستی تێناگەم بۆچی ئەم ئـــازارە گەورەیە دەچێــژم. لەپــڕ لە کەلـــلەی دام کە لەمە زیـــاتر بیرکردنەوە ڕەوا نییە و دەبێ ئەمانەتداری بخەمە لاوە، ئەم بەتانییە کە هیی کەسێکی ترە ببەم و بیخەمە ڕەهنەوە، بەمجۆرە لانیکەم یەک کرۆنم دەست دەکەوێت و ئەمەش خۆی پارەی ژەمێکە و تا ئەوکاتەی ئیشێکم دەست دەکەوێت نایەڵێت بمرم، ئێستا عەیبی چییە دەست بدەمە بەتانییەکەی **هانس پۆلی**! زۆری نەمابوو بڕۆمە نێو دووکانی ســووخۆرەکە، بەڵام ڕێـم لە خـۆم گـرت و وەســتام، بە گومــانەوە ســەرێکم ڕاوەشــاند و پەشـیمان بـوومەوە، تـا دوورتـر دەکەوتـمەوە زیاتر خۆشحاڵ دەبووم کە چۆن خۆم نەدایە دەست ئەم وەسوەسـە شەیتانییەوە.

شانازیم بە دەستپاکی و پیاوچاکیی خۆمەوە کرد، ئەو هەستە خۆشـە لە دەروونمدا دروست بوو کە کەسایەتییەکی بەهێزم هەیە، بە خۆم دەوت لەم زەلکـاوە مـرۆییە و لە ســەروو ئەم گـلاوانەی کە ڕووی زەوییان داپۆشیوە، تۆ وەک چرایەکی درەوشاوەیت و تاریکییەکان بە نووری خۆت ڕۆشـن دەکەیتەوە، ئەمە پیاوەتییە بۆ ژەمەخـواردنێکی مـاڵی کەسـێکی تـر بـخەمە ڕەهــنەوە و بە پـارەی حەرام بخـۆم و بخۆمەوە و ڕابوێرم، لە دڵەوە خۆم بە هیچوپووچ بزانم و لە بەرامبەر ویژدانی خۆمدا سەرشۆڕ بم؟.... نـا، هەرگیز شتی واناکەم، تـا ئێستا بابەتەکەم ڕووکەش بینیوە و قووڵ بیرم لێ نەکردبووەوە، هیچ کەس بەرپرسـی وەسوەسـەی شـاراوە و ڕاگـوزەری خـۆی نییە، بەتـایبەت ئەوکاتەی مرۆڤ تووشی ئازارێکی قورس هاتبێت، بەتـانیی کەسێکی تـر مـاوەیەکی زۆر بە مانـدوویی لە کـۆڵ بنێـت و خـۆی نیوەگیـان کردبێت. چـاوەڕوانی شـتێکی وا لەم کەسـە ناکرێـت! دواجـار ڕێـگەی سەرفرازی و ڕزگاری هەمیشە کراوەیە، بۆ نمـوونە خـۆم لەو ڕۆژەوە داوای کـارم لەو بازرگـانەی گەڕەکـی گرۆنلانـد کردبـوو، لە خـۆڕا بووبووم بە مووی لـووتی؟ ئایا بەیانی و ئێوارە لەخۆڕا چووبوومە

سەر ماڵیان؟ ئایا تا ئێستا منی لە کۆڵ خۆی خستۆتەوە؟ نەخێر، تەنانەت بۆ نموونە جارێکیش بۆ وەرگرتنی وەڵامی نامەکەم سەردانم نەکردبوو، دەمبینی تەواو ئاگام لەم بابەتە نەماوە، هیچ پاساوێک نەبوو ئەگەر هەوڵی ئەمەم بدایە نەگەیشتایە ئەنجام! ڕەنگە ئەمجارە بەختم بڵێت ئەو ڕێگایانەی کە دەگەنەوە بە بەختەوەری و خۆشی، هەندێجاریش زۆر سەیر پڕ لە پێچوپەنا و هەورازونشێون. دوای ئەوەی ئەم بیرۆکەیە هاتە خەیاڵمەوە، بەرەو گەڕەکی **گرۆنلاند** ڕۆیشتم. ئەو زەبرە ڕۆحییەی پێشوو کەمێک بێتوانا و ماندووی کردبووم، بە کاوەخۆ دەڕۆیشتم و بیرم لەوە دەکردەوە چی بە بازرگانەکە بڵێم.

ڕەنگە هەر پیاوێکی بێوەی و چاک بێت و پێی خراپ نەبێت بێ ئەوەی داوا بکەم، خۆی کرۆنێک لە موچەکەم پێشوەخت بۆ تێچوونی ڕێگەکەم بدات. ئەم جۆرە خەڵکانە ڕەنگە هەستێکی بەرزیان هەبێت و بێگومان تاقەت و دەرفەتی بیرکردنەوە و تێرامانیان هەیە. ڕۆیشتمە ژێر تاقێک، بەتانییەکەم لە پشت سندووقێک، لە سووچێکی تاریک دانا و سەرئەژنۆی پانتۆڵەکەم بە تف تەڕ کرد تا کۆنبوونی دیار نەبێت. دواتر بە هەڵەداوان بە کۆڵانەکەدا تێپەڕیم و چوومە ناوەندە بازرگانییەکە، کە لەڕاستیدا دووکانێکی بچووک بوو، کەسێکم بینی کە ڕۆژنامەی کۆنی دەخستە عەلاگەوە و وتم:

- "دەمەوێ لەگەڵ بەڕێز **کریستی** قسە بکەم."

پیاوەکە لە وەڵامدا وتی:

- "فەرموو، **کریستی** خۆمم!"

لەمە باشتر چی! بۆم باس کرد کە ناوم فلان و فیسارە، ماوەی پێشوو بە نووسراو داوای کارم لێکردووە و ئێستا هاتووم بزانم داخوازییەکەم وەرگیراوە یان نا. ناوەکەمی چەند جارێک دووبارە کردەوە و دەستی کرد بە پێکەنین و ئەو کاغەزەی کە نووسیبووم لە گیرفانی دەرهێنا و وتی:

- "ئەمەیە، دەیبینن! داواتـان لێدەکەم خۆتـان سـەیر بکەن، بـزانن چەند سـەرتان لە ڕەقەم و حسـاب دەردەچێت، لەسـەر نامەکەتـان بەرواری ١٨٤٨تان نووسیوە!"

ئەمەی وت و لە نـاخی دڵەوە دەسـتی کـرد بە پێکەنـین. حەپەسـام و وتم:

- "بێگومـان ڕاسـتە کە بەهـۆی ڕۆیشـتنی داڵـغەوە هەڵەیەک ڕووی داوە، بەڵام ئەم هەڵەیە نووسـراوە و بـابەتێکی گرنـگ نیـیە، هەڵـبەت وایە بەڕاستی مایەی بێتاقەتییە."
- "چی بکەم، قبوڵ بفەرمـوون مـن پێویسـتم بە کەسێکە کە لە ژمـارەدا هەڵە نەکـات، هەڵـبەت زۆر بەداخەوەم دەسـتوخەتی ئێـوە ڕوون و جوانە و حەزیشم لە دێڕ و دەستەواژەی ناو نامەکەتان بوو بەڵام..."

مـاوەیەک وەسـتا، ڕەنگە هێشـتا هیوایەک مابێت، بەڵام بینیم دیسـان خەریکی کارەکەی خۆیەتی.

وتم:

"بەڵێ ئەو بابەتەی عەرزتان کردم جێگەی بێتـاقەتییە و دڵنیـام کـارێکی هەڵەش بـووە، بەڵام دڵنیـا بـن ئەمە دووبـارە نـابێتەوە، ئەم هەڵە بچووکەش نابێ مانای ئەوە بێت من توانـای بەڕێوەبەردنی نووسـینگە و زانیـاری پێویسـتم نیـیە، هەڵـبەت مەبەسـتم لەم قسـانە بە گشـتی ئەمەیە کە..."

قسەکەی بڕیم و وتی:

"منیش مەبەستێکی تـایبەتم نەبوو، بەڵام ئەم هەڵەیە ئەوەندە بەلامەوە گرنگ بوو، کە دەستبەجێ کەسێکی ترم دامەزراند."

"کەواتە ئیشـەکەتان داوەتە کەسـێکی تـر، بەڵـێ؟ ئاهــ خـوایە، خـوای گەورە! کەواتە ڕێگەچارەی تر شک نابەن؟"

"نەخێر و زۆریش بەداخەوەم..."

خواحافیزیم کرد و هاتمە دەرەوە.

ئاگری تورەیی لە هەناومدا بڵێسەی دەدا، بۆ هەڵگرتنەوەی پاکەتەکەم ڕۆیشتمە ژێر تاقەکە و ددانم جیڕ کردەوە، بە ئەنقەست شانم لەو ڕێبوارە داماوانەی سەر شۆستەکە دەدا و داوای لێبوردنیشم نەدەکرد، پیاوێک وەستا و لێم تورە بوو، منیش گەڕامەوە و وشەیەکم لە خۆمەوە بە گوێیدا چرپاند و بۆکسێکم کێشا بە ژێر لوتیدا و ڕۆیشتم. بەڕادەیەک پەست بووم کە جڵەوم پچڕاندبوو و ئاگام لێ نەبوو چی دەکەم، ئەو پیاوە پاسەوانەکەی بانگ کرد، زۆر حەزم دەکرد سەروگوێلاکی پاسەوانەکەش بشکێنم، هەنگاوەکانم خاو کردەوە تا پاسەوانەکە بگات... بەڵام نەهات!

دەمویست بزانم ئایا بەڕاستی ئەمە ویژدانە، ئەوپەڕی هەوڵ و تەقەلای من بگاتەوە بە هیچ؟ باشە بۆ نووسیبووم ساڵی ١٨٤٨؟ ئیشم چی بوو بەم ساڵە قوڕە؟

ئەوەندە برسیشم بوو کە ڕیخۆڵەکانم وەک مار لەیەک لوول بووبوون. ڕەنگە ویستی خوا ئەوە بێت تا کۆتایی شەو پاروونانێکم دەست نەکەوێت. بە تێپەڕینی کات زیاتر و زیاتر دەروونم دەژاکا و لەشولاریشم زیاتر دەپرتووکا و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە ڕێگەی پیاوباشی و چاکە لام دەدا، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەم بە ڕیز درۆم دەکرد، کریمالی داماوێکی دەستکورتم نەدەدا، تەنانەت کار گەیشتبووە ئەوەی بیرۆکەی خراپ و گڵاو دەهاتە خەیاڵمەوە، ناچار بووم بکەومە ململانێ لەگەڵیان. بۆ نموونەی بیرۆکەی خستنەڕەهنی بەتانییە ئەمانەتەکە و کەڵکەڵە و نییەتی خراپی تر کە ڕێگەخۆشکردن بۆیان تەنیا ئازاری ویژدانی بەدواوە بوو. داڕزان و تیاچوون لە دەروونمدا دەردەکەوت و وەک برینێکی ڕەش دەروونی دەخواردم. لەم کاتەشدا خوای بەخشندە لە سەر تەختەکەی خۆی، بە چاوی دەروون لێی دەڕوانیم و ئاگای لێ بوو چۆن هەنگاو بە هەنگاو قۆناغەکانی داوەشان و تیاچوونی من بە هەموو کەرەستە و ئامرازێک برەخسێنێت، وریاش بوو ڕێکخستنێک کە دەگاتەوە بە لادان و

چارەڕەشیم تێک نەچێت، بەڵام شەیتانی بەدکار تورە بوو، چونکە دەیبینی لە ئەنجامدانی گوناهی گەورە و نەبەخشراو کە خوای بەخشندە و میهرەبانی ناچار دەکرد بمخاتە دۆزەخ، خۆم بەدوور دەگرم... هەنگاوەکانم خێراتر کرد و بە خێراییەکی زۆر شڵەژاو و تورەوە، لای چەپی لەشم وەرسوڕاند و چوومە ژێر تاقی ڕووناک و پڕ نەخشونیگارەوە، لەگەڵ ئەوەی یەک چرکە زیاتر لەوێ نەمامەوە، بەڵام جوانکاریی بێوێنەی ناو تاقەکە لە یادما نەخشی بەست. لە کاتی سەرکەوتن بە پلیکانەکاندا، چاوم هەموو نەخشی جوان و بەردڕێژی سەر ئەرزەکە و گەچبڕینی سەر دیوارەکانی لە خۆیدا دەپاراست. هەرچۆنێک بێت کە گەیشتمە نهۆمی یەکەم، بە خێرایی زەنگی یەکێک لە ماڵەکان لێ دەدەم، بەڕاستی تێنەگەیشتم بۆچی زنگی ماڵێکم لێدا، کە زیاتر لە پلیکانەکەوە دوور بوو. ژنێکی گەنج بە کراسێکی خۆلەمێشی کە ئۆیەیەکی ڕەش لە سەر یەخەکەی بوو، دەرگاکەی کردەوە، ماوەیەک حەپەساو سەیری کردم و دواتر سەرێکی ڕاوەشاند و وتی:

- "خێر مامە گیان! ئەمڕۆ هیچمان نییە!"

دواتر خۆی وا دەرخست کە دەیەوێت دەرگاکە دابخات، بۆ گومانی خراپی لێکردم؟ بێ هیچ پێشەکی و قسەیەک وای زانی سواڵکەرم و دەست پان دەکەمەوە، بەڵام من تورە نەبووم کڵاوەکەم لە سەرم داگرت و وەک ئەوەی وشەیەک لە قسەکانیم نەبیستووە، بەوپەڕی ڕێزەوە وتم:

- "خانم تکایە ببورن وا توند زەنگم لێدا، تەمەننا دەکەم بمبەخشن، ڕاستییەکەی شوێنی زەنگەکەم باش نەدەزانی، بەپێی ئەوەی لە ڕۆژنامەدا نووسراوە، بەڕێزێکی نەخۆش لەم ماڵەدا هەیە و داوای کەسێک دەکات کە لە سەر عارەبانە بچووکەکەی شوێنگۆڕکێی پێ بکات."

ژنەکە کەمێک بیری کردەوە تا لەم درۆ شاخدارە تێبگات، وادیار بوو دوودڵە و لە سیمای منەوە ناتوانێ تێبگات مەسەلەکە چییە. دواجار وتی:

- "نەخێر بەڕێز، ئێمە لێرە نەخۆشمان نییە."

دیسان وتم:

- "فەرمووتان کەسی وا لێرە نییە؟ دیسان عەرزتان دەکەمەوە کە کەسێکی کەمتازۆر بەتەمەنە و دەیەوێت کەسێک دوو سەعات لە ڕۆژێکدا دابمەزرێنێت، بۆ هەر سەعاتێک چل ئۆرا دەدات."

دیسان گوێم لە نەخێر بوو و وتم:

- "کەواتە دیسان ببورن، ڕەنگە نهۆمی خوارەوە بێت و مەبەستیشم ئەوە بوو، کە کەسێکی متمانەپێکراوی خۆم بۆ ئەم کارە ڕاسپێرم، بەندە ناوم **ڤدیل یارلسبێرگە**."

نووشستامەوە و دوور کەوتمەوە. ژنە گەنجەکە تەنانەت سپێنەی چاویشی سوورهەڵگەڕا، وشک وەستابوو و دەستەوەستان دیار بوو، بەدەم ڕۆیشتنە خوارەوە لە پلیکانەکە بە چاو بەڕێی کردم.

کەفوکوڵی دەروونیم دادەمرکایەوە، مێشکم کراوە و ڕۆشن و هەستیشم باش بوو، قسەی ژنەکە کە وتبووی خێرە، هیچمان لە ماڵەوە نییە، وەک ئاوێکی سارد بوو کە ڕژاندبووی بە گیانما، یانی گەیشتوومەتە ئەوەی هەر کە منیان بینی لە خەیاڵی خۆیاندا دیارییان دەکردم و دەیانوت کابرا سواڵکەرە، لەو کەسانەیە کەسی دەستودڵ کراوە لە درزی دەرگاوە خێری پێ دەکەن. کە گەیشتمە کۆڵانی **دەرگاوانەکان** لە بەردەم میوانخانەیەک وەستاوم و بۆنی کەباب لە ناوەوە بەر لووتم کەوت، دەستم بەرەو دەسکی دەرگاکە ڕۆیشت و زۆری نەمابوو بڕۆمە ژوورەوە، بەڵام لە کاتی خۆیدا تێگەیشتم و

کشامەوە. کە گەیشتمە مەیدانی **بازاڕی گەورە**[1] ویستم شوێنێک بۆ دانیشتن بدۆزمەوە و کەمێک بحەوێمەوە، بۆ دەستکەوتنی شوێنێکی چۆڵ و هێمن بە دەوری کڵێساکەدا خولامەوە، بەڵام هەموو کورسییەکانی مەیدانەکە خەڵکی لە سەر دانیشتبوون، بە بێتاقەتییەوە بە خۆم وت بیچێژە! بیچێژە! دیسان تامەکەی بچێژە! ئەمە بەختوناوچاوی خۆتە! دیسان دەستم کردەوە بە پیاسە! ڕێگەکەم لار کردەوە و بەرەو فوارەکەی لای بازاڕی گۆشتفرۆشەکان ڕۆیشتم، چەند قومێک ئاوم خواردەوە و دیسانەوە کەوتمەڕێ. هەنگاو بە هەنگاو خۆم کێش دەکرد، بە بەردەم هەر دووکانێکدا دەڕۆیشتم ماوەیەک دەوەستام و سەیری هەموو ئەسپوعارەبانەیەکم دەکرد کە تێدەپەڕی. لاجانگم بە شێوەیەکی سەیر چڵی دەدا و لە بەشێکی کاسەی سەرمدا هەستم بە گەرمییەکی توند و ئاشکرا دەکرد. خواردنەوەی ئاوەکە تەواو پەرێشانحاڵی دەکردم و لەگەڵ هەڵگرتنی هەر هەنگاوێک دەیگەڕاندمەوە، بەم حاڵەوە گەیشتمە گۆڕستانی **مەسیح**[2]، سەرم خستە نێوان هەر دوو دەستمەوە، ئانیشکم تا ئەژنۆکانم هێنایە خوار و لە سەر زەوی دانیشتم، تەنیا بەمجۆرە لە سەر چیچکان باشتر دەبووم، گوێم لە دەنگی لرخەلرخی سینگم نەبوو. بەردتاشێک لە سەر سینگ ڕاکشابوو و سەرقاڵی هەڵکۆڵینی شتێک بوو لە سەر پارچە بەردێکی گرانیت، چاویلکەی شینی لە چاودا بوو، یەکێک لە ناسیاوە لەبیرکراوەکانمی بیردەهێنامەوە، کە کارمەندی بانک بوو، ماوەی پێشوو لە کافێی **ئیهلاندسک**دا بینیبووم.

---

[1] Stortovet: مەیدانی کۆن و گەورە لە باشووری ئۆسلۆ و نزیک شەقامی کارل یۆهان، کە زوو دوور نییە لە بەندەرگا و وێستگەی ئاسنەڕێ. بانکی سەرەکی نەرویج و کڵێسای ڤێرفرلسریش هەم لەم مەیدانەن. (و.ف)

[2] Christ Kirkwgard: قەبرستانێکی بچووک لە باشووری قەبرسانی بەناوبانگ ڤێرفرلسر و نزیک کتێبخانەی دایشمەن. (و.ف)

ئاخ چەند خۆش بوو وازم لەم شەرم و حەیایە بهێنایە، بڕۆشتمایە لای و باسی خۆمم بۆ بکردایە و بموتایە بەڕادەیەک لێم قەوماوە هەتا ناتوانم درێژە بە ژیان بدەم. بۆ نموونە دەکرا وەسڵەکانی هاوبەشیی سەرتاشخانەکەی پێ بدەم.... ئەی هاوار! کوا وەسڵەکان؟ ئەو وەسڵانەی نرخەکەیان نزیکەی کرۆنێک دەبێ کوان؟ بە تووڕەییەوە بۆ ئەم گەنجینە گرانبەهایە دەگەڕێم و لەبەرئەوەی نایدۆزمەوە بە یەک جووڵە لە سەر نووکەپێ دەوەستم و لە کاتێکدا لە ترسدا ئارەقەی سارد نیشتۆتە سەر گیانم، هەموو شوێنێک دەگەڕێم، دواجار لە بنی گیرفانی چاکەتەکەم لەگەڵ هەندێ کاغەزی سپی و ڕەشکراوەدا کە بەکەڵکی هیچ نایەن، دەیدۆزمەوە. ئەم شەش وەسڵە بە هەزار جۆر دەژمێرم و دیسانەوە دەیژمێرم، هەرچەند زۆر پێویستم پێیان نەبوو. تەنانەت ماوەیەک بوو حەزم دەکرد سەروڕیشم چاک نەکەم و بەمجۆرە ببمە خاوەنی حاشاهەڵنەگری پوولێکی نیوکرۆنی سپی و نازدار، لە زیوی پاکی **کۆنگسبێرگ**[1].

بەهەرحاڵ، سەعات شەشی پاشنیوەڕۆ بانک دادەخرا و دەمتوانی لە نێوان کاتژمێر حەوت و هەشت، لە بەردەم خوان کافێ ئیپلاندیسک، کەمین بگرم تا هاوڕێکەم دێتە دەرەوە. ماوەیەکی زۆر دڵم بەو بیرۆکەیە خۆش بوو و کات بەمجۆرە تێدەپەڕی. ڕەشەبایەک داربەڕووەکانی دەورووبەرمی دەشەکاندەوە و خۆر ئاوا دەبوو. ئایا پاساوێک هەبوو لە خۆمەوە لە بەردەم ئەم گەنجە کارمەندەی بانک قووت بمەوە و پێشنیاری کڕینی شەش وەسڵی سەرتاشخانەی بۆ بکەم؟ کێ چووزانێ خۆی دوو شەدە وەسڵی سەرتاشخانەی، لەوەی من خاوێنتر و جوانتر لە گیرفاندا نەبێت؟ گیرفانەکانم ژێراوژوور کرد، لانیکەم شتێکی تر بدۆزمەوە و هاوپێچی وەسڵەکانی بکەم. عەیبی چی

[1] Kongsberg: یەکێک لە شارە کۆنەکانی نەرویج، کە ٨٢ کیلۆمەتر لە باشووری خۆرئاوای ئۆسلۆ دوورە، کە کانگە زیوەکانی بەناوبانگە و شوێنی پارە و سکەسازی پاشایەتی نەرویج بووە. (و.ف)

بوو ئەگەر کراڤاتێکی پێ بدەم؟ تەنانەت دەمتوانی ئەوەی خۆم لە مل دەربێنم و پێی بدەم، هەڵبەت ئەوکات دەبوو قۆپچەکانی سەرەوەی چاکەتەکەشم هەڵپێکم، ناچاربووم وا بکەم، چونکە ئیتر هێلەکیشم لە بەردا نەبوو.

بەهەرحاڵ، هەرچۆنێک بێت کراڤاتەکەم کردەوە (کراڤاتی چی، پارچەقوماشێکی پان و کاڵەوەبوو، کە نیوەی سەرسینگی دادەپۆشیم!) تەپوتۆزەکەیم تەکاند و سافورێکم کرد، لەگەڵ وەسڵەکانی سەرتاشخانە لە کاغەزێکی سپییەوەم پێچا. ئێستا لە گۆڕستان دەرچووم و بەرەو کافێی ئیپلاندیسک دەڕۆم. سەعاتی زیندان، سەعات حەوتی پاشنیوەڕۆ دەردەخات. کەمێک دەوروخولی کافێکە دەدەم، لە بەردەم سیاجە ئاسنەکەدا لەملاوە بۆ ئەولا پیاسە دەکەم و هاوکات بە چوارچاوی زۆر زیت و وریا، ئاگام لە هاتوچۆی کەسەکانە. دواجار نزیک سەعات حەوت گەنجەکە دەبینم، کە پۆشتەوپەرداخ و کەشخە بە کۆلانەکەدا ڕووەو سەرەوە دێت، بەرەو کافێکە دەڕوات. بە بینینی دڵم وەک مەلێکی ناو قەفەز لە ژێر سینگمدا کەوتە پەلەپەل، ڕێکوڕەوان بێ ئەوەی سڵاوی لێ بکەم لە بەردەمیدا قوت بوومەوە و وتم:

"کۆنە برادەر، نیوکرۆنێکت هەیە پێم بدەی؟"

بەوپەڕی سەرشۆڕییەوە پاکەتە بچووکەکەم دایە دەستی و وتیشم:

"هەڵبەت لە بەرامبەر ئەم هەموو وەسڵە گرنگەدا!"

وەڵامی دایەوە:

"نیمە و خوا دەزانێت ئەوەندە پارەم پێ نییە"

یەکسەر جزدانی پارەکەی لە بەردەم مندا هەڵڕشت و دواتریش ڕوونی کردەوە:

"دوێشەو ڕۆشتم بۆ ڕابواردن و دەبینی هیچیان پێ نەهێشتم، باوەڕ بکە تەنانەت نیوکرۆن پارەم پێ نییە."

پێویستی بەم کارانە نەدەکرد، ئەوەش دەبێ."

باوەڕم بە قسەکانی کرد، چونکە پێویستی نەدەکرد بۆ پارەیەکی وا کەم سوێندی درۆ بخوات، بەدەم خاڵیکردنەوە و ژێراوژوورکردنی گیرفانەکانیشی فرمێسکی چاوە شینەکانی تەڕ کردبوو، بەهەرحاڵ دوای ئەوەی لێی جیابوومەوە وتم:

- "هەڵبەت ببورە بۆ ئەو ڕەفتارەم، چونکە وەزعم زۆر خراپە!"

هێشتا چەند هەنگاوێک بە کۆڵانەکەدا نەڕۆیشتبووم، ئاماژەیەکی بۆ پاکەتەکەی دەستی کرد و بانگی کردم، منیش بەدەم ڕۆیشتنەوە وتم:

- "ئەو پاکەتە لە دڵەوە پێشکەش بە تۆ بێت، با لات بێت، شتێکی گرنگ نییە، دیارییەکی بچکۆلەیە و چیم هەیە لەم دنیایە هەر ئەوەیە."

لە تاریکوڕوونی ئەو ئێوارەیەدا بە ڕادەیەک ئاوازی دەنگم خەمگین بوو، کە لە کاتی ئەم قسانەدا بەزەییم بە خۆمدا هاتەوە و دەستم کرد بە گریان. شنە بایەک هەڵی کردبوو و هەوای فێنک دەکردەوە، هەورە ڕەشەکان لە سەر تەختی ئاسمان دەجولان و تا شەو زیاتر تێپەڕییایە هەوا ساردتر دەبوو، بەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە و هەموو ئەو ڕێگەیە فرمێسکم هەڵدەڕشت و بەردەوام ورتەم دەهات؛ بۆ نموونە دەمناڵاند خوایە، ئەی پەروردگار، چ ڕۆژێکی ڕەشم هەیە، خوای گەورە خۆت دەزانی چەند ڕیسوا و قوڕبەسەرم! هەر کە چاوم وشک دەبووەوە دووبارەکردنەوەی ئەم دێڕە دیسان چاوی پڕ دەکردمەوە لە فرمێسک. سەعاتێک، سەعاتێک کە دەتوت بڕانەوەی نییە، زۆر بە خاوی تێدەپەڕی. ماوەیەک بە کۆڵانی **بازاڕ** بەرەڵا دەسووڕامەوە، لە بەردەم سەکۆی بەرماڵان دادەنیشتم و هەر کەسێکم دەبینی خۆم لە پەنایەکدا دەشاردەوە، لەخۆڕا لە بەردەم دووکانە ڕووناکەکان کە پڕ بوون لە خەڵکی و لە سەر پارە و شمەک چەلەحانێیان دەکرد، دەوەستام و چاودێرییم دەکردن. دواجار نێوان **کڵێسا** و **عەمباری گۆشت** لە پشت هەندێ پارچە تەختەی کەڵەکەکراو شوێنێکم دۆزییەوە کە تاڕادەیەک گەرم بوو.

چی دەبێ با ببێت! نەخێر، ئەمشەو ئیتر ناڕۆمە ناو دارستان، لەوێوە تا دارستانەکە ڕێگەیەکی درێژ بوو و منیش لە پێ کەوتبووم، دەمویست ئەو شەوە بە جۆرێک هەر لەوێ بمێنمەوە و ڕۆژ بکەمەوە، گریمان ساردیش بوایە، کەمێک لە دەوروبەری کڵێساکە پیاسەم دەکرد و گەرم دەبوومەوە. دەبێ بە جۆرێک حەلوفەسڵی بکەم! پاڵم بە پارچە تەختەکانەوە دا و بێهۆش کەوتم.

کەمەکەم دەنگەدەنگی دەوروبەر کەم دەبووەوە، دووکانەکان دادەخران، دەنگی پێی ڕێبوارەکان کەمتر بەرگوێ دەکەوت، هێواش هێواش چراکان دەکوژانەوە و پەنجەرەی مالانیش تاریک دەبوو...

لەپڕ چاوم کردەوە و لە بەرچاوم تارماییەکم بینی، بە قۆپچەکانی کە لە تاریکیی شەودا دەبریسکایەوە، هەستم کرد پاسەوانێکی گەڕۆکە، تارماییەک کە نەمدەتوانی دەموچاوی ببینم.

"شەوباش"

منیش لە وەلامدا شەوباشم لێکرد و یەکسەر تاسام، بە ترسەوە هەستام، تارماییەکە نەجولا و لێی پرسیم:

"ماڵتان لە کوێیە؟"

بێ بیرکردنەوە و وەک عادەتی هەمیشەیی ناونیشانی ژوورەبچووکەکەی پێشووم وت، ئەو دیسان ماوەیەک بێدەنگ و مت مایەوە و دواتر بە شڵەژانەوە وتم:

"مەگەر شتێکی خراپم کردووە؟"

"بە هیچ شێوەیەک! بەلام ئێرە بۆ خەوتن زۆر ساردە و دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە."

"بەڵێ ڕاستە هەوا فێنکە."

یەکسەر خواحافیزیم کرد و لەخۆمەوە بەرەو ماڵە کۆنەکەم ڕۆیشتم، ئەگەر بە دزییەوە هەنگاو بنێم و کەس نەمبینێت بە ئاسانی دەتوانم بڕۆمە سەرەوە، بە هەشت هەنگاو بە باشی بە پلیکانەکاندا

سەردەکەوتم، تەنیا دوو پێپلیکانەی کۆتایی جیڕەجیڕی دەکرد، کە گەیشتمە بەردەم ژوورەکە پێڵاوەکانم داکەند، هەموو شوێنێک بێدەنگ و هێمن بوو و کەس ئاگای لە هیچ نەبوو، کە گەیشتمە نهۆمی یەکەم دەنگی چرکەچرکی هێمنی سەعاتی دیوارەکەم بیست، دەنگی زریکەی گریانی منالێکیش دەهات و جگە لەمە دەنگێکی تر لە گۆڕێ نەبوو.
دواجار دەرگای ژوورەکەم دۆزییەوە، دوای ئەوەی کەمێک پاژنەپێم لە پێڵاوەکانم دەرکرد، وەک جاران قوفڵەکم کردەوە، ڕۆیشتمە ژوورە و بێدەنگ دەرگاکەم قەپات کرد، ژوورەکە وەک کاتی ڕۆیشتنم مابوو، پەردەکانی پشت پەنجەرەکە بەرەو لایەک لادرابوون، چرپاکە خالی بوو، کاغەزێک لە سەر مێزەکە لەولاتر بەرچاو دەکەوت، ڕەنگە هەر ئەو نووسینە بێت کە خۆم بۆ خاوەنماڵەکەم نووسی، دیارە لەو کاتەوە نەهاتۆتە سەرەوە، کوێرە کوێر دەستم بۆ ئەم شتە سپییە شەفافە برد و بەوپەری حەسرتەوە بینیم نامەیە؛ ئەم نامەیە لە کوێوە هاتووە؟ هەڵی دەگرم و بەرەو پەنجەرەکە دێم و تا ئەو شوێنەی بکرێت لە تاریکیدا پیتە بەدقەوارە و ناشیرینیەکانی دەخوێنمەوە، دواجار دەتوانم ناوی خۆم بناسمەوە.
بیر دەکەمەوە ئەها! ڕەنگە وەڵامی خاوەنماڵەکە بێت، ڕەنگە ئەمجارە لە ترسی ئەوەی دیسان بگەڕێمەوە تەواو گەڕانەوەمی بۆ ماڵەکەی قەدەغە کردووە.
دواتر هێمن و گوێقوڵاخ، بەتانی لە ژێر باخەڵدا، لە دەستێکدا کاغەز و لە دەستێکی تردا پێڵاوەکانم هەڵگرتووە، لە ژوورەکە دێمە دەرەوە، ددانم جیڕ کردۆتەوە و نەرم و هێواش دێمە خوارەوە، نەوەک پلیکانەکان دەنگیان لێوە بێت و دواجاریش بە زەحمەتێکی زۆر و برینی لەمپەری زۆری نهۆمەکانی خوارەوە دێمە خوارەوە، خۆم دەگەیەنمە بەر دەرگا.
پێڵاوەکانم دەخەمە سەر ئەرزەکە و بە کاوەخۆ قەیتانەکانی دەبەستم و دواتریش بێ ئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە، هەروا دادەنیشم و چاوم

مـات دەکەم و مـاوەیەک بێـدەنگ و مـتەق لێبـڕاو لەوێ دەمێـنمەوە. هەڵدەستم و دەکەمە ڕێ؛ بڵێسـەی لەرزۆکی چرا گازەکە، سـەرەوەی کۆلانەکە ڕووناک دەکاتەوە. ڕێکوقنج لە ژێر ڕووناکییەکەدا دەوەستم و پـــاکەتەکە دەکەمەوە، ئەم جـــوولانە زۆر بە هێواشـــی دەکەم، ڕووناکییەکی زۆر لە مێشکمدا دەدرەوشێتەوە و خۆشییەک دەڕژێتە دەروونمەوە، لە خۆمەوە هاوارێکی کورت دەکەم، ئەم هـاوارە ئاوازی پووچییە، کە لەتاو خۆشی لە گەروومەوە دێتە دەر، بەڵێ، نامەکە هی سەرنووسـەری ڕۆژنـامەکەیە، وتـارەکەم قبـوڵ کـراوە و وەک خـۆی چـاپ دەکرێـت. "چەنـد دەسـتکارییەکی بچـووک... چـاککردنی چەنـد هەڵەیەکـی دەسـتنووس... نیشـانەی توانـایەکی گەورە... سـبەی چـاپ دەبێت... دە کرۆن پاداشتەکەیەتی." ئەوەی سەرنجمی ڕاکێشا هەر ئەم دێڕانە بوو.

پێـدەکەنیم و دەشـگریام، ڕاکەڕاک تـا سـەر کـۆلانەکە ڕۆیشـتم و وەسـتام، دەمکێشـا بە پشـتی خۆمـدا، لەخـۆڕا و بـێ ویسـت هـاواری خۆشیم دەکرد. کـات وەک بـا دەڕۆیشـت، بە درێژایـی ئەو شـەوە تـا ناوەڕاستی ڕۆژ لە خۆشیدا مەست و سـەرخۆش بووم، شێتانە بەنـاو کـوچە و بـازاڕدا دەگەڕام و بە خـۆم دەوت: بەڵـێ! توانـای گەورە... بلیمەتی... لە ئاستی خۆیدا شاکار... دە کرۆن پاداشت!

چەنـد هەفـتەیەک دوای ئەو ڕووداوە، دیسـان شـەوێک لە دەرەوە سەرگەردان بووم، دیسان ڕۆیشتمە گۆڕستانێک بۆ ئەوەی وتارێک بۆ ڕۆژنـامە بنووسـم، لەم کەینـوبەینەدا سـەعات دەی شـەو بـوو و دەیانویسـت دەروازەی گۆڕسـتانەکان دابـخەن، برسـیم بـوو، زۆر برسیم بوو، بەداخەوە دە کرۆن زۆر بڕی نەکرد.

دووسێ ڕۆژ بوو هیچم نەخواردبوو، هەر کە قەڵەمەکەم بە دەستەوە دەگرت ماندوو دەبووم و هەستم بە لاوازی دەکرد، پوولێکی قەڵبیشم پێ نەبوو، لە گیرفانمدا جگە لە چەند کلیلێک و لەتە قەڵەمدایەنێک[1] هیچی تیا نەبوو. کاتێک دەروازەی گۆڕستانەکەیان داخست، چار نەبوو جگە لەوەی ڕێک بەرەو ماڵەوە بگەڕێمەوە، بەڵام دیسان ماوەیەک بێ ئامانج و بێ هۆ بەمـلاولادا سووڕامەوە. ژوورەکەم بەڕادەیەک تاریک و چۆڵ بوو کە لە ناویدا دەترسام، جاران تەنەکەچییەک لەم ژوورەدا کاری دەکرد، بەڵام ئێستا کە ڕۆیشتووە من بە کرێ و بە شێوەی کاتی تیایدا دەژیم. بەهەرحاڵ بۆ کاتکوشتن بەمـلاولادا گەڕام، بە بەردەم زینداندا تێپەڕیم و دواتر هاتمە لای دەریا و گەیشتمە لای ئاسنەڕێ، لەوێ لە سەر کورسییەک دانیشتم،

---

[1] مەبەست ئەو پارچە تیغەیە کە نووکی قەڵەمەکەی پێ تیژکردۆتەوە، نەک قەڵەمدایەن بەوشێوەیەی کە ئەمڕۆ هەیە. (و.ک)

ئەوکات هیچ خەمێکم نەبوو، تەماشای بەندەر لە تاریکیی هێمن و دڵگیری شەودا حاڵەتێکی دڵخۆش و کەیفسازی پێ دەبەخشیم و بەدبەختییەکانی لە بیر دەبردمەوە.

ئەڤڵی سەقەتم دەیوت پارچەیەک کە نووسیومە لە باشترین شتەکانە، کە تا ئێستا خستوومەتە سەر کاغەز، ویستم بە خوێندنەوەی خۆم دڵخۆش بکەم، نووسینەکەم لە گیرفان دەرهێنا و بۆ ئەوەی باش ببینم لە چاوم نزیکم خستەوە و لاپەڕە لاپەڕە پیایدا چوومەوە، تاقەتم نەما و دیسان خستمەوە گیرفانم. داروبەرد هێمن بوو، دەریا وەک سەدەفێکی ڕەنگشین لە بەرچاوم پان دەبووەوە و باڵندە بچووک و بێدەنگەکان بەملاولادا دەفڕین. کەمێک لەولاتر پاسەوانێک لە جێگەکەی خۆی پیاسەی دەکرد، جگە لە ئەو کەسی لێ نەبوو و بەندەرگاکە نغرۆی بێدەنگی بوو. سەرلەنوێ سامانەکم ئەژمار دەکەمەوە: لەتە قەڵەمدایەنێک، چەند کلیلێک، بەبێ یەک فلس پارە!

لەناکاو گیرفانم دەگەڕێم و دیسان نووسینەکەم دەردەهێنم، بەلام ئەم کارەم خۆڕسکە و بۆم بووەتە خوو، بۆ کاغەزێکی سپی جوان و دەستبۆنەبراو دەگەڕێم، دەست بۆ گیرفانم دەبەم، بەلام لەگەڵ ئەوەی دەمەوێ کاغەزێکی سپیی دەستبۆنەبراو بدۆزمەوە، دیسان بێ ویستی خۆم نووسینەکە دەردەهێنم، چونکە بۆم بووەتە عادەت، دواتر نازانم و تێناگەم بۆچی ئەم کاغەزە وەک شەیپوریک لوول دەکەم، بە جۆرێک لوولی دەکەم کە ناوبۆش نەبێت و بە خێرایی بۆ سەر شۆستەی شەقامەکە هەڵی دەدەم، با دەیبات و کەمێک دوورتر دەگیرسێتەوە. برسێتی زۆری بۆ مێشکم هێناوە، سەیری شەیپورە کاغەزییەکەم دەکرد و خۆم بەو بیرکردنەوەیە دەخڵەفاند و باوەڕم بە خۆم دەهێنا کە لە ناو ئەم کاغەزەدا ڕەنگە شتێک هەبێت؛ بۆ نموونە پڕ بێت لە پوول و پارەی بریقەدار، بە دەنگی بەرز گرەو لەگەڵ خۆم دەکەم، ئەگەر وتت چی تێدایە هەمووی بۆ خۆت! پاکەتێک پڕ لە پارە دێتە خەیاڵمەوە کە لە سەرەوە پوولی درشتی گرنجگرنج و لە

ژێرەوەش وردەی تێدایە، بە چاوی واقوڕماوەوە سەیرم دەکرد و خۆم وەسوەسە دەکرد؛ هەڵسە و بیدزە؟

لەم کاتەدا گوێم لە دەنگی کۆکەی پاسەوانەکەیە، حەزم کرد لاسایی بکەمەوە. هەستام و دووسێ جار یەک لەدوای یەک بە جۆرێک گوێی لێ بێت، کۆکیم. ڕەنگە ئەوکاتەی شەیپوورە کاغەزییەکە نزیکی کەوتەوە خۆی بۆ هەڵبدات، زۆر چێژم لەم گاڵتەیەی خۆم وەردەگرت، لەتاو دڵخۆشی دەستەکانم لەیەک دەخشاند و ناوبەناو بە دەنگی بەرز جنێوم دەدا، هەر ئێستا کابرا دەکەوێتە پاقلەکەوە! داماوی قوڕبەسەر بە جۆرێک شەیتان سەری لێ شێواندووە، ئامادەیە بۆ ئەو پارچە کاغەزە بڕواتە بنی دۆزەخەوە، مل بۆ هەر سزا و ئازارێک بدات، لە برسێتییا مەنگ بووم، سڕ و سەرخۆش بووم.

چەند خولەکێک دواتر پاسەوان گەڕایەوە، کە دەڕۆیشت بە ئەنقەسەت بزماری بنی پێڵاوەکانی بە بەردڕێژی شەقامەکەدا دەکێشا و دەنگی لێ هەڵدەساند و سەیری دەوروبەری دەکرد. شەیپورە کاغەزییەکەی نەبینی... بەڵام پەلەی ناوێت، هێشتا کات ماوە. ئەو بە درێژایی شەو لێرەیە و کاتی زۆری لە بەردەستە، لانیکەم تا بە لای کاغەزەکەدا نەڕوات نایبینێت، بەڵام لەم کاتەدا بە وردەهەنگاو لێی نزیک دەبێتەوە و کاغەزەکە سەرنجی دەبات و دەوەستێت، ئای چەند پاکەتێکی سپی جوانە! پیایدا دیارە گرانبەهایە! چەند چاک لە سەر شەقامەکە کەوتووە، نەکا پارە بێت؟ ها، دوور نییە پڕ لە سکەوپوولی زیو بێت! دەست دەبات و هەڵی دەگرێت، ئای لەوە خۆ زۆر سووکە، کێشی نییە، ڕەنگە پەڕێکی لە ناودا بێت، لەو پەڕانەی جوانکاریی کڵاوی ژنانە! دواتر پاسەوان بە دەستوپەنجەی ئەستووری خۆیەوە و بەوپەڕی وریاییەوە، شەیپورە کاغەزییەکە دەکاتەوە و یەکێک لە چاوەکانی دەبڕێتە ناوی.

من دەستم گرتووە بە قوڵمەوە و شێتانە پێدەکەنم و قاقام لێ دەدا، زۆر سەیر پێدەکەنیم، چونکە بچووکترین دەنگ لە گەروومە نەدەهات،

بەڵکو پێکەنینێکی بێدەنگ و پڕ ئازار بوو، وەک ئەوەی ئاهێکی پڕسوێ بێت کە لە سینەمەوە دێتە دەر، یان قوڵپی گریانێک.

دیسان دەنگی پێڵاوەکان کە بەر بەردرێژی شەقامەکە دەکەوت، بەرز بووەوە، دیسان پاسەوانەکەیە و لە قەراخ ئاوەکەدا دەگەڕێت، لەتاو پێکەنین تووشی نزگەرەیەک بووبووم هەناسەم بۆ نەدەدرا، چاوم پڕ بوو لە ئاو، ئەوەندەم پێخۆش بوو ئاگام لە خۆم نەمابوو، ئەوسا بە دەنگی بەرز دەستم کرد بە قسەکردن، چیرۆکی شەیپورە کاغەزییەکەم بۆ خۆم دەگێڕایەوە و چاوم لە لەپی دەستم نزیک کردەوە، کەوتمە لاسایکردنەوەی پاسەوانە داماوەکە، بەردەوام دەموت: هەر کە کاغەزەکەی دوورخستەوە کۆکی، لە کاتی فڕێدانیدا کۆکی، ئەم دێڕەم زیاتر دەخەملاند و ترشوخوێنم پێوە دەکرد، دیسان دەمگۆڕی و بەمجۆرەم لێ دەکرد: یەکەمجار ئاوا کۆکی ئحم ئحم!

بەکورتی گۆڕانکاری جۆراوجۆرم بەم دێڕانە دەکرد و بە دەنگی بەرز دەموتەوە، کە هاتمەوە سەرخۆم و دڵخۆشییەکەم کۆتایی هات، بینیم ماوەیەکی زۆر لە شەو تێپەڕیوە، سستییەکی سەیر سەر تا پێی گرتم، جۆرێک ماندوویێتی خۆش کە خۆم بە تەواوی دەدایە دەستی. لێڵی هەوا ڕووی لە ڕەشی دا و شنەیەکی نەرم هەڵی کردبوو و ئاستی سەدەفئاسای دەریاکەی ڕێڕێ دەکرد. لە دوورەوە دووکەڵکێش و پەیکەری ڕەشی کەشتییەکان دیار بوون، وەک ئەوەی تارمایی بێدەنگ و ترسناک بن، کە بە قژی لوول و بەرەو سەرەوە دەیانەوێ بمکوژن، ئیتر هەستم بە ئازار نەدەکرد، برسێتی ئازاری کەم دەکردمەوە، هەستم دەکرد سووکەڵە و خاڵیم و چێژم وەردەگرت، هیچ بەم دنیایەوە نەیدەبەستمەوە، دڵم خۆش بوو لە بەرچاو نیم و کەس نامبینێت. قاچەکانم لە سەر کورسییەکە درێژ کرد و پاڵم دەدایەوە، چونکە بەمجۆرە باشتر دەمتوانی تەنها و ئیسراحەت بم، لە خەیاڵمدا ئاسەواری بێزاری نەبوو، تۆزقاڵێک شڵەژان و نیگەرانی لە هەموو ڕۆحمدا بوونی نەبوو، تا دوورتر بیرم دەکردوە بچووکترین

خەون و خەیاڵی بەدینەهاتووم نەبوو، بە چاوی کراوەوە ڕاکشابووم و لە دنیایەکی تایبەتدا نوقم بووبووم، بە جۆرێک ئاگام لە بوونی خۆیشم نەمابوو، زۆر دوور لەم دنیایە خۆم دەبینی و چێژێکی بێسنوورم لەمە دەبرد، لە هەموو ئەم ماوەیەدا بچووکترین دەنگ جارزم بکات، بەرگوێم نەکەوت. تاریکی وەک پەردەیەکی ڕەش جیهانی لە بەرچاوم دەشاردەوە و لە ئارامییەکی ساف و نەبڕاوەدا نوقمی دەکردم، لەم کاتەدا تەنیا نەوای نەرم و یەکئاستی بێدەنگی، بێدەنگییەکی بەتاڵ و فراوان، دەگەیشتە پەردەی گوێم و خامۆش دەبوو، بەڵێ، لە دڵی شەودا، تارمایی ڕەشپۆشەکان کە لە سەر دەریای بەرامبەرمدان، دەمخەنە چنگی خۆیانەوە و بە سەر زەریادا دمفڕێنن و دەمبەنە شوێنێکی دوور و سەرزەمینێکی سەیر و خاڵی لە مرۆڤ.

لە کۆشکی شازادەخانمی ئیلایالی دام دەگرن و لەوێ شکۆ و گەورەییەکی هێند گەورە دەبینم، کە چاوی هیچ ئادەمییەک نەیبینیوە، هەر کە چاوم بە مەحبووبە و دولبەرەکەم کەوت، کە لە ژوورێک لە یاقووتی بنەوش لە سەر جێخەوێک لە گوڵی زەرد ڕاکشاوە، دەستی بەرەو لای من دەهێنێت و من لە بەردەمیدا بە چۆکدا دێم، بانگم دەکات بەرەو خۆی و دەڵێت: ئەی پیاوی ئازاد و دلێر! بەخێر هاتنت دەکەم بۆ ئەم مەملەکەتە و سەراکەمت بە هاتنت ڕازاندۆتەوە، دەزانی بیست هاوین چاو لەڕێت بووم و لە مانگەشەواندا دڵم خواستوویتی؟ کە خەمگین دەبووی لەم ژوورەدا فرمێسک نەما نەیڕژم، کە خەوتبووی خەونی خۆش نەما ڕەوانەتی نەکەم. دولبەری مانگپەیکەر دەستم دەگرێت بە ناو تەلارە گەورەکاندا خەرامان دەمبات، بە بەردەم سوپا و جەنگاوەراندا تێدەپەڕم و پیرۆزبایی گەیشتنم لێ دەکەن، دەڕۆمە باخ و گوڵستانێک، کە جوانییەکەیان چاوان ئەبڵەق دەکات و لە ناویاندا سیسەد کەنیزەکی تازەپێگەیشتوو بە ناز و غەمزەوە یاری دەکەن و پێدەکەنن، دەڕۆینە تەلارێکی تر کە بە

زومـــرودی درەوشـــاوە نەخشـــێنراوە، لە ژێـــر ڕوونـــاکیی خـــۆردا درەوشانەوەی، ڕامان دەگرێت، نەغمەی خۆشی ناو تەلار و سـەراکان گـوێم دەلاوێنێـتەوە، بۆنـوبەرامەیەکی مەسـتیهێن دەگـاتە لـووتم، کە دەستم دەگرێت وەک ئەوەی گیراوەیەکی ئەفسوناوی بڕژێتە گەرووم و چێـژی نەبـڕاوە دەمبـات، دەسـت دەخەمە سـەر کەمەری و لە ژێـر لێوەوە دەچرپێنێت: دان بۆ خۆتدا بگرە، ئێرە شـوێنی نییە و ئەوسـا دەمبـاتە تەلارێکـی سـووورباو، کە سـەرلەبەر یـاقووتی نەتاشـراوە و جوانی و شکۆ پرشنگدارەکەی دەڕژێتە چاوم و هۆشـم دەبات. قۆڵی لە گەردنـم دەئاڵێنێت و هەناسـەی دەدا لە ڕوخسـارم، ئەوکات لە ژێر لێوەوە دەڵێت "خۆشە بەزەمی عەشق و عاشقی! بدە ماچێک... یەکێکی تر... دیسان یەکێکی تر..."

لە سەر کورسیەکە ڕاکشاوم و ئەستێرەکان دەبینم، کە لە بەرچاومدا هەڵواسـراون و بیرکـردنەوەەم بە نـاو بـاوبۆرانی نـوور و ڕۆشـنـاییدا دەفرن... لەوێ خەوتبـووم و دەسـتی بێڕەحمـی پاسـەوانی گەڕۆک، لە خەوی کردم و دەرگـای ژیـان و بەختڕەشـی بەسـەردا کـردمەوە، هەر کە چاوم کردەوە، هەستم بە سەرسوڕمان و دۆشداماتێکی سەیر کرد و بە خـۆمم وت ئێـرە کـوێیە؟ چۆن لە دەرەوە و لە ژێـر ئاسـماندام؟ بەڵام خێـرا نائومێـدییەکی تـاڵ هـاتە جێـی سەرسـوڕمانی سـەرەتا، وەختبـوو هۆنهۆن بگریم کە بۆچی زیندووم، ئەوکـاتەی خەوتبـووم باران بـاری بـوو، جلەکـانم خوسـابوون و هەمـوو ئەندام و برینەکـانم سـارد و شـێدار بووبـوون، بەڕادەیەک تاریـک بـوو، کە بە ئاسـتەم دەمتوانی تارمایی پاسـەوانەکەی بەردەمم ببینم. پاسەوانەکە وتی:

- "یەڵا هەستە!"

یەکسـەر هەسـتام، هەتـا ئەگەر فەرمـانی بـدایە دیسـان بـخەوە، فەرمـانەکەیم جێبەجـێ دەکـرد، زۆر سسـت و لاواز بووبووم و هێـزم لەبەر بڕابوو، جگە لەوەش هەستم بە برسێتی دەکرد.

پاسەوانەکە هاواری کرد:

"گەمژە بوەستە! بۆ کڵاوەکەت نابەیت؟ ئێ! ئاوا باشە، دەی تێی تەقێنە و برۆ!
بە پرتەپرت و ورپیەوە وتم:
"قسەکە و جوان بوو، خۆشم هەستم کرد شتێکم بەجێ هێشتووە... سوپاس، شەویکی خۆش!"
ئەمەم وت و گێژ و لارولەویر بەرێ کەوتم.
خۆزگە پاروەنانێکم هەبوایە، لەو نانەجۆیە بەلەزەتانەی تامیان لە ژێر زمان دەمێنێتەوە و دەتوانی لە کولان و شەقامەکان بەدەم ڕێوە بیخۆیت، وێنەی ئەو نانەجۆیەم بە وردی لە خەیاڵمدا دروست کرد، زۆر بە قووڵی برسیم بوو، ئارەزووم دەکرد تیا بچم و لە سەر ئەم هەسارەیە نەمێنم، هەستوسۆزم زاڵ بوو و دەستم کرد بە گریان، مەگەر ئەم قوڕبەسەرییەی من کۆتایی نایەت؟ لەناکاو لە ناوەڕاستی کۆڵانەکە وەستام و بە شەق لە بەردەکانم دا و چیم بەدەمدا هات ڕەوانەی داروبەردم کرد، بۆچی پاسەوانەکە وا بانگی کردم؟ ئەمە چ ناوێک بوو لێی نابووم؟ پێی وتم گەمژە؟ بەڵێ! پێی دەڵێم وتنی گەمژە بە من چەند قورس لە سەری دەکەوێت! لەتاو تووڕەیی دەمم کەفی کردبوو و سوور هەڵگەڕابووم، لە کۆتایی کۆڵانەکە پێم پێچی خوارد و کەوتم، بەڵام گوێم نەدایە و بە یەک تەکان هەستامەوە و لە ڕێگەکەم بەردەوام بووم. کە گەیشتمە مەیدانی ئاسنەڕێ ئەوەندە شەکەت و داهێزراو بووم، کە پەشیمان بوومەوە لەوەی تا کەنار دەریاکە ڕابکەم، بەدەم ڕاکردنیشەوە تووڕەییەکەم دامرکابووەوە، دواجار بۆ ئەوەی کەمێک هەناسەم جێگیر بێت وەستام. ئێستا سەرباری هەموو ئەم بابەتانە ئەو وشە قۆڕەی پاسەوانە بێسەروبەرەکە پێی وتبووم، گرنگیی چی بوو؟
ڕاستە، بەڵام منیش ناتوانم بەرگەی هەموو شتێک بگرم، ئەو کات بیرکردنەوەی خۆم پچڕاند و وتم، بەڵام ڕەنگە ئەویش زۆر ئاگای لە قسەکەی نەبووە! بەهەرحاڵ، ئەم بیانوو و پاساوەی بۆ ئەوم

دەهێنایەوە ڕازیی دەکرد، دیسان گەڕامەوە و بە ڕێگەکەی خۆمدا ڕۆیشتم. بە ڕقەوە بیرم کردەوە دیسان خوا چ داوێکی بۆ ناومەتەوە و چ پلانێکی تازەی لە سەردایە؟ بەم نیوەشەوە لە ناو کۆڵانە تەڕ و قوڕوچڵپاوەکاندا، وەک شێتەکان ڕام دەکرد، برسێتی مەجالی نەدەدام و برستی لێ بڕیبووم، بۆ ئەوەی ورگم نەلکێت بە پشتمەوە بەردەوام تفی ناو دەمم قووت دەدا، بیرۆکەیەکی خراپ نەبوو، بەرلەوەی بکەومە ئەم دۆخەوە، واتە ڕۆژوویەکی تەواو بگرم، چەندین هەفتەی یەک لەدوای یەک خوارنم زۆر کەم خواردبوو، ئەم دواییانە تەواو لاواز بووبووم، گریمان بەختم هەبوایە و پێنج کرۆنم دەست بکەوتایە، جگە لەوەش ئەم پارەیە چەند بڕ دەکات؟ لەم ماوە کەمەدا چۆن مەیسەر دەبێت تۆزێ ژیان بگەڕێنمەوە بۆ خۆم؟ ئیتر ناچار دەبووم ماوەیەکی درێژ برسێتی بچێژم. شان و پشتم زیاتر لە ئەندامەکانی تر ئازاریان پێ گەیشتبوو، گریمان بە کۆکەی قووڵ و چەماندنەوەی لەشم لە کاتی ڕۆیشتندا، بمتوانییایە ساتێک ئازاری سەرسینگم هێمن بکەمەوە، بەڵام ئەی ئازار شان و پشتم چی لێ بکەم؟ چۆن دەمتوانی هیوام بە شتێکی باش هەبێت؟

مەگەر من لە **پاشای** کتێبفرۆش یان لە **هنشنی** مەلەوان کەمتر بووم، یان وەک خەڵکانی ئەم جیهانە مافی ژیانم نەبوو؟ مەگەر شانومل پان و قۆڵی بەهێزم نەبوو، کە بتوانم ئیش بکەم؟ تەنانەت بۆ دەستخستنی نانێکی مەمرەومەژی، ئامادە بووم لە شوێنێکی کۆڵانی **ئاشەوانەکان** دارتاشی بکەم، ئایا تەمەڵ بووم؟ یانی بۆ نموونە کەم ئیشم کردبوو یان کەمم خوێندبووەوە، کەم وتارم نوسیبوو، شەوان کەم وەکو شێت خوێندبوومەوە؟ کەسێک بووم کاتی پارەداری، بەوپەڕی قەناعەتەوە بە شیر و نانێک ڕازی بووم، لە کاتی کەمپارەییش بە نانەڕەقێک دادەسکنام و کاتی بێپارەییش بەڕۆژوو دەبووم و هیچم نەدەخوارد، ئایا لە ئوتێلێک لێی کەوتووم یان شوققەیەکی کەشخەم لە نهۆمی خوارەوەی بینایەک بە کرێ گرتووە؟ نەخێر، منی داماو لە

قوژبنێکی کاول، له دووکانی تەنەکەچێتی دەژیام، ساڵی پێشوو هەموو دانیشتوانی ئەم ژووره هەڵهاتبوون، چونکه له میچەکەی دڵۆپەی دەکرد. بەم هەموو بیرکردنەوه و بەڵگاندنه هێشتا سەرم له چارەنووسی خۆم دەرناچێت، لەبارەی هەموو ئەم بابەتانەوه بیرم دەکردەوه، بەڵام له بیرکردنەوەمدا هیچ نیشانەیەک له کینه و ئیرەیی نەبوو، خەم و ئازارم به خەیاڵدا نەدەهات. هەرچۆنێک بێت له بەردەم دووکانی وردەفرۆش وەستام و له پشت جامخانەکەوه سەیرم کرد، هەوڵم دا نووسینی سەر چەند قتوویەکی لەسەریەک هەڵچنراو بخوێنمەوه، بەڵام بەوپێیەی تاریک بوو نەمتوانی، ئەم ئارەزووه بۆشه بێتاقەتی کردم، تووڕه بووم بەوەی بۆچی نابێ بزانم ئەم قتوانه چیی تێدایه، بەتووڕەییه بۆکسێکم به جامخانەکەدا کێشا و دوور کەوتمەوه، له سەرکۆڵانەکه پاسەوانێکم بینی، هەنگاوەکانی خێراتر کرد و ڕێک بەرەولای چووم و بێ هیچ پێشەکییەک به شڵەژانەوه وتم:

- "سەعات دەی شەوە!"

به سەرسوڕمانەوه وتی:

- "نەخێر، سەعات دووی نیوەشەوە."

دیسان وتم:

- "نەخێره سەعات دەیه."

دواتریش لەگەڵ تووڕەبوونی زۆر، چەند هەنگاوێک پێش کەوتم و پەنجەکانم گرمۆڵه کرد و وتم:

- "گوێ دەگرن یان نا؟ سەعات دەیه!"

پاسەوان کەمێک ڕاما، سەیری قەڵافەتی کردم و به چاوی زەقەوه هەڵی سەنگاندم و دواجار به نەرمی و هێمنییەوه وتی:

- "بەهەرحاڵ، کاتی گەڕانەوەیه بۆ ماڵ، بێم لەگەڵتان؟"

ئەم سۆز و خۆشەویستییەی وەک ئاوێک بوو کرابێت به سەر ئاگردا، هەستم کرد چاوم پڕ بووه له فرمێسک و یەکسەر له وەڵامدا وتم:

- "نەخێر سوپاس، ئەمشەو زیاتر لە جاران لە کافێ مامەوە، زۆر سوپاستان دەکەم."

که لێی جیابوومەوە دەستی وەک ڕێزێک بەرەو کڵاوەکەی بەرز کردەوە، مرۆڤدۆستی ئەم پیاوە منی هێنایە سەرچۆک، دەستم بە گریان کرد، بۆچی پێنج کرۆنم نییە پێی بدەم، بە هێواشی دەڕۆیشت و من وەستاو بە چاو بەڕێم دەکرد، تا زیاتر لە بەرچاوم دوور دەکەوتەوە، من دەمکێشا بە ناوچاوامدا و قووڵتر دەگریام؛ جنێوم بە خۆم دەدا بۆچی دەبێ ئەوەندە هەژار و دەستکورت بم، قسەی ناشیرینم بە خۆم دەوت، ناوی حەیوان و باڵندەکانم لە خۆم دەنا و تا گەیشتمە ماڵەوە ئەوەندە جنێوی خەست و پاکەتییم ڕەوانەی خۆم کرد، کە بڕانەوەی نەبوو، کە گەیشتمە ماڵەوە زانیم کلیلەکانم ون کردووە!

بە پەستییەوە وتم ئاشکرایە بێگومان دەبێ کلیلەکان ون بکەم! ماڵەکەم لە شوێنێکە خوارەوەی تەویلە و سەرەوەی دووکانی تەنەکەچییە، شەو هەموو دەرگاکان داخراون و هیچکەس بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت بیانکاتەوە، هەربۆیە بەڕاستی ونکردنی کلیل شتێکی خۆشە.

وەک سەگی بەرباران خوسابووم، کەمێک، زۆر کەم برسیم بوو، ئەژنۆکانم تۆزقاڵێک سڕ و بێهێز بوون... بەمجۆرە لە ونکردنی کلیل خۆشتر چی هەیە، ئێستا چەند باش بوو هەموو خەڵکی ئەم ماڵە، ماڵیان گواستبێتەوە و ڕۆشتبنە گەڕەکی ئاکێر و نەتوانم بیاندۆزمەوە. لەناو برسێتی و سەرما بەڕادەیەک دڵڕەق و خۆشە بووبووم، کە بە خۆم پێدەکەنیم، دەنگی سمی ئەسپەکانم بەرگوێ دەکەوت و لە سەرەوەش پەنجەرەی ژوورەکەم دەبینی، کردنەوەی دەرگاکە مەحاڵ بوو، تەنانەت مەحاڵ بوو بڕۆمە ناو حەوشەکەش، دواجار بەوپەڕی داهێزران و خەموخەفەتەوە بڕیارم دا بۆ دۆزینەوەی کلیلەکان دیسان بگەڕێمەوە کەنار دەریا. دیسان باران دای کرد و هێشتا هیچ نەبوو

هەستم دەکرد ئاو لە سەرشانی چاکەتەکەمەوە دزە دەکاتە ناوەوە، لە بەردەم زیندان بیرۆکەیەکی باشم بۆ هات؛ چۆنە داوا لە پۆلیسێک بکەم دەرگای ژوورەکەم بۆ بکاتەوە؟ یەکسەر چوومە لای پاسەوانێک و بە زۆرلێکردن و کڕوزانەوە تکام لێکرد زەحمەت بکێشێت و لەگەڵم بێت و بۆ کردنەوەی دەرگای ماڵەکە یارمەتیم بدات.

بەلێ، ئەگەر بکرێت بێگومان، بەڵام سوودی چییە، کلیلی ماڵەکەم خۆ لای پاسەوانەکە نییە، کلیلەکانی بنکەی پۆلیسیش خۆ لای ئەو نییە و لە بنکەی پۆلیسە.

ئێستا بفەرموو چی بکەم؟

چیتان عەرز بکەم؟ چارەسەر ئەوەیە برۆنە ئوتێل بخەون.

ڕاستییەکەی ناتوانم بچمە ئوتێل چونکە پارەم نییە، هەموو پارەکەم لە کافییەک بە ڕابواردن تەواو کرد.

ماوەیەک هەر دووکمان بەو حاڵەوە لە سەر پلیکانەی بەر زیندان وەستابووین، بەردەوام سەیری سەروفەساڵی دەکردم و زیاتر بیری دەکردەوە. بارانێکی بەخوڕ دەباری.

دواجار پاسەوان وتی:

"زۆرباشە، کەواتە تەشریف بەرنە بەشی پاسەوانی و بڵێن شوێنی خەوتنتان نییە."

بیرم لەمە نەکردبووەوە، ئەک دەستخۆش! هەر بەڕاستی بیرۆکەیەکی نایاب بوو! یانی بڵێم شوێنم نییە! زۆر سوپاسی پاسەوانەکەم کرد، کە ئەم ڕێگەیەی پێ ناساندبووم، ئێ! هەر ئەوەندە بەسە بڵێم بێماڵم، ئەمە و هیچی تر؟ بەرپرسی ئەو شوێنە پرسی:

"ناوی جەنابت؟

وەلامم دایەوە:

"**تانگن... ئانداس تانگن.**"

نازانم بۆ لەخۆمەوە درۆم کرد، بەڕادەیەک ئاگام لەخۆم نەمابوو ،بویستی خۆم شتم دەوت و دەکرد، بۆ نموونە یەکسەر ئەم ناوەم کە

زۆر دوورەوە لە ناوی ڕاستەقینەم، ساختە کرد و بێ هیچ مەبەستێک وتم، هیچ هۆکارێک نەبوو ئەم درۆیە بکەم.

- ئیشی جەنابت؟

ئالێرە ئیتر سەرم لێ تێکچوو، ئەها ئیشوکارم؟ سەرەتا بیرم کردەوە بڵێم تەنەکەچیم، بەڵام لە ڕووم نەهات، ئەو ناوەی بە درۆ وتبووم لەوانە نەبوو تەنەکەچی بێت، جگە لەوەش چاویلکەیەکی زلم لە چاودا بوو، لەپڕ لە کەللەی دام لەخۆمەوە قسە بکەم، هەنگاوێک ڕۆیشتمە پێشتر و بە دەنگێکی پتەو و بە ویقارەوە وتم:

- ڕۆژنامەنووس!

بە بیستنی ئەم وشەیە بەرپرسی پۆلیس هەستا و نووسی، من وەک وەزیرێکی ئاوارە و بێماڵ سینگم دەرپەڕاندبوو، ئەمەش بە هیچ شێوەیەک گومانی نەوروژاند، بەڵام کابرا زۆرباش دەیزانی لە وەڵاکەمدا دوودڵم، بەڕاستی گریمانەکردنی ئەم بابەتە زۆر گاڵتەجاڕ بوو، کەسیکی ڕۆژنامەنووس ئاوا سەرلێشواو و بێماڵ بێت.

بەرپرسەکە پرسی:

- "بەرێز **تانگن** بەرێزتان لە کام ڕۆژنامەیە ئیش دەکەن؟"

لە وەڵامدا وتم:

- "لە ڕۆژنامەی **مۆرن بلادە**، ئەمشەو شانسم نەبوو، چونکە درەنگتر لە هەموو شەوێک مامەوە و خەریکی ڕابواردن بووم..."

قسەکەی پێ بڕیم و وتی: جارێ با باسی ئەمانە نەکەین و بزەیەکی کرد و درێژەی پێدا:

- "... ئێمە باشتر دەزانین کە گەنجەکان زێدەڕۆیی بکەن کار دەگاتە کوێ!"

دواتر هەستا و بەرێزەوە نووشتایەوە و ڕووی کردە پاسەوانێکی ئەوێ و وتی:

- "بەرێزیان بەرەو بەشی تایبەت ڕێنمایی بکەن! شەوێکی خۆش!"

له ئازایەتی خۆم پشتم دەلەرزی و بۆ ئەوەی خۆم نەدۆڕینم لە کاتی ڕۆیشتندا، دەستەکانم قونجاند و دەمکوشی. پاسەوانی بەردەم دەرگاکە وتی:

"تا دە دەقەی تر چراگازی بەر دەرگاکەتان دەکوژێتەوە..."

پرسیم:

"کەواتە دوای ئەوە ڕووناک نابێت؟

"بەڵێ، دوای ئەوە دەکوژێتەوە."

بەهەرحاڵ، لە سەر چرپاکە دانیشتم و گوێم لە دەنگی سووڕانی کلیلەکە بوو لە قوفڵەکەدا، ئەو ژوورە ڕووناکەی هاتمە ناوی، دیمەنێکی باش و دڵگیری هەبوو. ئێستا ئیدی پەناگەیەکم هەبوو و بە ئاسوودەیی گوێم لە دەنگی باران بوو، لەمە باشتر شوێنێکی وا گەرمونەرم و چۆڵ لە خوا داوا ناکرێت! دڵخۆشییم زیاتر دەبوو، کڵاوەکەم بە دەستەوە گرت و لە سەر چرپاکە ڕاکشابووم و سەیری بڵێسەی ئاگری چرای سەردیوارەکەم دەکرد و بیرم دەکردەوە. لەپڕ قۆناغە جیاوازەکانی ئەم بەسەرهاتەم هاتەوە خەیاڵ، ئەمە یەکەم جار بوو سەروکارم لەگەڵ پۆلیس هەبێت و چەند باشیش هەڵمفریواندبوون، بەڵێ فەرمووتان ناوتان تانگن و پیشەتان ڕۆژنامەنووسییە؟ ناوی ڕۆژنامەی مۆرگن بلادە وەک چەقۆیەک چەقیبوو بە دڵی پیاوەکەدا، چەند کارێکی سەیری لێکرد، جارێ با باسی ئەم بابەتە نەکەین، لەڕاستیدا من بۆ ئاهەنگی شەوانەی جەنابی سەرۆک بانگهێشت کرابووم و تا دووی نیوەشەو لەوێ مامەوە، بەڵام بەداخەوە کلیلەکانیماڵەکەم و جانتایەک کە چەند هەزار کرۆنیکی تێدایە لەوێ جێماوە، بەڵێ... بەڕێزتان بەرەو بەشی تایبەت ڕێنمایی بکەن، لەناکاو چراگازەکە کوژایەوە، ئەم تاریکییە سەیر و لەپڕ بوو، چونکە بێ ئەوەی بەرەبەرە ڕووناکییەکە کەم بێتەوە، بەیەک جار تاریکییەکی نوتەک ژوورەکەی هەڵلوشی.

بەجۆرێـک کە نە دیـوارە سـپییەکانی چـواردەور، نە دەسـت و هـیچ شتێکی ترم نەدەبینی، چار نییە هەر دەبێ ڕاکشێی و بخەوی، جلەکانم داکەند، بەڵام بـۆ وا زوو خەوم لـێ دەکەوێـت؟ مـاوەیەک ڕاکشـاو لە تـاریکییەکە ڕامـام، بەو تـاریکییە قـووڵەی بـڕانەوەی نەبـوو و زەیـنم توانـای وێنـاکردنی چییەتییەکەیـی نەبـوو، ئەقڵـم بە هەقـیقەتەکەی نەدەشـکا، ڕەشـییەکەی لەڕادەبەدەر بـوو، وێنـاکردنی ئـازاری دەدام، چاوم داخسـت و لە بەرخۆمەوە کەوتمە ورتەورت، بۆ خۆخەڵەفاندن لە سـەر چرپا کۆنەکە کەوتبـووم و تەپـاوتلم دەکـرد، بەڵام سـوودی نەبوو، تاریکی دەستبەردار نەبوو و بیرکردنەوەی شڵەژاندبووم، بیرم دەکردەوە بوونم لە تاریکیدا لەناو چووە، ئایا خۆشـم بەشێک نەبـووم لەو تاریکییە و ئاوێتەی تاریکی نەبووم؟ لە سـەر چرپاکە هەڵدەسـم و دەست دەجوڵێنم، توڕەیی بەسەرمدا زاڵ دەبوو و تا زیـاتر بمویسـتایە شەڕی لەگەڵ بکەم سوودی نەبوو، وەهـم و وێنەی سـەیرم دەبینی و بۆ لەبیرکردنـی لایـلایە و گـۆرانی منداڵانەم دەوت، تەقەلام بـوو خـۆم ئـارام و بێـدەنگ بـکەم، ئەوەنـدە هەوڵـم دەدا، کە شـەکەت و مانـدوو دەبووم و ئارەقە دەیخووسـاندم، چـاوم لە تـاریکی بڕیبـوو، بە هەمـوو تەمەنم تاریکیی وام نەبینیبوو، بێگومان ئەم تاریکییە حـاڵەتی تـایبەتیی هەبوو، ڕەگەزێک بوو بێڕۆح و دەروون، کە کەس ناتوانێت دزە بکـاتە ناوی و تیای قووڵ بێتەوە، بیرکردنەوەی پووچ و گاڵتەجـار بەسـەرمدا زاڵ دەبـوو و شـتێک دەیترسـاندم، کـونێکی بچـووک کە لە تەنیشـت چرپاکە بوو دەیخسـتمە نـاو بیرکـردنەوە، نـازانم شـوێنی بزمـارە یـان نیشانەیەک لە دیوارەکەدا، فووی لێ دەکەم و دەسـتی بۆ دەبەم بزانم چەنـد قـووڵە، ئەم کـونە بێگومـان سروشـتی و بەڕێـکەوت نیـیە، گومانـاوی و پڕنهێنیە و دەبێ وریـای بـم، ئەم بیرۆکەیە وا چووبووە مێشـکمەوە کە لەتـاو حەزی پرسـۆجۆ و تـرس ئـۆقرەم لـێ برابـوو، بەناچاری لە چرپاکە دادەبەزم و بۆ تیغی قەڵەمدایەنەکە دەگەڕێـم، کە قووڵی کونەکەی پێ بپێوم و ببینم دەگاتەوە ژووری تەنیشـت یـان نـا.

دیسان ڕاکشام، چاوم گەرم بوو، بەڵام نەک هەر خەوم لێ نەکەوت، بەڵکو دیسان تاریکی هەڵی لووشیم و ناچار بووم دەستوپەنجەی لەگەڵ نەرم بکەم. لە دەرەوە باران خۆشی کردبووەوە و هیچ دەنگێک بەرگوێ نەدەکەوت. ئەوسا ماوەیەکی زۆر گوێم لە دەنگی پێی ڕێبوارەکان گرت و ئەوەندە درێژەم بەم کارەدا تا توانیم دەنگی پێی پاسەوانێک و ڕێبوارێک لە یەکتر جیا بکەمەوە. دەستم کرد بە پێکەنین و چەندجارێک پەنجەکانم لە یەکئاڵاند و تەقاندم، هەر بەڕاستی خۆشییەکی سەیر بوو! ئەها! لەناکاو هەستم کرد وشەیەکی تازەم دۆزیوەتەوە، لە جێگەکەم کەمێک بەرز دەبمەوە و بە خۆم دەڵێم ئەم وشەیە لە فەرهەنگی زمانی ئێمەدا بوونی نییە و داهێنەرەکەی منم، ئەم وشە تازەیە **کۆبۆوایە**، ئەم وشەیە وەک وشە ئاساییەکانی تر بە تیکەڵکردنی پیتە جۆراوجۆرەکان دروستکراوە، ئافەرین! ئای لەم وشەیەی دروستت کردووە! ئەم وشەیە لە ڕوانگەی **ڕێنووسەوە** زۆر گرنگە.

لە تاریکیی ژوورەکەمدا ئەم وشەیەم لە زەینمدا وێنا کرد، دەتوت بە چاو دەیبینم، چاوم بەم کارە بێوێنەیە، زەق و تاساو ماونەتەوە و لە دڵخۆشیدا پێدەکەنم، دواتر دەستم کرد بە هێواش قسەکردن، چونکە دەترسام ئەگەر بەرز قسە بکەم گوێیان لێ بێت و نهێنی ئەم ڕازە گەورەیە بڵاو بێتەوە، چیتر زۆری نەمابوو لە برسا تەواو شێت بم، دەروونم بەتاڵ و بێخەم بوو و خۆم پێ ڕانەدەگیرا، بێدەنگ لە دەروونی خۆمدا بیرم دەکردەوە و خەیاڵم دەچنی، بە سەفسەتەی سەیروسەمەرە، هەوڵم دەدا بۆ ئەم وشە تازەیە مانایەک بدۆزمەوە.

پێویستی نەدەکرد لە ناوەکانی خودا بێت یان مانای **تیڤولی**[1] بدات، ڕەنگە ئەم وشەیە بۆ 'ئاژەڵداری' باش بێت؟ دواتر دەستم توند قونجاند و وتم کەس دەوێرێت بڵێت ئەم وشەیە مانای پێشانگای

---

[1] Tivoli: لە نەرویج و وڵاتانی ئەسکەندەناڤیا، بە شوێنێک وەک پارکی یاری و شوێنی گەشتوگوزار و کاتبەسەربردن دەوترێت. (و.ف)

"چوارپێکان" دەگەیەنێت؟ کە زۆر قووڵ بوومەوە هەستم کرد هیچ پێویست ناکات بە مانای "شەفەق" یان "قوفڵ" وەری بگرم.
دۆزینەوەی مانای گونجاو بۆ ئەم وشەیە، زۆر سەخت نەبوو، دەبوو بە ئاسوودەیی ورد بمەوە و دان بە خۆمدا بگرم تا ماناکەی خۆبەخۆ دەربکەوێت.
بەدەم ڕاکشان لە سەر چرپاکە بەرز پێدەکەنم و بۆچوونی خۆم لەسەر ئەمە نادرکێنم، دوای چەند خولەکێک دیسان تووڕەییم دەگەڕێتەو،. نەخێر! ئەم وشە تازەیە چۆتە زەینمەوە و ئازارم دەدات، تا ئەو شوێنەی خەمۆکم دەکات و بیرکردنەم قاڵ دەکات، تا ئێستا هیچ مانایەکی وێناکراوم بۆ ئەم وشەیە پێ قبوڵ نەکراوە، بەڵام مانایەکی تایبەتیشم نەبوو بۆی.
دواتر بە دەنگی بەرز بە خۆم وت بابەتە سەرەکییەکە دانانی وشەکەیە و شکور دواجار لەمەدا سەرکەوتم، دۆزینەوەی مانا بۆ وشە لاوەکییە، دەستی خۆم گووشی و دیسان دووبارەی دەکەمەوە: "بەڵێ دۆزینەوەی مانا لاوەکییە." ئەم بابەتە وا سەرنجی ڕاکێشاوم، کە لێناگەڕێت خەو بمباتەوە، بەڵام دانانی وشەکە ئەوەندە چێژم پێدەبەخشێت، کە چێژی خەوتن لە چاویدا هیچ ناهێنێت!
دیسان دەڕۆمەوە ناو جێگەکەم و سەرم دەخەمە نێو هەر دوو دەستم، بە خۆم دەڵێم هەر مانایەکی پێ ببەخشم، مەحاڵە "کۆچ" یان "کارگەی جگەرە"ی بدەمێ، ئەگەر بڕیار بێت ماناکەی ئەوەندە ئاسایی و بێمانا بێت، بێگومان تا ئێستا خۆم مانایەکی ورد و ڕێکوپەوانم پێ بەخشیبوو، بەڵام لەڕاستیدا پێکهات و چییەتی وشەیەکی لەمجۆرە، وا حوکم دەکات نیشانەی هەستوسۆزی ناوەکی بێت و حاڵەتێکی ڕۆحی تایبەت وەسف بکات... باش ئاگام لەم خاڵە بوو، دواتر لە یادەوەریی خۆمدا دەگەڕێم، کە ڕەنگە حاڵەتێکی ڕۆحی دیاریکراو بدۆزمەوە و ئەم وشەیە بۆ دەرخستنی ئەو حاڵەتە بخەمەکار و ببیرم بە سەریدا.

لەم کاتەدا دەتوت کەسێک قسەم لەگەڵ دەکات و قسەکەم پێ دەبڕێت، منیش بە تورەییەوە وەڵامی دەدەمەوە: "گیان چیت فەرموو؟ نا بەڕاستی رووی هەموو دەبەنگەکانت سپی کرد؟ چۆن؟ یانی دەفەرموون ئەم وشەیە بە مانای کڵافەی شلیلە دابنێم؟ فەرموو برۆن و تەشریف بەرن، خوا تۆزقاڵێک ئەقڵتان بداتێ!

من کە زۆر ڕقم لە شلیلە بوو، بۆ دەبێ وشەکەی خۆمی بۆ دابنێم؟ گومان لەوەدا نییە من ئەم وشەیەم داناوە و دۆزینەوەی مانای گونجاو بۆی، مافی ڕەوای خۆمە و هێشتا هیچ بڕیارێکم نەداوە بۆی...

بیرکردنەوەم زیاتر تێک دەچرژا و دواجار لە چرپاکەم هاتمە خوارەوە، تا بەلۆعەی ژوورەکە بدۆزمەوە، تینووم نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی سەرم گەرم بوو و تام لێهاتبوو، هەستم بە تینوێتییەکی سەیر دەکرد، دوای خواردنەوەی ئاوەکە دیسان گەڕامەوە بۆ سەر چرپاکەم، ئەمجارە ئیتر بڕیارم دا بخەوم، چاوەکانم داخست و هەوڵم دا هێمن بم، چەند خولەکێک بێجووڵە مامەوە، ترپەی دڵم خێرا بوو و ئارەقەم کردبووەوە... چەند خۆش بوو! کابرا وای دەزانی لە شەیپورە کاغەزییەکەدا پارەی تێدایە، وابزانم جارێک زیاتر نەکۆکی... ئێستا لە کوێوە چاوت لێ بیت، بزانیت دیسان لە شوێنەکەی ماوەتەوە یان لە سەر کورسییەک دانیشتووە؟ سەدەفی شینباوی دەریا... دیمەنی بەلەمەکان...

تەواو خەوم زڕابوو، چاوەکانم کردەوە، پێویستی نەدەکرد لەخۆڕا چاوم بتوقێنم... دیسان هەمان تاریکیی ژوورەکەی داپۆشیبوو، نەمدەتوانی لەم تاریکییە قووڵ و بێبنە تێبگەم، هێزی خەیاڵیشم لە بەردەمیدا بڕی نەدەکرد، پێوانە و کێشانەیەکیش بۆ هەڵسەنگاندنی بوونی نەبوو، بەوپەڕی نائومێدییەوە هەوڵم دەدا وشەیەک بدۆزمەوە، کە ئەم تاریکییە غەریبە وەسف بکات، بەڵێ، ئەو وشەیە دەبێ

بەجۆرێک ڕەش و تاریک بێت، کە لەکاتی وتنیدا دەمم لە ڕەشی بئاڵێت، خوایە گیان! چەند تاریکە!

یەکسەر مێشکم فڕی بۆ ڕۆیشتە شوێنێکی تر؛ ڕۆشتە بەندەرگا و بەینی کەشتییەکان، ئەم گێژاوە دەریاییانە وەک تارمایی ڕەشپۆش و دێوی دڵڕەش کەمینیان لێ گرتبووم، دەیانویست قووتم بدەن، دیل و گیرۆدەم بکەن و لەگەڵ خۆیان بە سەر وشکانی و دەریاکاندا هەڵمفڕێنن و ببمەنە قەڵەمڕەوێک، هیچ کەس نەیبینیوە. وەک ئەوەی لە سەر پانتایی کەشییەک دانیشتبم، لە ناو ئاودام، لە سەروو هەورەکان دەفڕم، دەکەومە ژێر، خەریکە ژێر دەکەوم، دەکەوم... تاساو و تۆقیو دەقیژێنم و بە هەردوو دەست باوەش بە چرپاکەدا دەکەم، چەند سەفەرێکی ترسناک! وەک تەنێکی قورس لە بەرزایی ئاسمانەوە بەردەبمەوە، دەستم لە چرپاکە گیر دەکەم، ئای چەند باش ڕزگارم بوو! بە خۆمم وت، ڕەنگە مردنیش وا بێت، کەواتە بزانە وا خەریکە دەمریت! بیرکردنەوە لەوەی لە حاڵەتی گیاندان و سەرەتای مردندام ماوەیەک سەرقاڵی کردم! لە سەر چرپاکەم دادەنیشم و بە دەنگێکی جیدی لە خۆم دەپرسم کێ وتویەتی من دەبێ بمرم؟ بەڵێ ئەم وشەیە خۆم دام هێناوە، کەواتە هەڵبژادنی ماناکەشی مافی خۆمە...

هەستم دەکرد تەواو خەریکی وڕێنەکردنم، بەرلەوەی قسەکەم تەواو بێت، باش تێگەیشتم وڕێنە دەکەم، بەهۆی لاوازی و داهێزرانەوە جۆرە شێتبوونێک یەخەی گرتبووم و وڕێنەم دەکرد، هەڵیتوپەڵیتم دەڕست، ئەگەر بەمجۆرە بێت ئاگام لە خۆمە، لەپڕ ئەوە هاتە خەیاڵمەوە نەوەک شێت بووبێتم.

بە ترسیکی زۆرەوە لە چرپاکە دێمە خوارەوە، بە لەترلێدانەوە بەرەو دەرگاکە دەڕۆم و هەوڵ دەدەم بیکەمەوە، دوو سێ جار بە شان لە دەرگاکە دەدەم، بۆ ئەوەی ڕەنگە لە بن دەری بهێنم، بەلام سەرم بەر دیوار دەکەوێت و هاوار دەکەم، گاز لە پەنجەکانم دەگرم و دەگریم و جنێو دەدەم... لەو بێدەنگییە ڕووتەی کە زاڵ بوو، دەنگدانەوەی دەنگم

دەبیســـت کە بەر چواردیـــوارەکە دەکەوت و دەگەڕایەوە، لە ســـەر ئەرزەکە خـۆم گرمـۆڵە دەکـرد و لەوە زیـاتر بەرگەی ئـازاری ئەو زیندانە تەنگ و تاریکەم نەدەگرد، لەو کاتەدا لە سـەرەوە، لە بەرچـاوم ئاسـتێکی چوارگۆشـــە شـێوەی خۆلەمێشـیم بە دیـوارەکەوە بینـی، پەڵەیەکـی سـپی بـوو و هەسـتم دەکـرد ڕۆشـنایی ڕۆژ بیـت، ئـاخ! هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵمژی! لە سەر سک کەوتبووم و لەبەر ئەم ڕوونـاکییە بە بەرەکەتە لە دڵخۆشـیدا فرمێسـکم دەڕشـت... مـژدەی هـاتنی سپێدە دڵخۆشـی دەکردم، قوڵپقوڵـپ گریـام، جوڵەی شـێتانەم دەکـــرد و مــــاچم بـــۆ ئەو دەرچەیە هەڵ دەدا، بەڵام لە هەمـــوو ئەم کاتانەدا ئاگام لە خۆم بوو و دەمزانی خەریکی چیم، لە چاوتروکانێکدا ڕەشبینییەکەم لەناو چوو، ئازار و ناکامییەکـانم کۆتـایی هـاتبوون، تـا خەیاڵیشـم بە پانتـایی فراوانـی کاتـدا دەگێڕا، هەسـتم دەکـرد خەون و ئـارەزوویەکی بەدینەهــاتووم نیـیە، دەسـتەکانم پـێکەوە گرێـدا و بە خۆڕاگرییەوە لە چاوەڕوانی سپێدەی بەیان، لە سـەرزەوی دانیشـتم، چ شـەوێک بـوو! پـێم سـەیر بـوو چـۆن دەکـرێ ئەوانـی تـر گوێیـان لە هاتوهاواری من نەبووبێت، بەڵام بیرم کەوتەوە من لە بەشـی تـایبەتم و پێگەم لە زینـدانییەکانی تـر بەرزتـرە، بە مانـایەکی تـر مـن وەزیـرم، بەڵام وەزیرێکـی ئـاوارە و مـاڵبەکوڵ، زۆر کەیفسـاز بـووم، چاوەکـانم وەک جـــاران لە دیـــوار و دەرچەی ژوورەکە بڕیبـــوو، لاســـایی وەزیرەکانم دەکردەوە و بەمجۆرە خۆم دەخلافاند. بۆ نمـوونە دەمـوت جەنـابی بەڕێـز تـانگن و بە دەسـتەواژەی زۆر فەرمـی و ناونیشـانی تەشـریفاتی قسـەم لەگەڵ خـۆم دەکـرد، هێشـتا وەهـم و خەیـاڵ لە کەللەمـدا مـابوون، بەڵام تـوڕەیی و گـرژییەکەی پێشـووم نەمـابوو، ئەگەر لە بێئاگاییەوە جزدانی پارەکەم لە ماڵەوە جێ نەهێشتایە، ئێسـتا ئەو شانازییەم پێ نەدەبڕا وەزیرانە لە سەر چرپاکەم ڕابکشـێم، ئەمەم وت و بە ویقـاری زۆر و فیـزی زۆرەوە، لە ســەر چرپـاکە ڕاکشــام. ئێسـتا بەجۆرێـک ژوورەکە ڕوونــاک بـوو، کە دەمتـوانی سـنووری

ژوورەکە بناسمەوە، کەمێک دواتر کێلوونی گەورەی دەرگاکەم بینی، هەر ئەمەش هێنامیەوە سەرخۆم، تاریکی دەشکا، تاریکییەک کە خەستییەکەی تورەی دەکردی و رەشییەکی قیرشێوە، کە تیایدا چاو چاوی نەدەبینی، دواجار لەناو چوو و رووناکی سپێدە دەرکەوت، کەمکەم کەفوکوڵی من دامرکا و هەستم کرد چاوەکانم دادەخرێن.

لەپڕ چەند لێدانێک بەر دەرگای ژوورەکە کەوت و هەستام، یەکسەر لە چرپاکە هاتمەخوارەوە و ڕۆیشتم جلەکانم لە بەر کرد، جلەکانم هێشتا بەهۆی بارانی دوێشەوەوە تەڕ بوون.

پاسەوانێک کە لە دەرگا دابوو، وتی تکایە خۆتان بە پاسەوانی ئەمڕۆ بناسێنن، ترسام چونکە پێم وابوو دیسان دەبێ تەشریفاتی ئیداری بنوێنم.

دواجار هاتمە نهۆمی خوارەوە و ڕۆیشتمە ژوورێکی گەورەوە، لەوێ سی چل کەسی ماڵبەکۆڵ و بێماڵوحاڵ دانیشتبوون، لە دەفتەرێکەوە ناوەکانیان دەخوێندەوە و یەکبەیەک بانگی هەموویان دەکرد و تکتی ژەمەخواردنێکی بەلاشیان بە هەموان دەدا. بەرپرسی پاسەوانەکە ساتبەسات بە پاسەوانەکەی تەنیشتی دەوت:

- "تکتەکەی وەرگرتووە؟ لە بیرتان نەچێت بلیتەکانیان وەربگرن... بەڕاستی حەقی ژەمەخواردنێکیان هەیە!

بە حەسرتەوە سەیری تکتەکانم دەکرد و حەزم دەکرد ببمە خاوەنی یەک دانەیان، بانگیان کردم:

- " ئەندراس تانگن، ڕۆژنامەنووس!"

یەکسەر ڕام کردە پێشەوە و سەرم بۆ پاسەوانەکە دانەواند. وتی:

- "وای چۆنە کە ئێوە تەشریفتان لێرەیە؟"

ئەوسا خاڵبەخاڵ هەمان بەسەرهاتی دوێشەوم بۆ گێرایەوە و مەسەلەکەم بۆ ڕوون کردەوە، دیسان درۆکانم دەرخوارد دایەوە، بەوپەڕی سادەیی و ڕاستگۆییەوە درۆم کرد:

"بەداخەوە دوێشەو زۆر لە دەرەوە مامەوە، لە یانەیەکی شەوانە خەریکی ڕابواردن و خۆشخۆری بووم و کلیلەکانیشم لەوێ ون کرد..."

پاسەوانەکە بزەیەکی کرد و وتی:

"کەواتە ئاوا بوو! بەهەرحاڵ هیوادارم باش خەوتبن؟"

وەڵامم دایەوە:

" زۆرباش!" وەزیرانە خەوتم."

دواتر وەک لەخۆبردووییەک هەستا و وتی:

"چەند باشە کە خۆش خەوتوون، هیوادارم باش بن!"

منیش چاوەڕێم نەکرد و یەکسەر هاتمە دەرەوە، ئاخر با تکتێک وەربگرم، سێ شەووڕۆژە هیچم نەخواردووە، برسیمە، لانیکەم با پارووەنانێک بخۆم، بەڵام هیچکەس تکتی خواردنی پێنەدام، خۆیشم نەمدەوێرا داوای بکەم، چونکە یەکسەر گومانیان دەکرد و لێکۆڵینەوەیان لە ژیانم دەکرد، تێدەگەیشتن بەڕاستی کێم و دواتر بە تۆمەتی درۆکردن دەستگیر دەکرام.

یەخەی چاکەتەکەم بە پەنجەکانم گرت، ڕێک وەک ملیۆنەرەکان سەربەرز و سەرفراز لە حەوشەی ئەو شوێنە هاتمە دەرەوە، دوو سەعاتی مابوو بۆ نیوەڕۆ، گەرم بوو و خۆر لە ئاسماندا دەدرەوشایەوە، لە بازاڕی گەورە هاتوچۆی خەڵک و کەرەستەی گواستنەوە هاتوهاوارێک دروست بووبوو. ئێستا بەرەو کوێ بڕۆم؟ دەست دەخەمە سەر گیرفانم بزانم نووسینەکە لە جێی خۆیەتی یان نا، دڵنیا دەبمەوە لە مانەوەی، کە بوو بە سەعات یانزە دەبێ هەر چۆنێک بێت سەردانی سەرنووسەر بکەم، ماوەیەک پاڵ بە سیاجەکەوە دەدەم، لە سەرەوە جموجۆڵ و هاتوچۆکان تەماشا دەکەم، لەم کاتەدا دەمبینی هەڵمیک لە جلەکانمەوە بەرز دەبێتەوە. دیسان برسێتی زۆری بۆ هێنام، گیانم کەوتە لەرزین، سینگم دەکزایەوە و لەشم مێروولەی دەکرد! هەستم بە کزانەوەیەکی سووک

دەکرد لە جەستەمدا و ئازارم دەچێژا، نە هاوڕێ و نە خەمڕەوێنێکم نەبوو هاوکاریم بکات، بەردەوام بە یادەوەرییمدا دەگەڕێم ڕەنگە کەسێکی ناسراوم بیربێتەوە، بتوانێت دە ئۆرام پێ بدات، بەڵام کەس نییە! چەند ڕۆژێکی خۆش و هەوایەکی گیانهەژێنی هەبوو، هەتاو پرشنگی بەر هەموو شوێنێک دەکەوت، نوور لە داروبەردەوە دەڕژا، ئاسمان وەک دەریایەکی زولاڵ و ڕوون، بە شەپۆلانەوە کوێستانی "لیر"ی[1] گەمارۆ دەدا.

لە خۆڕا بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوتم، زۆر برسیم بوو، چنگێک تەلاشەدارم لە سەر ئەرزەکە هەڵگرت و جوویم، تامی خراپ نەبوو، بۆچی تا ئێستا بیرم نەکردبووەوە؟ دەرگای ماڵەوە کراوە بوو، کارەکەرەکە وەک عادەتی جاران سڵاوی کرد و وتی: هەوا زۆر خۆشە! نەمتوانی هیچ بڵێم جگە لە پشتڕاستکردنەوەی قسەکەی، چۆنە داوای کرۆنێک قەرزی لێ بکەم؟ ئەگەر بتوانێت لە دڵەوە دەیدات، جگە لەوەش جارێک یارمەتیم دابوو و نامەم بۆ نوسیبوو، ئەو لەوێ وەستابوو و دەیویست شتێک بڵێت، دواجار وتی:

- "هەوا زۆر خۆشە! بەڵێ، ئەمڕۆ دەبێ کرێماڵەکەم بدەم، ئایا دەکرێ پێنج کرۆن قەرزتان لێ وەربگرم؟ تا چەند ڕۆژێکی تر دەیگەڕێنمەوە، دەزانم بەڕێزتان جارێک گەورەیتان نواند و شتێکتان بۆ کردم.

لە وەڵامدا وتم:

- **ئینس ئۆلای**، ڕاستییەکە ئەوەیە کە ناتوانم، یانی ئێستا ئەو توانستەم نییە، ئیشەڵا دواتر و ڕەنگە هەر ئەمڕۆ پاشنیوەڕۆ، بەڵام ئێستا ناتوانم."

ئەمەم وت و بە لەترەوە بە پلیکانەی ماڵەکەدا ڕۆیشتمە سەرەوە و لە سەر جێگەکەم لێی کەوتم، دەستم کرد بە پێکەنین! لەمە شانسی خراپتر چی هەیە یەخەم بگرێت! بەڵام باش نەمهێشت حەیام بچێت،

---

[1] Lier: شارۆچکەیەکی سەرسەوز لە نزیک ئۆسلۆ. (و.ف)

پێنج کرۆن پارە! بێقەزابی بۆچی لەبری پێنج کرۆن، پێنج پشکی ریستۆرانتی گشتی و ماڵێکی جوانت لە گەڕەکی ئاکرازمەن داوا نەکرد؟
ئەم پێنج کرۆنە تا دەهات زیاتر دەیخستمە پێکەنین، بەڕاستی بە مانای تەواوی وشە لاتوپووت بووم، چەند لە کاتیکی باشدا داوای پێنج کرۆنی دەکرد، دڵخۆشییەکەم زیاتر و زیاتر دەبوو.
ئەهـ ئەو بۆنی خواردنە لە کوێوە دێت؟ ئاهـ بۆنی گۆشتە، کە بۆ نانی نیــــوەڕۆ برژانـــــدوویانە! پەنـــــجەرەکە دەکەمەوە هەوای ژوورەکە بگۆڕدرێت، ئەم بۆنە ناخۆشە بچێتە دەرەوە. هۆی گارسۆن! نیونەفەر گۆشتی برژاو بینە! لەم کاتەدا لە مێزی لەقوتەقی ڕزیوی ژوورەکەم، کە لەکاتی نووسین ناچار بووم بە ئەژنۆکانم ڕای بگرم، نزیک دەبمەوە و وەک خزمەتکاری میوانخانەکان خۆم دەنوشتێنمەوە و دەڵێم دەتوانم پرسیارێک بکەم: ئارەزووی پێکێک شەرابیش دەکەن؟ مەگەر نازانن من وەزیرم و ناوم تانگنەە؟ بەداخەوە دوێشەو تا درەنگان خەریکی خواردن و خواردنەوە بووم... کلیلی دەرگا گەورەکەی ماڵەکەم... دیسان جڵەوی خەیاڵم شل بوو و بیرکردنەوەم بە ئاڕاستەیەکی تازەدا ڕۆیشت و زەینم شڵەژا، بەڵام لە هەموو ئەم ماوەیەدا ئاگادار بووم هەڵیتوپەڵیت دەڵێم و قسەکانی خۆم باش دەبیست و حاڵی دەبووم و خۆم سەرکۆنە دەکرد: دیسان دەستت کردەوە بە قسەی قۆڕ؟ بەڵام کێشەکە ئەوە بوو نەمدەتوانی ڕێگە لە خۆم بگرم، ئەگەرچی بەئاگا و هۆشیار بووم، بەڵام وەک ئەوەی لە خەودا قسە بکەم، سەرم هێمن بوو و ئازاری نەبوو، دەروونم ئاسوودە و خەیاڵم ساف بوو، لە سەر کەشتی خەیاڵ دانیشتم و خۆم دایە دەست شەپۆلی خەیاڵ و وەهمەکانەوە...
"فەرموون، ڕێزتان هەیە فەرمووا دەبینن هەموو شوێنەکان بە یاقووت نەخشێنراوە، ئاهـ تۆی ئیلایالی! ئیلایالی! چەند سەرینێکی نەرمە، لە ئاوریشمی سوور ساز کراوە! ئافەرین، بۆچی وا هەناسەت سوار

بووه ئازیزم؟ دولبەرم، مەحبووبم، ماچێک، ماچێکی تر! لێوەکانت گڕاوین، باسکت لە ڕەنگی عەنبەر...
هۆی گارسۆن! من داوای کەبابم کرد.. هەتاو لە پەنجەرەکەوە دێتە ژوورەوە، دەنگی ئەسپەکان کە خەریکی وێنجە خواردنن لە نهۆمی خوارەوە دەبیستم، من وەک منداڵێکی ساوا، پوشوپەلاشەکە لە بەینی ددانم دەجووم و بەردەوام بۆ ئەوەی بزانم نووسینەکەم لە جێی خۆیەتی، دەست بۆ گیرفانم دەبەم، هەرچەند ئاگام لەوێ نەبوو، بەلام لە دڵەوە دەمزانی نووسینەکە لە جێی خۆیەتی! ڕەگوڕیشەی بوونی، بیری دەهێنامەوە نووسینەکە لەوێیە، لەم کاتەدا لە گیرفانم دەرم هێنا، تەڕ بوو، لە بەر هەتاودا ■کالام کردەوە، دواتر دەستم کرد بە هاتوچۆی بە ناو ژوورەکەدا، ژوورەکە حاڵەتێکی خەمۆک و دڵتەنگی هەبوو، هەموو شوێنەکانی پارچە تەنەکە بوون، یەک کورسیم نییە بۆ دانیشتن، تەنانەت بزمارێکیش بە دیوارە ڕووتەکانییەوە نییە، هەموو سەروماڵم تیا چووە و خراوەتە ڕەهنەوە، جارێ هەموو سامانی من بریتییە لە چەد کاغەزێک کە لە سەر مێزەکە کەوتووە و تۆز خواردوونی. بەتانییە سەوزەکەی سەر چرپاکەش، چەند مانگی پێشوو لە هانس پۆلی بە ئەمانەت وەرم گرتبوو... پەنجەکانم لە یەک گیر دەکرد و دەمتەقاند و دەموت هانس پۆلی! بەڵێ، تاکە کەسێک فریام بکەوێت هانس پۆلی پترسۆنە! هەوڵ دەدەم ناونیشانی ماڵەکەیم بیر بکەوێتەوە، چۆن تەواو لە بیرم کردبوو؟ بێگومان پێی ناخۆش دەبێ، کە بۆچی لە دۆخێکی وادا دەژیم و یەکسەر نەچوومەتە لای، وەک کارەبا کڵاوەکەم لە سەر دەنێم و نووسینەکە هەڵدەگرم و بەپەلە بە پلیکانەکاندا دادەگەڕێم.
لە بەردەم دەرگای تەویلەکە بە دەنگی بەرز "یەنس ئۆلی" بانگ دەکەم و دەڵێم:
- "هەر ئەمڕۆ عەسر چارەسەری دەکەین."

کە دەگەمە مەیدانی زیندان، دەبینم لە سەعات پانزە لای داوە، بڕیار دەدەم یەکسەر سەرێک لە ئۆفیسی ڕۆژنامە بدەم، لە بەردەم ئۆفیسەکە وەستام بزانم لاپەڕەکانی نووسینەکەم ڕێکوپێکە یان نا، دواتر کاغەزەکانم بە باشی سافوڕێک کرد و لە دەرگام دا.

لە کاتی ڕۆیشتنە ژوورەوە گوێم لە دەنگی ترپەی دڵم بوو، **مقەست** وەک جاران لە شوێنی کارەکەی خۆیەتی، بە شەرمنییەوە لێی دەپرسم:

- "سەرنووسەر لێرەیە یان نا؟

وەڵام ناداتەوە، مقەستێکی درێژی بە دەستەوەیە و ڕۆژنامەی ناوچەکان ئەمدیواودیو دەکات، تا هەواڵێکی بچووک بدۆزێتەوە و بیبڕێت، پرسیارەکەم دووبارە دەکەمەوە و دەڕۆمە پێشتر، ماوەیەکی دواتر **مقەست** بۆ ئەوەی چاوی بەرز بکاتەوە دەڵێت:

- "نەخێر، سەرنووسەر نەهاتووە."
- "ئێ باشە ئەی کەی دێت؟"

بە هیچ شێوەیەک ئاگادار نەبوو و نەیدەزانی کەی دەگات.

- "ئۆفیسی ڕۆژنامە تا کەی کراوەیە؟"

ئەم پرسیارەش وەڵامی نەبوو و جگە لە چوونەدەرەوە لەو شوێنە چارم نەبوو، بە درێژایی ئەم ماوەیە کابرا سەیرێکی نەکردم و بە دەنگما منی ناسییەوە، لە دڵی خۆمدا بیرم کردەوە ماشەڵا لێرە چەند ڕێز و شکۆت هەیە کە تەنانەت وەڵامیشت نادەنەوە، ڕەنگە سەرنووسەر وتبێتی وا مامەڵەم بکەن، هەڵبەت دان بەوەدا دەنێم کە دوای وەرگرتنی وتارە دە کرۆنییەکە، نزیکەی هەموو ڕۆژێک دەرگای ژووری سەرنووسەرم لە گرێژەنە دەرهێنابوو و وتارانبارانم کردبوو، ئەو داماوەش ناچار بوو "ڕێژنە قەڵەم"ی قۆڕی من سەرلەبەر بخوێنێتەوە و ڕای خۆی بڵێت...

هەرچۆنێک بێت بەرەو گەڕەکی **هۆمانس بیۆن**[1] کەوتمەڕێ. **هانس پۆلی پترسن**، خوێندکارێکی لادێیی بوو، لە بینایەکی چوارنهۆمی ژوورێکی ژێرسەقفی بە کرێ گرتبوو، هەرچەندە ئاشکرا بوو کەسێکی بێ پارە و دەستکورتە، بەڵام ئەوەندە جوامێر و دەستکراوە بوو، کە ئەگەر تەنیا یەک کرۆن پارەشی هەبوایە دەیبەخشی، بەڕادەیەک لەمە دڵنیا بووم، وەک ئەوەی یەک کرۆنەکەم لە ناو دەستدا بێت، بەدەم ڕێوە لە زەوقی پارەکە ئۆقرەم لێ بڕابوو، دڵنیا بووم پارەکەم دەداتێ، کە گەیشتمە بەردەم بیناکەی، بینیم دەرگا داخراوە، بەناچاری زەنگی دەرگاکەم لێدا، کە ڕۆیشتمە ژوورەوە وتم:

- "دەمەوێ بەڕێز **پترسن**ی خوێندکار ببینم، ژوورەکەشی دەزانم."

کارەکەری ماڵەکە وەڵامی دایەوە:

- "وتتان بەڕێز **پترسن**ی خوێندکارە؟ هەر ئەوە نییە لە ژووری ژێر سەقفەکە دەژی! بەڵام ئەو لێرە ڕۆیشتووە!"

کارەکەر نەیدەزانی بۆ کوێ ڕۆیشتووە، بەڵام بەر لە ڕۆیشتن تکای لێ کردبوو، کاغەزەکانی بۆ ناونیشانی "شەقامی گومرک، ماڵی **هێرمانسن**" بنێرێت، هەڵبەت کارەکەرەکە ژمارەکە ماڵەکەشی پێدام.

دڵگەرم و پڕ ئومێد ڕێک بەرەو **شەقامی گومرک** ڕۆیشتم، بۆ ئەوەی **هانس پۆلی** بدۆزمەوە، ئەمە تەنیا ڕێگەچارە بوو، لە ناو ڕێگەکەدا بە بەردەم بینایەکی تازەسازدا تێپەڕیم، لای شۆستەکە دوو دارتاشم بینی، کە خەریکی سمارتەکردنی تەختە بوون. لە ناو وردەدارەکان دوو تەلاشی بریقەدارم هەڵگرت، یەکێکیانم خستە دەممەوە و ئەوی دیکەم شاردەوە دواتر بیخۆم و کەوتمەڕێ! لەتاو برسێتی ناڵەناڵم بوو، لە بەردەم نانەواکە نانێکی زۆر گەورەم بینی، کە بە دەرگاکەوە هەڵواسرابوو، نرخەکەی دە ئۆرا بوو. بەڕاستی ئەوەندەی دەهێنا!

- بەڕێز! ماڵی بەڕێز **پترسۆن**ی خوێندکار لە کوێیە!

---

[1] Homansbyen: یەکێک لە گەڕەکەکانی ئۆسلۆ کە چینی ناوەڕاستی لێ دەژی. (و.ف)

فەرموون بۆ کۆلانی **بریێنت ئانکەر** ژمارە ١ نهۆمی سەرەوە، ژووری ژێر سەقفەکە[١]...

ئێستا دوودڵم بڕۆم یان نا؟ چەند باش بوو ئەگەر لانیکەم ئەو چەند کاغەزەی بۆیان ناردبوو، دەمهێنا و پێم دەدا، بۆ ئەم مەبەستە بە هەمان ڕێگەدا هاتبووم گەڕامەوە بۆ شار، دیسان بە بەردەم دارتاشەکاندا دەڕۆمەوە، ئەمجارە ئەوان مەنجەڵی گەرمی پڕ لە خواردنی خۆشیان لە **میوانخانەی گشتی** وەرگرتبوو و خستبوویانە سەر ئەژنۆیان، سەرقاڵی خواردنی بوون، کە بە بەردەم نانەوایەکدا تێپەڕیم، نانە گەورەکە هێشتا لە شوێنی خۆی مابوو، دواجار لەگەڵ ئەوەی لە برسا و لاوازیدا نیوەگیان بووم، دەگەمە کۆلانی **بریێنت ئانکەر**، دەروازەی بیناکە کراوەیە. هێزی سەرکەوتن بەم پلیکانە سەخت و ناڕێکانە تا دوانهۆم دەدەمە بەرخۆم، کە دەگەمە ئەوێ بۆ ئەوەی هەواڵێکی خۆشم بۆ **هانس پۆلی** هێنابێت، بە دەستی بەتاڵ نەڕۆیشتبم، کاغەزەکان لە گیرفانم دەردەهێنم و ئامادە دەیگرم بە دەستمەوە، دڵنیام پاش ئاگاداربوون لە دۆخی ژیانی وێرانم، چی لە دەست بێت دەیکات، جگە لەوەش چەندین جار وتبووم **هانس پۆلی** پیاوێکی دەستودڵ کراوەیە. کارتێک بە دەرگای ژوورەکەی هەڵواسرابوو، لە سەری نووسرابوو: **هـ. پ. پترسۆن** خوێندکاری زانستە ئاینییەکان... و لە ژێر کارتەکە بە قەڵەم نووسرا بوو "بۆ بینینی خێزانەکەی سەفەری کردووە." هێز لە ئەژنۆمدا نەما، مەنگ و ماندوو هەر لەوێ دانیشتم، چەند جارێک لە خۆمەوە دەڵێم "بۆ بینینی خێزانەکەی ڕۆیشتووە... بۆ بینینی خێزانەکەی ڕۆیشتووە" و دواتر دەنگم لێوەنایەت، حەپەساو و سەرلێشێواو چاو دەبڕمە پیتەکانی

---

[١] Attic room: زۆربەی ماڵەکانی وڵاتانی خۆرئاوا، بەتایبەت ئەو ناوچانەی باران زۆر دەبارێت، سەقفی ماڵەکان بە شێوەی قوچەکی دروست دەکەن. ژووری ژێر سەقف ئەو ژوورەیە ڕێک دەکەوێتە ژێر ئەم سەقفە قوچەکییەوە و دەکاتە دواژووری سەرەوەی ماڵەکە. (و.ک)

کارتەکە و جووڵە ناکەم. دەتوت هەستم لە کار دەکەویت. سەرم خاڵی بوو و یەک دڵۆپ فرمێسکیش نەدەهاتە چاومەوە، دە یان بیست خولەک، ڕەنگە زیاتریش، تێپەڕی و بێ ئەوەی پەنجە بجوڵێنم هەر لەوێ دانیشتبووم، حاڵەتێکی سڕی و سستی وەک سەرخەوشکاندنم تووش بووبوو، دەنگی پێیەک لە سەر پلیکانەکان دەبیستم و دەڵێم:

- "ئیشم بە بەڕێز پترسەنی خوێندکارە، مەگەر لە ماڵ نییە؟... دوو کاغەزم بۆ هێناوە."

ژنێک کە بە پلیکانەکاندا سەردەکەوت وەڵامی دایەوە:

- "ڕۆیشتووە خزمەکانی ببینێت.. دوای پشووەکان دەگەڕێتەوە؛ دەکرێ کاغەزەکان بدەنە من..."

- زۆر سوپاس، زۆر باشە، کەواتە دوای گەڕانەوە دەگاتە دەستی، ڕەنگە لە پاکەتەکەش شتێک هەبێت، کەواتە خواحافیز!"

هەر کە هاتمە خوارەوە دەستم قونجاند، بە دەنگی بەرز و ئاشکراوە دەڵێم "ئەی خوای بەخشندە و میهرەبان! دەڕۆم لە هەموو شوێنێک هاوار دەکەم، تۆ هیچ نیت جگە لە لیبۆکێک!" دواتر سەر بەرەو هەورەکان بەرز دەکەمەوە و بە ددانی جیڕ و توڕەوە دەنەڕێنم، بە کفر نەبێت تۆ تەنیا لیبۆکیت! چەند هەنگاوێک ڕۆیشتم و دیسان وەستام، یەکسەر بێتاقەت حاڵم دەگۆڕێت، دەستەکانم وەک ڕازونیازێک پێکەوە گرێ دەدەم و سەرم لار دەکەمەوە و بە دەنگێکی نەرم و پڕسۆز و بەزەییەوە لە خۆم دەپرسم: ئەی بەندەی داماو، ئایا تا ئێستا ڕووت کردۆتە خوا و شتێکت داوا کردووە؟ بەڵام شێوازی خوتبەکە باش نەبوو، دەبێ ناوی هەق بەرز ڕاگریت، دەبێ بانگێکی زوڵاڵ و بەهێز وەک بڵندی و شکۆی کڵێسا، بکەیت! هاوار دەکەم ئەی بەندەی ونبوو ئایا هیچت لە خودا خواستووە نەهاتبێتە دی؟ سەرم دانەواند و بە دەنگێکی خەمگین وەڵامی دەنگی خۆم دایەوە نا، نا تۆ هەرگیز خودات بانگ نەکردووە؟ بەڵام دیسان دەبینم ئاوازی بانگکردنەکەم باش نییە، ئای چ شێتێکی! هێشتا فێری ڕیاکاری

نەبوویت و نازانی دەبێ حاڵەتی بەزەیی و کڕوزانەوە وەربگریت و بە ئاوازێکی خەمینەوە بڵێی: بەڵێ ئەم بەندە داماوە، جارەها خواوەندی بەخشند و باوکی میهرەبانی ئاسمانی بانگ کردووە و هەرگیز لێی غافڵ نەبووە؛ باشە، ئاوا بیڵێ، ئاوا زۆر باشترە. ئاخر دەبێ ئاهێک لە دڵەوە بێت و شین و ڕۆڕۆ بکەی، دەبێ وەک ئەسپێک کە لەتاو ئازار دەگلێت، بحیلێنی. بەدەم ڕۆشتنەوە وانەم بە خۆم دەوتەوە و ڕاهێنانم دەکرد، کە نەمدەتوانی ڕێنماییەکانی خۆم جێبەجێ بکەم، بە بێتاقەتی و شڵەژانەوە، قاچم بە زەویدا دەکێشا، لە بەردەم هەموو خەڵکی، کە ئاوڕیان دەدایەوە و حەپەساو سەیریان دەکردم، خۆم بە گەمژە و گێل بانگ دەکرد.

پووشوپەلاشەکەم خستبووە دەمەوە و دەمجووی، بەوپەڕی خێراییەوە بە لەترلێدانەوە بە کۆلان و شەقامەکاندا دەگەڕام، لەناکاو هەستم کرد گەیشتوومەتە مەیدانی **ئاسنەڕێ**، بەپێی سەعاتەکەی **ئۆرفێلسرن** یەکونیوی عەسر بوو، ماوەیەک وردبوومەوە و چوومە ناو بیرکردنەوەوە، لەبەر ماندوویی دڵۆپە ئارەق لە ناوچاومەوە دەڕژایە ناو چاوم.

بە خۆم وت "ئەگەر کاتت هەیە برۆ لای دەریا و پیاسەیەک بکە!" داچەمیمەوە و لە شەقامی **ئاسنەڕێ**وە بەرەو خوارەوە خل بوومەوە، کەشتییەکان لە شوێنی خۆی لەنگەریان گرتبوو، ئاوی دەریا لە ژێر هەتاودا چینچین دەبوو! جموجۆڵ و چالاکی لە هەموو لایەکەوە دەبینرا، شاورەکان دەنگیان دەهات، حەماڵەکان باری قورسیان لە سەرشان بوو و دەجوولان، دەنگی کەیفخۆشیی دەریاوانەکان، کە بەلەمەکانیان بە گوریس ڕادەکێشا، بەرگوێ دەکەوت، نزیک لە من ژنێکی شیرینیفرۆش دانیشتووە و لووتە ڕەشباوەکەی بە سەر سینییەکەیدا شۆڕ کردۆتەوە، مێزە بچووکەکەی بەردەمی پڕە لە شیرینی. هەر کە بینیم بە ڕقەوە ڕووم وەرگەڕاند، بۆنی خواردن بە هەموو شەقامەکەدا بڵاو بۆتەوە، پف پف لەم بۆنە! پەنجەرەکان

بکەنەوە! ڕووەدەکەمەوە کابرایەک کە لام دانیشتووە و بە قووڵترین شێوە ڕقی خۆمی بۆ دەردەخەم و دەڵێم:

- "سەیری هەر سوچێکی شەقامەکە بکەیت پڕە لە سینی و مێزی شیرینی، هەموو شوێنەکانیان گرتووە، ئەمە کەی وەزعە! ئاخر دەبێ شتێک بکەین کە..."

بەلام پیاوە داماوەکە بەڕادەیەک گومانی لێکردبووم، کە تەنانەت نەوەستا قسەکانم تەواو بکەم و هەستا و ڕۆیشت، منیش لە جێگەکەم هەستام و دوای کەوتم، چونکە دەمویست گومانەکەی نەهێڵم و وتم:

- "دەبینن تەنانەت بۆ پاراستنی تەندروستیی گشتیش بووە..."

پیاوەکە تۆقی و وتی:

- "ببورە من بیانیم و ئاگام لە ڕێنمایی تەندروستیی گشتی نییە..."

دەی برا، دەی ئەگەر بیانییە منیش سوور نیم لەسەر قسەکانم! ئایا دەیەوێت یارمەتی بدەم؟ ئایا حەز دەکات شوێنە خۆشەکانی شاری نیشان بدەم؟ بێگومان داوای پارەی لێ ناکەم و زۆریشی پێخۆش دەبێت...

بەلام پیاوەکە گوێی لەم قسانە نەبوو، بەوپەڕی هێزی خۆیەوە دەیویست لە چنگم دەرباز بێت و بە هەنگاوی درێژ لە شەقامەکە بپەڕێتەوە، لەم کاتەدا پیانۆیەکی میکانیکی کە کەمێک دوورتر لە من دەنگی لێ بەرزبووەوە زیاتر بێتاقەتی کردم، ئاوازێکی وشکی هەبوو، کە وەک تەنەکەی ژەنگاوی دەنگی دەدایەوە و پارچەیەکی ڤێبەری[1] دەژەند و لەگەڵیدا کچێکی منداڵ گۆرانییەکی خەمگینی دەوتەوە، دەنگی ئامێرەکە وەک ناڵەی کلارنێت دڵتەنگ بوو و کاری لە ڕەگوبنی مرۆڤ دەکرد، لەرزەیەک کەوتە گیانمەوە، کەمەکەم پاڵم بە کورسییەکەوە دا، ئاهم هەڵدەکێشا و لە بەرخۆمەوە ئاوازەکەی ڤێبەرم دەوتەوە. جا سکی برسی خەیاڵی چی ناهێنێت! کەمکەم مۆسیقاکە

---

[1] Weber: ئاوازدانەری ڕۆمانتیکی ئەڵمانیا. (و.ف)

دەمبات و دەتوێمەوە تیایدا، وەک ئەوەی ئاو بم و ڕژابێتمەوە جۆگەلەوە، هەستم دەکرد کەوتوومەتە سەر هەوا، سووکەڵەم و بە سەر کوێستانەکاندا دەفڕم؛ لە فەزایەکی نوورانیدا سەما دەکەم، لەم کاتەدا کچە منداڵەکە جامۆڵکە کانزاییەکەی خۆی هێنایە پێشەوە و وتی:

'بێزەحمەت ئۆرایەک، ئۆرایەک بدەن!'

منیش لە خۆمەوە هەستام گیرفانەکانم ژێراوژوور کرد و وەڵامم دایەوە بە سەرچاو هەر ئێستا! بەڵام کچەکە وادەزانێت گاڵتەی پێدەکەم، بێ ئەوەی هیچ بڵێت دوور دەکەوێتەوە، لەم کاتەدا ڕازیبوون و بێدەنگییەکەی، قورس کاری لێکردم، ئەگەر جنێوی بدایە هەزارجار خۆشتر بوو، پەست و بێتاقەت بووم و کچەکەم بانگ کرد و وتم:

'جارێ یەک فلسم نییە، بەڵام لە بیرم ناچێت و دواتر، ڕەنگە سبەی، پارەت بۆ دەهێنم، ناوت چییە؟ ئای لەو ناوە جوانە! قەت ئەم ناوەم لە بیر ناچێت، کەواتە سبەی یەکتر دەبینین!'

ئەگەرچی هیچی نەوت، تەواو تێگەیشتم باوەڕی بە قسەکانم نەکرد، فرمێسک لە چاومەوە هاتە خوار، کە بۆچی ئەم کچە بچکۆلە کۆڵانگەرە باوەڕی بە قسەکانم نییە، جارێکی تر بانگم کرد و بە خێرایی چاکەتەکەم داکەند تا هێلەکەکەمی پێ بدەم و وتم:

'کەمێک بوەستە، شتێکی ترت پێ دەدەم و هەقت بۆ دەکەمەوە.'

بەڵام لەپڕ تێگەیشتم هێلەکەکەم لە بەردا نییە، لە خۆمەوە ئەو هەمووە بۆ هێلەکەکەم گەڕام، هەر ئاگام لێ نەبوو! چەندین هەفتەیە هێلەکەکەم لە دەست داوە، لەم کاتەدا نازانم چیم لێقەوما، ئەوەندەم زانی کچەکە حەپەسا و بەخێرایی بە لامدا دوور کەوتەوە، چاریش نەبوو جگە لەوەی وازبینم بڕوات، خەڵکی دەوریان گرتبووم و بە دەنگی بەرز پێدەکەنین، لەم کاتەدا پاسەوانێک خەڵکەکەی دوورخستەوە و لێم نزیک کەوتەوە و پرسی:

'چی بووە؟'

له وەڵامدا وتم:

- "هیچ نییە و نەبووە، تەنیا دەمویست هێلەکەکەم دابکەنم و بیدەمە ئەو کـچە گـۆرانیبێژە بیبـات بـۆ بـاوکی... دەمەوێ بـزانم ئەمە کـوێی پێکەنینـاوییە؟ ئەگەر خۆیشـم هـێلەکم لە بەردا نەبـوایە کێشـە نەبـوو، چونکە یەکسەر دەچوومە ماڵەوە و هێلەکێکی ترم لە بەر دەکرد."

پاسەوانەکە وتی:

- "لە ناو کۆڵان شوێنی ئەم گاڵتەجارییە نییە، دەی یەڵا بڕۆ!" شـانەکانی گرتم و پاڵی پێوەنام. لەپڕ هاواریشی کرد:
- "ئەم کاغەزوماغەزانە هی تۆیە؟"
- "بەڵێ، بەڵێ، وای وتاری ڕۆژنامەکەیە! نووسینێکی زۆر گرنگە!"
- بۆ ئاگات لە خۆت نییە؟

یەکسـەر نووسـینەکە وەردەگـرم و سـەیری دەکەم نەوەک پەڕەیەکـی ون بووبێـت، یەکسـەر بـێ ئەوەی گـوێ بە هـیچ شـتێک بـدەم بەرەو ئۆفیسی ڕۆژنامەکە دەڕۆم.

بەپێـی سـەعاتی کڵێسـای **ڤۆرفێلسـرن**، چـواری پاشـنیوەڕۆ بـوو، کە گەیشتم ئۆفیسی ڕۆژنامەکە داخرابوو، وەک دزێکی ترساو بێدەنگ بە پلیەکاندا دەهـاتمە خـوارەوە و سـەرگەردان و بەرەڵا لە بەردەم دەرگا دەوەسـتم، ئێسـتا قـوڕی کـوێ بـکەم بەسـەرما؟ پـاڵ دەدەم بە دیـوارەکەوە و چـاو دەبـڕمە ئەرزەکە و بیـردەکەمەوە، دەرزیـیەک لە بەرپێم دەدرەوشێتەوە، دەنوشتێمەوە هەڵی دەگرم، ئەگەر قۆپچەکانی چاکەتەکەم لـێ بـکەمەوە و بیفرۆشـم چەنـد دەکـات؟ ئەم قۆپچـانە بە کەڵکی هیچ نایەت؛ قۆپچە هەر بۆ قۆپچەبوون باشـە! دواتر بە چـاوی کڕیارێکەوە لە هەموو لایەکەوە سەیری قۆپچەکانم کرد، بینیم هێشـتا تازەن، لەگەڵ هەموو ئەمانەش بیرۆکەیەکی خراپ نەبوو، دەمتوانی بە تیغی قەڵەمدایەنەکەم بیبڕم و بیفرۆشم، بیـرۆکەی فرۆشـتنی ئەم پێنج قۆپچەیە ئازایەتی پێدام و بە خۆم وت ئێستا دەبینی چۆن کارەکـان بە باشی دەڕۆن، خۆشحاڵ بووم و دانەدانە دەسـتم کرد بە لێکردنەوەی

قۆپچەکان و بە خۆم دەوت هەڵبەت ئەوکاتەی چاکەتێک بێ قۆپچە بێت، وادیارە شتێکی نوقسانە، بەڵام ئەم بێتاقەتییە زوو تێپەڕ دەبێت... دە فەرموون ئەم قۆپچانە کۆنن؟ زۆر هەڵەن! کەس لەم دنیایەدا بە قەد من ئاگای لە قۆپچەکانی نییە و بە پاکوخاوێنی نایانپارێزێت، یەکێک لە سیفەتەکانی من ئەوەیە یان باشتر بڵێم؛ یەکێک لە عادەتەکانم ئەوەیە هەرگیز قۆپچەکانم داناخەم، نەخێر، نەخێر، ئێستا کە ناتانەوێ کێشە نییە... لانیکەم دەبێ دە ئۆرا بۆ ئەم قۆپچانە بدەن... ئای خوایە! ئەگەر ناتەوێ بڵێ نامەوێ و تەواو؟ زمانتان بگرن و وازم لێ بێنن! بەڵێ! فەرموون پاسەوانێک بانگ بکەن، من لێرە وەستام تا ئێوە پاسەوانێک بهێنن و ڕاشناکەم! هیچیش نادزم! زۆرباشە، قسەیەکی وامان نییە، فەرموو بڕۆن! ناوم تانگنە. دوێشەو تا درەنگان خەریکی ڕابواردن بووم... کەسێک لە پلیکانەکانەوە دێتە خوارەوە و لەپڕ لە دنیای خەیاڵەوە دەگەڕێمەوە بۆ واقیع، دەبینم کابرای **مقەست**ە و بەخێرایی قۆپچەکان دەخەمە گیرفانمەوە، بەجۆرێک نغرۆی سەیرکردنی نینۆکەکانییەتی، کە سووکوباریک بێ ئەوەی وەڵامی سڵاوەکەم بداتەوە بە بەردەممدا تێپەڕ دەبێت. دەڕۆمە بەردەمی و دەپرسم:

"سەرنووسەر هاتووە؟"

"هێشتا نەهاتووە."

ئالێرە بەوپەڕی ناشیرینی، کە تا ئەو کات لە خۆمدا نەمبینیبوو پیایدا هەڵشاخام و وتم:

"درۆ مەکە، کارەکەم زۆر گرنگ و پەلەیە و دەبێ لەگەڵ خۆی قسە بکەم، هەواڵێکم لە سەرۆکوەزیرانەوە هەیە و دەبێ زارەکی و بە ئامادەیی خۆی پێی بگەیەنم."

ناکرێ ئەم هەواڵە لە ڕێگەی منەوە پێی بگات؟

سەیرێکی هەموو گیانیم کرد و وتم:

"دە فەرمووا! بە تۆ بڵێم؟"

لەڕاستیدا پلانەکەم سەری گرت، یەکسەر دووقۆلی ڕۆیشتینە سەرەوە و دەرگای ژوورەکەی کردەوە، خۆم دۆڕاندبوو و بۆی ئەوەی ئازا بم ددانەکانم جیڕ کردەوە و لە دەرگام دا، ڕۆیشتمە ناو ژووری سەرنووسەرەوە.

هەر کە منی بینی بە ڕووخۆشییەوە وتی:

- "سڵاو، ئەوە ئێوەن؟ فەرموو دانیشن."

ئەگەر یەکسەر لە ژوورەکەی دەری بکردمایە زۆر باشترە بوو، چونکە زۆری نەمابوو بگریم و وتم تکایە بمبەخشن، بەڵام ئەو دیسان دووبارەی کردەوە:

- "فەرموو."

دانیشتم و ڕوونم کردەوە هاتومەتە خزمەتتان بڵێم، کە وتارێکی تازەم نووسیوە و پێم خۆشە لە ڕۆژنامە بڵاو بێتەوە و باسی ئازار و ناخۆشی نووسینی وتارەکەم بۆ کرد.

وتارەکەی لێوەرگرتم و وتی:

- "زۆرباشە، دەیخوێنمەوە! هەڵبەت ئێوە بۆ هەموو نووسینەکانتان زەحمەتێکی زۆر دەچێژن و ئازاری زۆری خۆتان دەدەن، بەڵام زۆر توند و گەرم و بە کەفوکوڵ دەنووسن، ناتوانن کەمێک نەرمتر و هاوسەنگتر بنووسن؟ چونکە ئیشەکانتان گەرم و پڕسۆزە، بەڵام هەر دەیخوێنمەوە".

ئەمەی وت و گەڕایەوە بۆ لای مێزەکە، مات و حەپەساو نەمدەزانی بڵێم چی، بەم حاڵەوە دەکرا داوای کرۆنێکی لێ بکەم؟ ئایا دەکرا ڕوونی بکەمەوە بۆچی هەمیشە پڕسۆز و پڕکەفوکوڵ دەنووسم؟ یەکەمجار نەبوو قسەی لەگەڵ بکەم و بێگومان ئامادە بم یارمەتیم بدات.

هەستام، بەڵام بیرم هاتەوە دواجار کە بینیم بە دەست بێ پارەییەوە دەینالاند، تەنانەت ژمێریارەکەشی بۆ وەسڵی چەند حسابێک ڕەوانە کرد، کە ڕەنگە شتێکی کەمم پێ بدات، ڕەنگە ئەمڕۆش ئەوە ڕووبدات،

بەڵام نا، ئەمڕۆ ئەم شتانە ڕوونادات! مەگەر کوێرم نیم و دەبینم خەریکی ئیشەکانییەتی؟ لێی پرسیم:
"کارێکی ترتان نەبوو؟"
بە پێداگرییەوە وتم:
"نەخێر هیچ قسەیەکی ترم نەبوو، بەڵام کەی بێمەوە خزمەتتان بۆ وەڵامەکەی؟"
هەر کات ڕێگەتان کەوتە ئەم ناوە سەردانێک بکەن، بۆ نموونە دوو ڕۆژی تر."
لە کۆتاییدا نەمتوانی داواکەم بڵێم، چونکە میهرەبانی و گەورەیی ئەو دەمی داخستبووم و شەرمەزاری و بێدەنگی دەکردم. ئەگەر لە برسا بمردمایە، داوای وام نەدەکرد، تەنانەت ئەوکاتەی کە هاتمە دەرەوە، لەگەڵ ئەوە برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیبووم، بە هیچ شێوەیەک پەشیمان نەبووم، کە داوای کرۆنێکم لێ نەکرد، پووش و تەڵاشی گیرفانم دەرهێنا و خستمە گیرفانم، کەمێک هێمن بوومەوە، بۆچی زووتر ئەمەم نەکردبوو؟ قسەم بە خۆم وت شەرم بکە، بیرت لەوە نەکردۆتەوە بە داواکردنی کرۆنێک ئەم پیاوە نازدار و بەڕێزە بخەیتە مەترسییەوە؟ خۆم بە توندی سەرکۆنە کرد، کە بۆچی بیرم لە شتێکی وا دزێو و نائاسایی کردۆتەوە، خۆم بە قورسی حوکم دەدا و دەموت ئەی بێویژدان بەتەمای چی بووی؟ لەبەرئەوەی تۆی سەگی پیس پێویستت بە کرۆنێک بوو، دەتویست بەو پیاوەدا هەڵشاخێی و چاوی دەربکەی، یەڵا دەی بڕۆ! خێرا! تەمەڵی بێحەیا! ئەمانە یانی چی؟ دواتر بۆ ئەوەی خۆم تەمێ بکەم، دەستم کرد بە ڕاکردن، بە غار کۆڵان و شەقامەکانم تەی دەکرد و قسەم بە خۆم دەوت، هەر کات توانام نەدەما و مەیلی وەستانم دەکرد، بەوپەڕی تووڕەییەوە بە گژ خۆمدا دەچوومەوە، لە کەینوبەینەدا گەیشتمە سەرەوەی کۆڵانی پایل، بەناچاری وەستام، چونکە ئیدی توانای ڕاکردنم نەبوو و زۆری نەمابوو بگریم، هەموو گیانم دەلەرزی و ئەوەندە شەکەت بووم لە

بەرپلیکانەی ماڵێکدا کەوتم، فەرمانی وەستانم بە خۆم دا، بۆ ئەوەی باش ئازار بچێژم، بە یەک جووڵە هەستام و خۆم ناچار بە وەستان کرد، لەم کاتەدا بە خۆم پێدەکەنیم و چێژم لەو ماندووییە زۆرەم وەردەگرت، ماوەیەکی زۆری خایاند کە بە جووڵەی سەر مۆڵەتی دانیشتنم بە خۆم دا، بەڵام دیسان ناخۆشترین شوێنی سەر پلیکانەکانم هەڵبژارد، ئەی خوایە چەند خۆشە ئیسراحەت! دەموچاوم سڕی و بە هەناسەی قووڵ هەوای پاکم هەڵمژی، چەند زۆر ڕام کردبوو! بەڵام پەشیمان نەبووم چونکە خۆم بە شایستەی ئەم سزایە دەزانی، ئەمە چ هەڵەیەکە داوای کرۆنێک لە کابرایەکی بێگانە بکەم، دەی بخۆ دەردت بێت! دیسان لە بەرخۆمەوە قسەم کرد، وەک دایکێک کە دەیەوێت ئامۆژگاریی منداڵەکەی بکات، خۆم سەرکۆنە کرد، هەستەکانم بە جۆرێک شڵەژا بوو و ماندوویی و داهێزران بە جۆریک لە پەلوپۆی خستبووم، کە لەخۆمەوە کەوتمە گریان، بەڵام گریانەکەم شاراوە بوو و یەک دڵۆپ فرمێسکم نەدەڕشت، گریانەکەم لە خەمێکی نادیار و بێدەنگ دەچوو، نزیکەی چارەکێک و ڕەنگە زیاتریش لەوێ و بەوحاڵەوە مامەوە، خەڵکی دەهاتن و دەڕۆیشتن و کەس گوێی پێ نەدەدام، منداڵەکان لە چواردەورم یارییان دەکرد، باڵندەیەک لە سەر لقە دارێک لەوسەری کۆڵانەکە دەیجریواند.

پاسەوانێک هاتە نزیکم و وتی:

- "بۆچی دانیشتووی؟"

پرسیم:

- "دەفەرمووی بۆچی لێرە دانیشتووم؟ هەر بە هەوەس!"
- "نیوسەعاتە چاودێریتان دەکەم و دەبینم هەر لێرە دانیشتووی."

وتم:

- "بەڵێ، هەر ئەوەندە دەبێت، بەڵام فەرمایشتەکان چییە؟"

دواتر پەست و تورە هەستام و ڕۆیشتم.

که گەیشتمە بازاڕ وەستام و سەیری بەردرێژی شەقامەکەم کرد، ئاخر "هەر بە هەوەس" کەی وەلامە؟ دەبوو سەرکز بم و بلێم ماندووم، لاوازم و لەتاو برسێتی و لێقەومان لێرە پەکم کەوتووە.
بەڕاستی گوێرەکەیت و ناتوانی فێری دووڕوویی بیت! هەقی خۆتە وەک ئەسپێکی بریندار بنالێنی.
که گەیشتمە وێستگەی ئاگرکوژێنەوە، لەپڕ بیرۆکەیەک هات بە خەیاڵمدا و دیسان وەستام، پەنجەکانم تەقاند و بە جۆرێک دەستم بە پێکەنین کرد، که ڕێبوارەکانی ئەو ناوە هەستیان پێکرد، بە خۆم وت ئێستا دەبێ بڕۆی بۆ لای لۆیزن ی قەشە، تف لە ڕووت ئەگەر نەڕۆی! هەر بڕۆ هیچ نەبێ تاقی بکەرەوە، هەوا خۆشە و ڕۆیشتن بۆ لای ئەویش هیچ زەرەرێکی نییە.
دواتر ڕۆیشتمە نێو کتێبفرۆشیی پاشاوە، لە دەفتەری زانیارییەکانەوە ناونیشانی قەشەکەم دۆزییەوە و کەوتمەڕێ. بە خۆم وت ئەمجارە ئیتر گاڵتە هەڵناگرێت، خۆت بێ ئەقڵ مەکە، گەمژەیی مەنوێنە! باسی ویژدان مەکە و واز لە منالبازاڕی بێنە، تۆ لەوە داماوتر و لێقەوماوتری بەرگەی ویژدانت بگریت، سەرەتا دەبێ بڵێی برسیتە، مەگەر وانییە؟ بۆ کارێکی گرنگ هاتووی و دەبێ ملت لار بکەیتەوە و دەنگێکی تایبەت، ئاوازێکی پرسوێ و کاریگەر دەربکەیت، ئێستا ئەمە بکەیت باشترە دەنا وازت لێ دەهێنم و یەک هەنگاویش لە بەرژەوەندیت نایەمە پێش، باش لە بیرت بێت و دواتر چیت بەسەرهات خۆت بەرپرسیت، بارودۆخی تۆ زۆر خراپە، تۆ گیرۆدەی تاریکیت و دەستت ناوەتە بینی ڕۆحە بەدکارەکان، شەڕێک که لەگەڵ ئەم بوونەوەرە سامناکانە بەرپێتخستووە تۆقێنەرە! تینووتە، برسیتە، شیر و شەرابت دەوێت و نیتە، تەماشاکە و بزانە چ ژیانێکت هەیە و گەیشتویتە کوێ، هەناسەت لێبڕاوە و هێشتا هیوات بە سۆز و میهرەبانی خوا هەیە. سوپاس بۆ خوا که هێشتا ئیمانت ماوە، بە جۆرێک باوەڕت بە خوا هەیە و کەمەندکێشی هەق بوویت، که دەست

بۆ نزا هەڵدەبڕێت و چارەی کێشەکەت لە خوا دەخوازێت، ئەگەرچی بێبەریت لە ماڵوسامانی دنیا، بەلام کتێبی زەبورت[1] خۆش دەوێت، چونکە کتێبێکی پڕ و دانسقەیە و نرخەکەشی تەنیا دوو کرۆنە...

بەهەرحاڵ، کە گەیشتمە بەردەم ماڵی قەشەکە وەستام، لە سەر دەرگاکە نووسرا بوو "نووسینگەی کار تا چواری پاشنیوەڕۆ کراوەیە"، ئێستا خۆت بێ ئەقڵ مەکە، مەسەلەکە گاڵتە نییە دەی یەلا ملت لار بکەرەوە! دەی کەمێک زیاتر لاری بکەرەوە! ئەمەم لە دڵی خۆمدا وت و لە زەنگی دەرگاکەم دا.

کارەکەر هات و وتم:

- "دەمەوێ قەشەکە ببینم."

بەلام چیم کرد ناوی خوام بۆ نەخرایە ناو ئەو دێڕەی کە وتم.

کارەکەر وتی:

- "تەشریفیان بردۆتەوە دەرەوە"

ئەی هاوار قەشەکە لە ماڵ نییە! ڕۆیشتۆتە دەرەوە! پلانەکانم بوونە بڵقی سەرئاو، هەموو ئەو دێڕانەی دروستم کردبوون و دەمویست پێی بڵێم لەناوچوون، کەواتە ئەم ڕێگە دووروودرێژەم لەخۆڕا بڕیبوو، ئەم هەموو زەحمەتە سوودی چی بوو؟ کارەکەر پرسی:

- " کارێکی تایبەتتان هەبوو؟"

- "بە هیچ شێوەیەک، هەوا زۆر خۆشە وتم سلاوێکیان لێ بکەم."

هەر دووکمان سەیری یەکترمان دەکرد، بە ئەنقەست سینگم دەرپەڕاند بۆ ئەوەی سەرنجی بەرەو دڕاوی چاکەتەکەم ڕابکێشم و دەمویست لە حاڵەتی سەیرکردنمەوە تێبگات بۆچی هاتبووم، بەلام ئەو داماوە هەر لە مەبەستم تێنەگەیشت.

---

[1] مەزامیری داوود کە بەشێکە لە کتێبی پیرۆز و سرووودە ئایینیی جوو لە خۆ دەگرێت، وشەی Mammonش کە مەبەست لێی دەسەلات و هێزی حکومەتە، بە ماددییات لێک دراوەتەوە. (بگەڕێنەوە بۆ ئینجیل بە گێڕانەوەی مەتیو- دەروازی شەشەم- ئایەتی ٢٥). (و.ف).

"بەڵێ هەوا زۆر نایابە! کەواتە خانمیش لەماڵەوە نییە؟"
"با، لەڕاستیدا خانم ئێسقانیان ئازاری هەیە و توانای جوڵەیان نەماوە و لە جێگە کەوتوون، هیچ پەیامێکتان نییە بۆی؟"
" نەخێر هیچ پەیام و قسەیەکم نییە، ناوبەناو بۆ ڕەواندنەوەی ماندوویی پیاسەم دەکرد، بەڕاستی پیاسە دوای نانی نیوەڕۆ چەند خۆشە!"

دیسانەوە کەوتمەڕێ! هەستم کرد بە زماندرێژی و زۆربلێیی هیچم دەست ناکەوێت، سەریشم گێژ دەبوو و زۆری نەمابوو بکەوم، هەموو دەروونم پەرش بێتەوە. نووسینگەی کاری قەشەکە تا چواری پاشنیوەڕۆ کراوە بوو، من سەعاتێک درەنگتر هاتبووم و زەمەنی خێر و بەخشندەیی کۆتایی هاتبوو. ڕۆیشتم بۆ مەیدانی بازاڕی گەورە و لە سەر کورسییەکی نزیک کڵێسا دانیشتم.

خوایە، داهاتوو تا دواسنوور لە بەرچاوم ڕەش و لێڵ بووە! بە جۆرێک ماندووبووم توانای گریانم نەبوو، بەرزترین پلەی ئازارم دەچەشت و برسی و بێجووڵە دانیشتووم، توانای هیچم نەماوە، هەستم دەکرد گڕ لە سینگم بەرزدەبێتەوە و ئازارم دەدات، خواردنی پووش سوودی نەبوو و شەویلگەکانم کە بەو کارە بێسودە ماندوو بووبوو، لەوە زیاتر خۆم ناخەمە زەحمەتەوە و شەویلگەم شۆڕ کردەوە، خۆم دایە دەست خوا و دواتر پارچە توێکڵێکی پرتەقاڵی سەر ئەرزەکەم هەڵگرت و خواردم، تەواو تێکی دام و هێڵنجم دەهات، دەمارەکانی مەچەکی دەستم شین هەڵگەڕابوون و ئاوسابوون.

ئێستا دەبینم بەڕاستی چەند کاتم بەفیڕۆ داوە، بەدرێژایی ڕۆژ بۆ کرۆنێک بەملاولادا سوڕابوومەوە، بۆچی؟ تەنیا بۆ ئەوەی چەند سەعاتێک زیاتر زیندوو بم، جیاوازی چییە ڕۆژێک درەنگتر یان زووتر بمرم؟ ئاقڵانەترین کار ئەوەیە لەبری ئەم هەموو ڕاکەڕاکەیە، پێش ئەوەی زیاتر پێڵاو بدڕێنم، بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە و ڕابکشێم و خۆم بدایە دەست چارەنووس، بەڵام لەو کاتەدا هەستم باش کاری

دەکرد و مردنم نزیک دەبینی، بەڵێ وەرزی خەزانە و سروشتیش ڕۆیشتۆتە خەوی مەرگەوە، هەموو کەرەستەیەکم بەکار هێنابوو، چار نەما تاقی نەکەمەوە، بەم بیرکردنەوانەوە ویژدانم ئاسوودە و هەستەکانم هێور دەکردەوە، لە هەموو ئەگەرەکانی ڕزگاربوون خۆم دەبوارد و دەمووت: "تۆ چ شێتێکی! هێشتا نازانی ماوەیەکی زۆرە مردنی تۆ دەستی پێکردووە؟"

ئێستا کاتی ئەوەیە کارەکانم ڕێکوپێک بکەم، چەند نامەیەک بۆ ناسیاوەکانم بنێرم و ئامادە بم بۆ مردن! پێش مردن دەستودەموچاوم باش دەشۆم و جێخەوەکەم باش ڕێک دەکەم، کاغەزی سپی دەخەمە ژێر سەرم... ئەگەر کاغەز نەبێت پاکترین شت دەخەمە ژێر سەرم، بۆ نموونە کێشە چییە ئەگەر بەتانییە سەوزەکەم بخەمە ژێر سەرم؟... بیرکردنەوە لە بەتانی یەکسەر لە خەو هەڵیساندم و تەواو هۆشیاری کردمەوە، سەرم گەرم بووبوو، دڵم پەلەپەل لێی دەدا! لە سەر کورسییەکە هەڵدەستم و دەست دەکەم بە هەنگاونان، گیانێکی تازەم بە بەردا دێتەوە و بزاوتی ژیان بە دەمار و بوونمدا دەگەڕێتەوە، وەک ئەوەی بەدوای ونبوویەکدا بگەڕێم، زیاتر و خێراتر هەنگاو دەنێم و لە بەرخۆمەوە بەردەوام دەڵێم بەتانییە سەوزەکە! بەتانییە سەوزەکە! ماوەیەک دواتر دەبینم لە دووکانی تەنەکەچییەکەدام، بێ ئەوەی لەو بڕیارەی داومە دڕدۆنگ بم، ڕێک بەرەو چرپاکەم دەڕۆن، بەتانییەکەی **هانس پۆلی** هەڵدەگرم و لوولی دەکەم، ئەمجارە زۆر دوورە ڕێگەی ڕزگاری بگات، کۆتوبەندی ئەخلاقی دێنە خەیاڵمەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک کارم لێناکەن و خۆم لە سەرەوەی ئەو شتانە دەبینم، ئێستا ئیدی پشت دەکەمە هەموو ئەم ترۆهاتانە، مەگەر من بێگوناهم یان بەڕاستی مرۆڤێکی زاهید و وشکەدیندارم، کە ئەم بیرکردنەوانە ڕێگەم لێ بگرن؟ ئیشەکەم لە ڕووی لۆجیک و ئەقڵەوە لە جێی خۆیەتی، بەهەرحاڵ بەتانییەکەم خستە بن باڵمەوە و بەرەو کۆلانی ستنەر ڕۆیشتم. لە دەرگام دا و ڕۆیشتمە تەلارێکی گەورە، کە

بۆ یەکەمجارە پێ دەنێمە ناوی و پێشتر نەمبینیبوو، زەنگێک کە بە سەرەوەی دەرگای چوونەژوورەوەدا هەڵواسرابوو، چەندجار بە دەنگی ناخۆش دەنگی هات، لەم کاتەدا کەسێک لە ژووری تەنیشتەوە دێت و لە پشت مێزەکەوە دەوەستێت، دەمی پڕ و خەریکی جووینی پارووەکەیەتی، ئەوسا دەڵێم:

"زۆر گرنگ نییە دەمەوێ چاویلکەکەم بخەمە ڕەهنەوە، ئەگەر بکرێت لەبری ئەوە نیو کرۆنم بدەنێ، ئیشەڵا چەند ڕۆژێکی تر وەری دەگرمەوە."

"فەرمووتان چوارچێوەی چاویلکەکە کانزاییە؟"

"بەڵێ."

"نەخێر نابێت.

"هەڵبەت ئەگەر ئێوە دەڵێن نابێت کەواتە ناکرێت، مەبەستی منیش گاڵتە بوو، بەڵام بەتانییەکم هەیە کە ماوەیەکی زۆر بەکاری ناهێنم، ڕەنگە بتوانن لێم ڕزگار بکەن."

وەڵامی دایەوە:

"بەداخەوە ئێمە خۆمان یەک مەخزەنی پڕ لە بەتانیمان هەیە"

کە بەتانییەکەی کردەوە سەیرێکی کرد و بە دەنگێکی بەرز وتی:

"نەخێر ببورن ئەمە بە کەڵکی ئێمە نایەت!

هەڵبەت ئەمە رووکارە خراپەکەی بوو، کە پێم نیشان دان، ڕووەکەی تری زۆر باشترە."

"پێویست بە سەیرکردن ناکات، عەرزم کردن نامانەوێت، تەنانەت دە ئۆراش نادەم بۆ ئەمە، کوێتان پێخۆشە ببەن بۆ ئەوێ."

"بێگومان ئاشکرایە کە شتێکی بەنرخ نییە، بەڵام پێم وایە لە کاتی هەراج لەگەڵ بەتانییەکی نیوداش پێکەوە بیفرۆشن."

دوو جار وتی:

"نەخێر نامەوێت، لە خۆتانەوە مەوەستن، چونکە بەڕاستی دەبێ بە بار بەسەرمانەوە."

- "بیستوچوار ئۆرا."

دیسان وتی:

- "نەخێر بەڕێز گیان زۆرم لێ مەکەن، بە هەر نرخێک بووە هەڵی ناگرم، لەم جۆرە کەلوپەلانەم ناوێت لە دووکانەکەمان."

دیسان بەتانییەکەم خستەوە بن باڵم و هاتمەوە بۆ ماڵەوە، بە هیچ شێوەیەک گوێم نەدایە، کە شتێکی وا ڕووی داوە و سووکوباریک لە سەر چرپاکە ڕام خستەوە، دەمویست ئاسەواری ئەو تاوانە ناشیرینەی کردوومە لەناو ببەم، بێگومان ئەوکاتەی ئەم کارە ناشیرینەم لێ وەشاوەتەوە، ئەقڵم لە سەر خۆم نەبووە، مەحاڵ بوو ئەم کارە لە من بوەشێتەوە، تا زیاتر بیرم دەکردەوە کردنی ئەم کارە لە من دوور بوو، بێگومان لاوازییەکی ڕۆحی زاڵ بووە بەسەرمدا و هێزی بەرگریم نەماوە، بەهەرحاڵ بیرلێکراوە و بە دووپێی خۆم بەرەو ئەم داوە نەڕۆیشتبووم، تەنانەت سەرەتا تاڕادەیەک هەستم کرد پێ دەنێمە نێو تاوانەوە، هەربۆیە لە سەرەتا ویستم چاویلکەکەی خۆم دابنێم، بەهەرحاڵ، زۆر خۆشحاڵ بووم، کە ئەخێرەن ئەم تاوانە جێبەجێ نەکراو و دواهەمین ساتەکانی ژیانم لە گوناهەوە نەئاڵا، جارێکی تر لە ماڵەوە هاتمە دەرەوە و دیسان لە پاڵ کڵێسای **فۆرفێلسرن**، لە سەر کورسییەک دانیشتم، لەتاو ئەم شڵەژانە سەرم شۆڕدەبووەوە سەر سینگم، لە برسا بە ئازارەوە هۆشم لای خۆم نەمابوو، کات تێدەپەڕی، دەمتوانی سەعاتێکی تر بەو جۆرە بمێنمەوە، هەوای دەرەوە لە هەوای ژوورەوە ڕووناکتر بوو، هەناسەدان لە دەرەوە ئاسانتر بوو، کەمتر ئازارم دەچەشت، دەمویست تا زووە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، لە بەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە و سەرخەوم دەشکاند، زۆریش بێتاقەت بووم. دەنکەزیخێکی وردم لە سەر ئەرزەکە هەڵگرت و پاکم کردەوە و بۆ نەهێشتنی برسێتی خستمە دەممەوە و مژیم، بێدەنگ و بێجووڵە بووم، تەنیا دەمم دەجولا و تەنانەت چاوم نەدەتروکاند، خەڵک لە هاتوچۆدا بوون؛ دەنگی سمی

ئەسپەکان، جووڵەی ئەسپوعارەبانە و چپەچپی ڕێبوارەکان، بە هەوادا بڵاو دەبووەوە، باش بوو بۆ خستنەڕەهنی قۆپچەکان هەوڵێکی تر بدەم، هەرچەند هیچ سوودی نەبوو! لە لایەکی ترەوە بە جۆریک ماندوو بووم، کە تاقەتم نەبوو بجووڵێم، بەڵام کە هەستەکانم چڕ کردەوە، بیرم کەوتەوە دووکانی سووخۆرەکە لە سەر ڕێگەی ماڵەکەمە.

دواجار هەستام و بە هەنگاوی کورت و هێمن تەریب بە سێبەری دیواری شەقامەکە، بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتم. لە سەروو برۆکانمەوە هەستم بە کزانەوە دەکرد و تاکەم بەرز دەبووەوە، بەخێرایی دەڕۆیشتم، بە بەردەم نانەواییەکە کە نانە گەورەکەی پێشووم لێ بینیبوو تێپەڕیم، بە درۆ ڕێگەم لە خۆم دەگرت بوەستم، بەڵام کێشە چییە ئەگەر برۆمە ئەوێ و داوای پارچەیەک نان بکەم؟ ئەم بیرۆکەیە وەک بروسکەیەک بە مێشکمدا هات و بە خێرایش نەما، لە ژێر لێوەوە وتم قیروسیا نەڕۆیشتم و بەدەم سەرڕاوەشاندن و جنێودان بە خۆم، لە نانەواکە دوورکەوتمەوە، باش دەمزانی ویست و تەمەننایەکی بێئەنجامە. لە شوێنی **گوریسفرۆشەکان** عاشق و مەعشوقێکم بینی، کە لە ژێر دەروازەیەکی گەورە وەستاون و چپەچپیانە. کەمێک دوورتر کچێک سەری لە پەنجەرەکەوە دەرهێنا بوو، من بەڕادەیەک بە ویقار و هێمن دەڕۆیشتم، وەک ئەوەی بیر لە شتێک بکەمەوە، کچەکە لە بیناکەوە هاتە کۆڵانەکە و وتی:

"مامە گیان چۆنی؟ نەخۆشی؟ پەنا بە خوا بۆ وا ڕەنگت بە ڕووەوە نەماوە!" یەکسەر بەخێرایی ڕۆیشتە ژوورەوە.

یەکسەر وەستام، بۆ شێوەی من چی لێهاتووە؟ بەڕاستی شوێنەواری مردن لە دەموچاومدا دەردەکەوێت؟ بەرەو مردن دەڕۆم؟ دەستم بە ڕوومەتمدا هێنا و بینیم بەڕاستی لەڕولاواز بووم، گوویم وەک دوو چاڵی بەتاڵ و چۆڵ بوون، دیسان بە هەنگاوی کورت دەستم کردەوە بە ڕۆیشتن و دیسان وەستام، خوایە گیان، ڕەنگە زیاد لە پێویست

لەڕولاواز بوویێتم! ڕەنگە چاوم بەقووڵدا چوویێت، دەمویست بزانم شێوەم چی بەسەرهاتووە، بەڕاستی ئیتر ئەمە ئەوپەڕی گەمژەییە، مرۆڤ ئەوەندە خۆی برسی بکات ئاوا ناشیرین بێت، دیسان جارێکی تر تووڕەیی لە هەناومدا بلێسەی دایەوە، ئەمە دوا ڕووناکیی چرای ژیان و دوا شلەژانی زەلیلانەی من بوو، پەنا بە خوا شکڵوشێوەم چۆن بوو! حەیف نەبوو من بەو توانایەوە، کە لە سەرەتای دەرکەوتندا بوو، دوو قۆڵی بەهێز و ئەستوور، کە پاڵەوانێکی وردوخاش دەکرد، لە ناو خوێندەوارترین خەڵکانی کریستیانیدا، ئەوەندە برسێتی بچێژم، کە سەروفەسالّم لە شێوەی مرۆیی دەربچێت، ئەمە ماقووڵە و لەگەڵ هیچ لۆجیک و ویژدانێک یەک دێتەوە؟ منێک کە شەووڕۆژ وەک گای ئاشگێڕ گیانم دابوو، ئەوەندە دووکەڵی چرام هەڵمژیبوو، خوێندبوومەوە، منێک کە لەتاو برسێتی تا ئاستی شێتی ڕۆیشتبووم، دوای ئەم ئازار و دەرد و هەوڵ و زەحمەتە تا لێواری گۆڕ، چی بووە بە بەشم؟

کار گەیشتبووە شوێنێک، کە تەنانەت ژنە هەرزەکانی سەرجادەش بە بینی ئەم دەموچاوە شوومەم، پەنا بۆ خوا دەبەن، بەڵام ئێستا ئیتر کار لە کار ترازاوە... تێدەگەی؟ تەواو بووە، ئێستا دەبێ چاوەڕێی ئیزرائیل بکەم، تا بزانم کەی حەز دەکات و گیانم دەرکێشێت! لە برسا ددانەچۆقەم بوو، تووڕەبوونێکی نەوتراو بە سەرمدا زاڵ دەبوو، هەڵدەشاخام و بێگوێدانە ڕێبوارەکان جنێوم بە داروبەرد دەدا، خۆم ئازار و ئەشکەنجە دەدا، بۆ نموونە بە ئەنقەست سەرم بە دارتێلی چراگازەکەدا دەکێشا، نینۆنەکانم دەچەقاندە لەپی دەستم و پێستم دەڕووشاند، کە زمانیشم لە گۆ دەکەوت وەک شێتەکان گازم لێ دەگرت، کە ئازار دەچووە دڵمەوە بە تووڕەیی قاقام لێ دەدا و دەمووت: قوڕی کوێ بکەم بە سەرما؟ چەند جارێک بە نووکەپێ شەقم لە بەردی سەر شەقامەکان دا، یەک لەدوای یەک دەڵێم قوڕی کوێ بکەم بە سەرما؟ چی بکەم؟ ڕێک لەم کاتەدا کابرایەک بە پەنامدا دەڕوات و

به پێکەنینەوە تانەم تێدەگرێت: زۆر قورس نییە، لە شێتخانە خۆت ناونووس بکە! سەیرم کرد و زانیم یەکێکە لە بەناوبانگترین پزیشکەکانی تایبەت بە ژنان لە شاردا، هەموان پێیان دەوت **شازادە!** تەنانەت ئەو کەسەش کە باش دەمناسی و جارێک منیان پێ ناساندبوو، هەستی بە قورپەسەری و لێقەومانی من نەدەکرد! کەمێک هێمن بوومەوە و بیرم کردەوە: ڕاست دەکەیت، من شێتم، ئایا دەبێ بڕۆم بۆ شێتخانە؟ هەستم دەکرد شێتم و هەستەکانم تێکەڵوپێکەڵن، شێتی بە دەمارما دەگەڕێت و شوێنەوارەکەی لە مێشکمدا دەردەکەوت، زۆر باشە ئەمەش چارەنووسی من! دڵتەنگ و هێواش هەنگاوم دەنا و بیرم دەکردەوە، دواجار چارەنووسم ئەمەیە و هیچی تر، دەبوو کۆتایی تەمەنم بەم جۆرە بەڕێ بکەم، لە حاڵەتی ئینسانی بخرێم، لەپڕ دەوەستم و دەڵێم: بەندیخانە نا، بەرگەی ئەمە ناگرم! دەنگم بەهۆی نووسانی قورگمەوە گیرا بوو، بێ ئەوەی کەس گوێگرم بێت، لە ئاسمان دەپاڕامەوە کە مەمگرن، بەندم مەکەن! نەکا بمخەنە زیندان و لە ژوورێکی تاریک و بێڕووناکیدا بەندم بکەن، نا بە هیچ شێوەیەک نامەوێت تووشی بەڵایەکی وا بم، هێشتا ڕێگەچارەیەک ماوە، بەڵام دەبوو دیسان هەوڵ بدەم دەرچەیەک بدۆزمەوە، ئامادەم ئازارێکی زیاتر بەرگە بگرم، دەست لە هەوڵدان هەڵنەگرم؛ خۆم ڕابگرم و لە هەموو دەرگایەک بدەم بەڵکو هیوایەک هەبێت.

بۆ نموونە **سیسلە**رم، کە دەفتەری نۆتەی مۆسیقا دەفرۆشێت لە بیر نەبوو، تا ئێستا سەردانی دووکانەکەیم نەکردبوو. ڕەنگە بتوانێت یارمەتیم بدات... بەدەم ڕۆشتنەوە ئەوەندەم بۆڵەبۆڵ و ڕۆڕۆم کرد، کە جارێکی تر فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارەوە، بە هەموو بەڵایەک ڕازی بووم، جگە لەوە دەستگیرم بکەن و بمخەمە زیندان. ڕەنگە **سیسلە**ریش دەستێکی نادیار بێت و قەدەر بۆ ڕزگارکردنم ناردبێتی، چونکە بێ هیچ هۆکارێک هاتە خەیاڵمەوە، ماڵەکەی زۆر دوور بوو، بەڵام بڕیارم دا هەرچۆنێک بێت بیدۆزمەوە، کێشە نییە، لەسەرخۆ

دەڕۆم و لە ناو ڕێگەدا کەی ماندوو بووم دەحەوێمەوە، شوێنی کارەکەیم دەزانی، چونکە جاران سەردانم دەکرد و دەفتەری مۆسیقام دەکڕی، ئایا دەتوانم نیوکرۆن پارەی لێ قەرز بکەم؟ ڕەنگە بێتاقەت بێت، کەواتە باشترە داوای یەک کرۆن بکەم.

لە کۆتاییدا ڕۆیشتمە ناو دووکانەکە و بانگی خاون دووکانەکەم کرد، بەرەو شوێنی کارەکەی ڕێنماییان کردم، بینیم کە خاوێن و کەشخەیە، ئەخیر مۆدیل جلی لە بەردایەوە، دانیشتووە و سەیری کاغەزەکانی سەر مێزەکەی دەکات، لە ژێر لێوەوە داوای لێبووردنم کرد و مەسەلەکەم بۆ باس کرد... لەبەر لێقەومان ناچار بووم بێمە لای... بە زووترین کات پارەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە... هەر کە پارەی وتارەکەم لە ڕۆژنامە وەرگرت... بەم کارەی یارمەتییەکی گەورەی من دەدات.

لەگەڵ قسەکردنی مندا گەڕایەوە بۆ مێزەکەی و خۆی بە ئیشەکانییەوە سەرقاڵ کردەوە، کە قسەکانم تەواو بوون سەرە جوانەکەی ڕاوەشاند و وتی:

- "نەخێر ناکرێت!"

جگە لەمە هیچی نەوت و هیچ ڕوونکردنەوەیەکیشی نەدا، هەر ئەمە و هیچی تر! ئەژنۆکانم کەوتنە لەرزین و پاڵم بە سیاجی سواخدراوی ژوورەکەوە دا، پێویست بوو جارێکی تر زۆری لێ بکەم، باشە بۆچی لەو ڕێگە دوورەوە، لە گەڕەکی **واترلەند**[1]، لەپڕ ناوی ئەم کەسەم بیر کەوتەوە؟ لە کاتێکدا نیوەگیان بووم و بە ئارەقە خووسابووم وتم:

- "لەڕاستیدا زۆر لاواز بووم و ئازارم زۆرە، بەداخەوە نەخۆشم، بەڵام دڵنیا بن تا چلوهەشت سەعاتی تر پارەکەتان بۆ دەگەڕێنمەوە، هیوادارم گەورەیی بنوێنن."

لە وەڵامدا وتی:

---

[1] Vaterland: یەکێک لە گەڕەکە هەژارنشین و قەرەباڵغەکانی شاری ئۆسلۆ کە ناوەندی کەسانی تاوانکاریشە.

"باشـه بـراكەم بـۆ هـاتوونەتە لای مـن؟ ئێـوە لای مـن كـابرايەكی غەريبەن و هەر ناتانناسـم، باشـترە سـەردانی ڕۆژنـامەيەک بـكەن كە دەيناسن."

"ئەمەم هەر بـۆ ئەمشـەو دەوێـت، چـونكە ئێسـتا ئۆفيسـی ڕۆژنـامە داخراوە و منيش زۆر برسيمە."

ئەو بەردەوام سـەری دەجوڵانـد و تەنـانەت ئەو كـاتەش دەسـتم بە دەسـكی دەرگـاكەوە بـوو و دەمويسـت بـڕۆمە دەرەوە هەر سـەری دەلەريـيەوە، خواحـافيزيم كـرد و ڕۆيشـتمە دەرەوە، پێكەنينێكـی تـاڵم كـرد و بە خـۆم وت بێگومـان ئەمەيـان ئيتـر فەرمـانی خـوا نييـە ئـاوا قسەم لەگەڵ بكات، خوا ئەوەند خۆی بچووک ناكاتەوە، كە كارێک كە بەنـدەيەكی دامـاوی وەک مـن پێـی دەكرێـت، بيكـات و نيەتێكـی وا لە خەڵكدا دروست بكات.

مـاوەی چارەكێـک خـۆم بەم لاولادا كـێش دەكـرد، چـارەكێكی تـريش خەريكی ئيسراحەت بووم لە سەر ئەم سەكۆ و ئەو سەكۆ، خوا بكـات نەمگرن، بيركردنەوە لە ژووری شێتخانە ئۆقرەبڕی كردبووم، هەر كە پاسـەوانێكم دەبينـی ڕێگەكەم بەرەو كۆڵانێـک لار دەكـردەوە، بە خـۆم وت سـەد هەنگـاو دەڕۆم و دەژمێـرم و ديسـان بەختـی خـۆم تـاقی دەكەمەوە، ڕەنگە هيوايەک هەبێت و ڕێگەچارەيەک بدۆزمەوە... چـاوم بە دووكـانێكی پەڕپـووتی جوانكـاريی ژنـان كەوت، كە تـا ئەوكـات نەچووبوومە ناوی، چەنـد مێزێكی بەردەمـی باريک و بەرزم بينی، لە نـاوەوە، بە دەرگـايەكی بچـووک كە بە سـەر ئيـدارەی دووكـانەكەدا دەكرايەوە، ڕەفەكان بە كاغەز ڕووپۆش كرابوون، پياوێک تاكوتەنيا لە پشت مێزەكەوە دانيشتبوو، ڕۆيشتمە ناو دووكانەكە و چاوەڕێم كرد، دواهەمـين مشـتەری بەڕێ بكـات، مشـتەرييەكە ژنێكـی گەنـج بـوو، بە ڕواڵەت زۆر ڕووخـۆش دەركەوت و گۆناكـانی چـاڵی تيـا بـوو، كە ويسـتی بـڕواتە دەرەوە خـۆم لادا نەوەک چـاوی بە چـاكەتەكەم

بکەوێت، کە تەنیا بە یەک قۆپچە داخرابوو، شاگردی دووکانەکە منی بینی و پرسیاری کرد:

- "فەرموو چیتان دەوێت؟"
- "دەمویست بزانم خاوەندووکان لێرەیە یان نا؟"

وەڵامی دایەوە:

- "بۆ سەیران ڕۆیشتووە بۆ **ئیتۆن هایمەن**[1]، کارێکی تایبەتتان هەبوو؟"

بزەیەکم کرد و وتم:

- " لێتان ناشارمەوە زۆر برسیمەوە، چەند ئۆرایەک پارەم دەویست نان بخۆم، یەک فلسم پێ نییە."
- "دەی کەواتە ئێوەش وەکو من وان."

لەم کاتەشدا، خۆی بە هەڵچنینی پاکەتی دەرزوو و ڕێککردنیانەوە سەرقاڵ کرد، لەناکاو وەک ئەوەی ئاوێکی سارد بڕژن بە گیانمدا هەموو گیانم تەزی و وتم:

- "بۆ خاتری خوا جوابم بدەنەوە... هیچ نەبێ دەرم مەکەن! چەند ڕۆژێکە هیچم نەخواردووە و لە برسا نیوەگیان بووم."

حاڵەتێکی جیدی وەرگرت و بێ ئەوەی هیچ بڵێت گیرفانەکانی یەک بە یەک گەڕا و وتی:

- "باوەڕ ناکەن قسەکەم ڕاست بێت؟"
- "تکایە تەنیا پێنج ئۆرا، تا چەند ڕۆژێکی تر دوو ئەوەندەی ئەم پارەیەتان بۆ دەهێنمەوە."

لەپڕ خۆی پێ ڕانەگیرا و وتی:

- "کاکە گیان! یانی دەفەرمووی لە دەخیلەی دووکان بیدزم؟"
- "بەڵێ، پێنج ئۆرا لە دەخیلەکە هەڵگرن و بیدەن بە من."

دواجار بۆ ئەوەی قسەکان ببڕێنێتەوە وتی:

---

[1] Jotunheinmen: کوێستانێک لە خورئاوای نەرویج، کە لوتکەکانی هەشت مانگ لە ساڵدا بە بەفر داپۆشراون، شوێنێکیشە بۆ وەرزشی زستانەی ئەو وڵاتە. (و.ف)

"مـن پيـاوی ئەم ئيشــە نـيم و ئەگەر ڕاسـتيت بوێـت تـاقەتی ئەم گاڵتەجاڕيەشم نەما."

له كاتێكدا له شەرما ئاوم لێدەچۆڕا، له برسا هێزم تيا نەمابوو، هاتمە دەرەوە. هەر بەڕاستی ناخۆشـم كردبوو! دەبێ تەواوی بكەم! من كە سـاڵەهای سـاڵ خـۆڕاگر بـووم و بەرگەم گرتبـوو، له كەينوبەينی ئەو هەموو ساتە قورسەدا هيچ هەڵەيەكەم نەكردبوو، ئێسـتا گەيشـتبوومە شـوێنێك بەوپەڕی بێشــەرمييەوە دەسـت بـۆ هەمـوو ناپياوێـك پـان دەكەمەوە، لەماوەی بيستوچوار سەعاتدا هەرچی شـەرموحەيا هەبوو، خسـتمە لاوە و ورەی خـۆم تـا ئەم ئاسـتە دابەزانـد، تەنـانەت بـۆ ڕاكێشـانی سـەرنجی خەڵكی، شـەرمم نەدەكرد له بەردەم سـووكترين دووكاندارەكانيش بگريم، جگە لەوە سـوودی چـی بـوو؟ جگە لەوەی وەكو جاران يەك پاروەە نـان نەبـوو بيخـۆم، تەنيا ئاكامەكەشـی ئەوە بـوو زيـاتر ڕقـم له خـۆم بـوو، بەڵـێ، ئێسـتا ئيتر دەبێ هەمـوو شـتێك يەكلا بكەمەوە، دەبێ زووتـر خـۆم بگەيەنـمە مـاڵەوە ئەگەرنـا دەرگـای ماڵەوە دادەخەن و ئەمشەويش دەڕۆمەوە زيندان...

ئەم بيرۆكەيە هێزی پێبەخشيم، ئيتـر خەوتـن له زينـدان بـوونی نەبـوو! جەستەم بەرەو پێشەوە نووشـتاندەوە، دەسـتم بە لاكەمەری چەپمەوە گرت بۆ ئەوەی كزانەوەی كەمتر بێتەوە، زۆر بە ئاسـتەم خـۆم كێش دەكرد، چاوم له ئەرزەكە بڕيبوو، نەوەک ناسياوێک بمبينێت، شكور له حەوتی پاشـنيوەڕۆ لای نەداوە و هێشـتا سـێ سـەعاتی مـاوە دەرگـای مـاڵەوە دابـخەن! نەمـدەزانی بـۆچی ئەوەنـدە دەترسـم؟ بەهەرحـاڵ، ئەوەی پێم كرا كردبووم و ڕێگەيەک نەمـابوو، بيرم دەكردەوە مەگەر شتی وا دەبێت؟ ڕۆژێكی تەواو لەم دەرگا و ئەو دەرگا بدەم و هـيچم دەسـت نەكەوێت؟ ئەم بـابەتە بـۆ هەر كەسـێک بگێڕمەوە بـاوەڕم پـێ ناكـات، وادەزانـن خـۆم دروسـتم كـردووە، تەنـانەت له يەک حاڵەتيشـدا سـەركەوتوو نەبـووم، ئەی هـاوار! چـار چييە؟ لەمە بەدوا دەبێ هەوڵ بدەم خەڵک بەزەييـان پێمـدا بێتەوە، تف لەم شانسـە! ڕاسـتييەكەی له

خۆم بێزار بووم و هیوام نەمابوو، گریمان هیچ دەرچەیەکی هیوام بەسەردا نەدەکرایەوە، بە جەهەنەم کە ناکرێتەوە! چەند باش بوو بمتوانیایە مشتێک وێنجە لە تەویلەکە بدزم؟ ئەم بیرۆکەیە وەک بروسکەیەک هاتە خەیاڵمەوە، بەڵام یەکسەر بیرم کەوتەوە بەزۆری دەرگای تەویلەکە دادەخەن! بە خەیاڵمدا نەهات، هێواش و لەسەرخۆ وەک حەلەزوون بەرەو ماڵەوە دەخزام، تینووم بوو. بە خۆشحاڵییەوە بۆ یەکەم جار لە بەیانییەوە تا ئەوکاتە، پاش ڕۆیشتنێکی زۆر لە شوێنێک ئاو بدۆزمەوە و قومێک بخۆمەوە، تا **عەمباری گۆشت** ڕێگەکە دوور بوو و حەزیشم نەدەکرد بڕۆمەوە شوێنێکی نەناسراو و ئاو بخۆمەوە، ئەگەریش چاوەڕێم بکردایەوە کێشە نەبوو، چونکە چارەکێکی تر لە ماڵەوە بووم، جگە لەوەش کێ دەڵێ دەتوانم ئەم قومە ئاوەش لە گەدەمدا بهێڵمەوە.

گەدەم بەرگەی هیچ شتێکی نەدەگرت، تەنانەت تفی ناو دەمیشم قووت دەدا و هێڵنجم دەدا.

ئەرێ قۆپچەکان بوو بە چی؟ بۆچی بیرم لەوە نەکردەوە؟ یەکسەر وەستام و بزەیەک هاتە سەر لێوم، ڕەنگە بەتەواوی مەحکوم نەبم بە تیاچوون و ئەمە تەنیا ڕێگەی ڕزگاریم بێت؟ بەم ڕێگەیە دە ئۆرام دەست دەکەوێت، سبەینێش هەر چۆنێک بێت دە ئۆرای ترم دەست دەکەوێت و پێنجشەممەش پاداشتی وتارەکە وەردەگرم، ئێستا با بزانم، ڕەنگە زوو شتەکان چارەسەر بێت. بەڕاستی بۆچی قۆپچەکانم بیر نەمابوو؟ لە گیرفانم دەرمهێنا و بەدەم ڕێگاوە بە وردی سەیرم کردن، لە دڵخۆشیدا جیهان لە بەرچاوم تاریک و لێڵ بوو، بەدەم ڕۆیشتنەوە بە ناو کۆڵانەکەدا بەرپێی خۆم نەدەبینی، چەند شوێنێکی باش بوو دووکانی ڕەهن! ئەوێ ئارامیی شەوە ناخۆشەکانی من، ئەوێ چارەی کاری من بوو! عەمباری ژێرزەمینەکەیم وەک لەپی دەستم دەناسی، کەلوپەلی ماڵ، کەلوپەلی خێزانی و تەنانەت دواهەمین کتێبەکانم، یەک لە دوای یەک بەرەو ئەو شوێنە بەڕێکەوتبوون، لەو

ئەشکەوتە تاریکەدا نێژرابوون، هەموو ڕۆژێک کە شتەکانیان هەڕاج دەکرد بەوپەڕی دڵخۆشییەوە وەک بینەرێک دەڕۆیشتمە ئەوێ.
کە دەمبینی کتێبەکانم، لە هەڕاجدا باش فرۆشراون و گەیشتونەتە دەستی کەسێکی باش، زۆر دڵخۆش دەبووم! شانازیم بەخۆمەوە دەکرد، کە سەعاتەکەم کەوتۆتە دەست ئەکتەری بەناوبانگ **مانگلسن**، ڕۆژژمێرێک کە یەکەم شیعرم لە سەر نوسیبوو، گەیشتبووە دەست یەکێک لە ناسیاوەکانم و پاڵتۆکەشم فۆتۆگرافەرێک بردبووی! هەربۆیە زۆر گلەییم نەبوو، بەهەرحاڵ، کە گەیشتمە دووکانەکە قۆپچەکانم ئامادە کردبوو، ڕۆیشتمە ژوورەوە، جەنابی بەڕێوەبەر لە پشت مێزەکەوە دانیشتووە و خەریکی نووسینە، لە ترسی ئەوەی نەوەک جارسم کردبێت و داواکەم بێزاری بکات، وتم پەلەم نییە ئیشەکەتان بکەن، دەنگم لە بنی گەروومەوە دەهاتە دەر و بە جۆرێک غەریب بوو، کە خۆشم بە زەحمەت دەمناسییەوە، دڵم وەک چەکوش زرمەزرمی بوو، بەڕێوەبەر وەک جاران بە بزەیەکەوە هاتە پێشەوە، لەپێ هەر دوو دەستی لە سەر مێزەکە دانا و بێدەنگ سەیری قەلافەتی کردم.
'ڕاستییەکەی شتێکم هێناوە و دەمویست بزانم بە کەڵکتان دێت یان نا؟ ئەم شتە بووەتە بەلای گیانم و لە ماڵەوە بێکەڵک کەوتووە، شتێکی گرنگ نییە چەند قۆپچەیەکە!'
چاوی هێنایە نزیک دەستم و وتی:
'باشە دەبێ بزانم قۆپچەکان چۆنن؟'
پاڕامەوە ئایا ناکرێ هەڵی بگرێت و چەند ئۆرۆیەکم پێ بدات... هەڵبەت هەر نرخێک خۆی پێی خۆش بێت و ئەگەر پەسەندی بکات، جەنابی بەڕێوەبەر چاوی تێبڕیم و وتی:
'ئەم قۆپچانە دەفەرمووی؟ لەبری ئەم قۆپچانە پارە بدەم؟'

- "ڕاستییەی هاتە بیرمەوە لێرەوە تێپەڕیم سەردانێک بکەم و قۆپچەکانتان نیشان بدەم، شتێکی واشم ناوێت، هەر ئەوەندەی جگەرەیەکی چرووت یان شتێکی کەمی پێ بکڕم."

دواتر سووخۆری پیر دەستی بە پێکەنین کرد و بێ ئەوەی قسەیەک بکات گەڕایەوە بۆ پشت مێزەکەی، من وشک بووبووم و مات و حەپەساو وەستا بووم، نایشارمەوە هەر سەرەتا هیوایەکی وام نەبوو، بەڵام پێم وابوو شتێک پارەم دەست بکەوێت و ئیشەکانم بەڕێ بخەم، پێکەنینەکەی وەک فەرمانی کوشتنم وابوو، ڕەنگە هەر قسەکردن لە سەر چاویلەکەشم بێسوود بێت و بێگومان بەکەڵکی نایەت، هەرچۆنێک بێت چاویلکەکەم هەڵگرت و وتم:

- "هەڵبەت مەبەستم ئەوە بوو ئەم چاویلکەیەشی لەگەڵ قۆپچەکان دابنێم! تەنیا دە ئۆرا بەسە و ئەگەر ناشکرێ پێنج ئۆرا باشە."

پیرەپیاوەکە وتی:

- "پێشتر عەرزم کردن کە چاویلکەکەم ناوێت."

دەنگم ناسک کردەوە و وتم:

- "من یەک پوولی نامەم دەوێت، ئەو نامانەی نووسیومە نەمتوانیوە پۆستی بکەم، پوولێکی دە ئۆرایی یان پێنج ئۆرۆاییم دەوێت، هەڵبەت جەنابتان باشتر دەیزانن."

بە دەستی هەندێ جوولەی نواند و وەڵامی دایەوە"

- "ڕەحمەت لە باوکت، دە واز بێنە!"

ئیتر بە خۆم وت بەسە، زۆر باشە! ئیتر نابێ باسی ئەم بابەتە بکەم، یەکسەر چاویلکەکەم لە چاو کردەوە و قۆپچەکانم هەڵگرت و ڕۆیشتم، خواحافیزیم کرد و وەک عادەتی جاران لە کاتی هاتنە دەرەوە درگاکەم لە دوای خۆم داخست، فەرموو ئەمەش ئەمە! ئیتر چار نەمابوو! لە سەر پلیکانەکان جارێکی تر وەستام و سەیری قۆپچەکانم کرد و لە بەرخۆمەوە وتم بە هیچ شێوەیەک سەر لە ئیشی ئەم پیاوە دەرناکەم، قۆپچەکان تازەن و ئەو بەهیچ نرخێک ئامادە نییە

وەری بگرێت، بەدەم بیرکردنەوەوە پیاوێک بەلامدا تێپەڕی و بەرەو ژێرزەمینەکە کەوتەڕێ، ئەوەندە بەخێرایی دەڕۆیشت، کە بەحاڵ شانی لەم من خشا، هەردووکمان داوای لێبوردنمان لە یەکتر کرد و ئاوڕم دایەوە و سەیرم کرد، هەر کە گەیشتە خوارەوە پلیکانەکان سەیرێکی کردم و وتی:

"باشە تۆ و ئێرە کوجا مەرحەبا؟"

کە هاتە سەرەوە تێگەیشتم ئەم پیاوە دەناسم. وتی:

"خوا خراپ نەدا، بۆ وات لێهاتووە؟ ئێشت چی بوو لێرە؟"

"هیچ! بۆ مامەمەڵەیەک هاتبووم؛ تۆش ئێستا دەچیتە ئەوێ؟"

پرسیاری کرد:

"چیت هێنابووی دایبنێی؟

ئەژنۆکانم کەوتە لەرزین، پاڵم بە دیوارەکەوە دا و دەستیشم کە قۆپچەکانی تێدابوو کردەوە، لەپڕ هاواری کرد:

"ئەی هاوار کەواتە وەزعەکە زۆر خراپە!"

هەستم دەکرد قوڵپێک لە قوڕگمدایە و لەگەڵ ئەوەی خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد، وتم:

" خواحافیز!"

"نە بابە مەڕۆ، تۆزێک بوەستە!"

بۆچی بوەستم؟ ڕەنگە خۆیشی چەند ڕۆژێک برسێتی چەشتبێت و کرێماڵەکەی نەدابێت، ئێستا ئەڵقەی دەزگیرانەکەی دەبات و دای دەنێت.

"باشە، چاوەڕێ دەکەم بەومەرجەی خێرا بکەی!"

دەستی گرتم و وتی:

"بێگومان زوو دەگەڕێمەوە! بەلام پێت بڵێم باوەڕ بە قسەکەت ناکەم، چونکە کەسێکی گێلیت، باشترە لەگەڵ من بێیتە خوارەوە."

دەمزانی مەبەستی چییە، بەلام لەناکاو خۆڕاگریم تیا سەوز بووەوە و وتم:

- "مەحاڵە چونکە سەعات حەوتونیو لە شەقامی بریّت ئانکەر دەبێ کەسیک ببینم و..."

قسەکەی پێ بڕیم:

- "زۆرباشە! حەوتونیو دەبوو لەوێ بیت، بەڵام ئێستا هەشتە، مەگەر نابینی سەعاتێکم لە دەستدایە و ئێستا سەعاتەکە دەبەم و دای دەنێم، خــۆت کەر مەکە، وەرە ژوورەوە، دامـــاوی ڕووڕەش و برســـیی خوانەناس، لانیکەم پێنج کرۆنت بۆ دێنم."

ئەمەی وت و پاڵی پێوەنام بەرەو ژێرزەمینەکە.

هەفتەیەک بە ناز و نیعمەت بە دڵخۆشی و شادمانی تێپەڕی. ئەمجارەش ترسناکترین قۆناغەکانم بە سەرکەوتوویی تێپەڕاند. هەموو ڕۆژێک خواردن هەبوو. هیوام پەیتاپەیتا زیاتر دەبوو و یەکلەدوای یەک ئیشێکم بۆ خۆم دەدۆزییەوە و بە باشی دەمکرد. خەریکی نووسینی سێ چوار وتار بووم. هێزی خەیاڵم لە هەموو لایەکەوە تالان دەکرا و ئیشوکاری بەردەوام هەموو هێزی فیکری منی هەڵدەلووشی. هەستم دەکرد زۆر باشتر لە جاران کار دەکەم. دوا وتارم کە بەهۆیەوە زەحمەتی هاتوچۆی زۆرم دابووە بەرخۆم، سەرنووسەر ڕەتی کردەوە و گەڕاندییەوە، بەڕادەیەک کاری لێکردم کە یەکسەر بێ ئەوەی دیسان بیخوێنمەوە دڕاندم، بە تەما بووم بیر لە ڕۆژنامەیەکی تر بکەمەوە، تا بازاڕێکی گەورەترم هەبێت بۆ کاڵاکانم، ئەگەر بڵاوی نەکەنەوە ڕێگەیەکی تر کراوە دەبێت، دواجاریش دەمتوانی لە یەکێک لە کەشتییەکاندا کار بکەم و ئەو شا بەجێ بهێڵم، کەشتیی **لانن** لە بەندەرەکە لەنگەری گرتووە و ئامادەی جووڵە بوو، ئەگەری هەبوو لەوێ دامەزرێم و بەرەو **بارخانگل**[١] یان

---

[١] Archangel: یەکێک لە بەندەرەکانی باکوری ڕووسیا، کە دەکەوێتە نزیک وڵاتی فینلاندیشەوە. (و.ف)

هەر بەندەرێکی تر، کە مەبەستی کەشتییەکەیە، بڕۆم، کەواتە ئێستا ڕێگەی ڕزگاری داخراو نەبوو.
ئازار و چەرمەسەرییەکانی ڕابردوو زۆر زیانی لێدابووم، قژی سەرم چەپک چەپک دەڕووتایەوە، ئازاری سەیر و جۆراوجۆرم تووش هاتبوو، دەردێکی زۆرم دەچەشت، بەتایبەتی بەیانییان تورەبوونێکی سەیر بەرۆکی دەگرتم، چیم بکردایە دانەدەمرکایەوە، پەڕۆم لە دەستمەوە دەپێچا کە دەمنووسی، چونکە ئەوکاتەی هەناسەم بەر پێستی لەشم دەکەوت، قێزم دەهاتەوە، هەر کات **ئینس ئیلای** دەرگای تەویلەکەی بە توندی پێوە دەدا، یان ئەوکاتەی سەگێک دەچووە ناو حەوشەکە و دەوەڕی، وەک ئەوەی وردەسەهۆڵ بڕژنە سەر مۆخی ئیسقانەکانم، گیانم دەخورا و موچڕکێک بە لەشما دەگەڕا، بە گشتی خراپ بووم.
ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر و قووڵتر کارم دەکرد، تەنانەت لە بەینی کارەکاندا دەرفەتی نانخواردنیشم نەبوو، یادداشت و کاغەزی پەرتەوازە بەسەر مێزە بچووکە ڕزیوەکەم و چرپاکەمدا بڵاو بووبوونەوە، بە نۆرە لەسەر هەر یەک لە نووسینەکان ئیشم دەکرد و دەچوومە سەر نوسینێکی تر، بەدرێژایی ڕۆژ هەر شتێکی تازە دەهاتە خەیاڵمەوە دەمخستە ناو نووسینەکانەوە، بەردەوام دەستکارییم دەکردن، لەبری وشەی وشک و بێڕۆح، وشەی گەرموگوڕ دادەنا؛ هەموو دێڕێکی بە هەوڵ و ئازار و نەگبەتی زۆر تەواو دەکرد و دەچوومە سەر دێڕی دواتر، تا لە کۆتاییدا عەسرێک یەکێک لە وتارەکانم تەواو بوو، دڵخۆش و کامەران خستمە گیرفانمەوە و بۆ لای **کماندۆر** ڕۆیشتم، چەند فلسێک زیاتر لە گیرفانمدا نەبوو و کاتی هاتبوو دیسان ڕاکەڕاکەم بێت و بۆ پارە بگەڕێم.
**کماندۆر**، هەر کە منی بینی تکای کرد دانیشم و وتی:
- "کەمێک چاوەڕێ بکەن تا من..."
بەڵام قسەکەی تەواو نەکرد و دەستی کرد بە شت نووسین!

من دەرفەتەکەم قۆستەوە و سەیری هەموو ژوورەکەم کرد، لە یەکەم بەرکەوتنـدا ئەوەی بەرچـاوم کەوت ئەمە بـوو: چەنـد پەیکەرێکـی نیـولەش، چەنـد وێـنەیەک، ئەو پارچەنووسـراوانەی بڕدرابـوون و لکێنرابـوون بە دیـوارەوە، سـەبەتەیەکی بـێقەوارە، کە کـاغەزی ڕەشنووس و گرمۆڵەکراویـان تیـا کەڵەکە دەکرد، کە ئەم سـەبەتەیەم بینی وەک دەمێکـی کـراوە ئامـادە بـوو شـت قـووت بـدات، سـەیریش نەبوو بتوانێت مرۆڤێک هەڵلووشێت، زۆر دڵتەنگ بووم، ئاخۆ چەند هیـوا لە زاری ئەم ئەژدیهـا ئەفسـووناوییە دەبـووە ناکـامی و چ زەحمەتێکی زۆر بەفیڕۆ دەچوو و تیایدا دەنێژرا! لەناکاو **کماندۆر**[1] لە پشت مێزەکەیەوە پرسیاری کرد:

"ئەمڕۆ چەندی مانگە؟"

بیستوهەشت.

خۆشحاڵ بووم کە بەمجۆرە خزمەتێکم پێی کردووە.

لەژێـر لێـوەوە دەڵێـت زۆرباشـە! بیستوهەشـتەم و دیسـان دەسـت دەکاتەوە بە نووسین، دواتر چەند نامەیەک دەخاتە زەرفەکانی، چەند کاغەزێک بۆ ناو سەبەتەکە و قەڵەمەکەی لە سەر مێزەکە دادەنێت، لە سـەر کورسـییەکەوە ئـاوڕ دەداتەوە و سـەیری مـن دەکـات، ئینجـا دەزانێـت کە مـن لای دەرگـای ژوورەکە دانیشـتووم، بە دەسـتەکانی کورسـییەکی تـر نیشـان دەدات و بە دەسـت ئامـاژەم بـۆ دەکـات، ئەم ئامـاژەیە نیوەجیدی و نیوەگاڵتەیە.

بـۆ ئەوەی نووسـینەکە لە گیرفـانم دەربهێـنم، وەردەسـوڕێم و چاکەتەکەم بە وریاییەوە دەکەمەوە، چونکە دەترسم بزانێت هێلەکم لە بەردا نییە.

وتارەکە بە دەستمە دەگرم و دەڵێم:

---

[1] Le Commandeur: ناوی خوازراوی یەکێک لە ڕۆژنامەنووسەکانی نەرویج بوو، کە بە نزیکەیی مانای (فەرمانڕەوا)ش دەگەیەنێت. (و.ف)

- "لێکۆڵینەوەیەکی کورتە لە بارەی **کرجیۆ**[1] و بەداخەوە خۆشم دەزانم وەک پێویست نەنووسراوە و..."

کاغەزەکانم لە دەست وەردەگرێت و لاپەڕەکان هەڵدەداتەوە و ڕووم تێ دەکات، لە نزیکەوە دەموچاوی دەبینم، بەڵێ ئەوکاتەی کە هێشتا زۆر گەنج بووم، چەندینجار ناوی ئەم کەسەم بیستبوو و ڕۆژنامەکەی سالانێک کاریگەریی لەسەرم دانابوو، ئێستا خۆی لە بەرچاومدایە، **کماندۆر** قژی لوولە و لە چاوە هەنگوینییە کاریگەرەکەیدا، جوولە و نیگەرانییەکی تایبەت دەبینرێت، بەردەوام و بە دەنگی بەرز بە لووت هەناسە دەدات، ئەم پیاوە خەباتکارە کە ترسی خستبووە هەموو دڵەکانەوە، بە قەڵەمە سیحراوییەکەی لە هەموو شوێنەکان هەلای دەنایەوە، نووسینەکانی بۆنی خوێنی لێدەهات، ڕووخسارێکی هەبوو کە تەنانەت قەشەیەکی سکۆتلەندیش قەلافەتێکی وا بەویقار و هێمنی نییە.

بە بینینی حاڵەتێکی ترس تێکەڵ بە سەرسامیت بۆ دروست دەبێت، بە بینینی زۆری نەماوە فرمێسک بڕژێتە چاومەوە و لە خۆمەوە نزیکی بمەوە، تا هەستی دەروونیی خۆمی بۆ بدرکێنم و پێی بڵێم چەند شتی لێوە فێر بووم، لەبەر ئەمەش بێت ڕووی لەگەڵم خۆش بێت، چونکە وا کڵول بووم، کە ئیتر بەرگەی ڕووگرژی ناگرم، چاوەکانی لە سەر نووسینەکە هەڵگرت و بەدەم نووشتانەوەی کاغەزەکەوە، کەوتە بیرکردنەوەوە و منیش بۆ ئەوەی بۆ وەلامی ڕەتکردنەوەکەی یارمەتیی بدەم دەستم بردە پێشەوە و وتم:

- "هەڵبەت دەزانم کە نووسینەکەی من بەکەڵکی بڵاوکردنەوە نایەت..." و بە بزەیەک تێمگەیاند، کە ڕەتکردنەوەی وتارەکەم زۆر بەلاوە گرنگ نییە و ئاسایی وەری دەگرم.

---

[1] Correggioio: بە ئەگەری زۆر نووسەر مەبەستی نیگارکێشی بەناوبانگی ئیتالییە، کە لە سەرەتای سەدەی شانزەیەمدا ژیاوە و تابلۆکانی سەر دیوار، بەتایبەت ئەو سکێچانەی بۆ جەستەی مرۆڤ کێشاویەتی، زۆر بەناوبانگ و گرنگن. (و.ف)

لە وەڵامدا وتی:
"ئەو وتارانەی لە ڕۆژنامەدا بڵاو دەبنەوە دەبێ زۆر سادە بن و هەموان پەسەندی بکەن، ڕەنگە بزانن کە خوێنەری ڕۆژنامەکەی ئێمە چ جۆرە کەسانێکن، ناتوانن لەمە سادەتر بنووسن؟ خوێنەری وا لە کوێ هەیە کە تێگەیشتنیان لە سنووری ئاسایی زیاتر بێت؟"
بە شێوازی دەربڕین و ڕێزی ئەو سەرم دەسوڕمێت، ناڕاستەوخۆ تێدەگەم کە نووسینەکەمی پێ باش نەبوو، بەڵام لەمە زیرەکانەتر و موحتەرەمانەتر ناکرێت وتاریک ڕەت بکەیتەوە، بۆ ئەوەی لەوە زیاتر کاتی نەگرم لە وەڵامدا دەڵێم:
"هەڵبەت هەوڵ دەدەم هەر بەو جۆرەی فەرمووتان شت بنووسم و ئیشێکی زەحمەتیش نییە بۆ من."
دواتر بەرەو دەرگاکە دەڕۆم و داوای لێبووردن دەکەم، کە بۆ وتارەکە ئەم هەمووە کاتم گرتووە، دەچەمێمەوە و هەر کە دەسکی دەرگاکەم گرت و ئامادەی چوونەدەرەوە دەبم، دەڵێت:
"ئەگەر کێشەی پارەتان هەیە، دەتوانم یارمەتییەکی بچووکتان بدەم و هەڵبەت بەپرادەی ئەو پارەیەش بابەتمان بۆ دەنووسن."
ئەو تەواو تێگەیشتبوو کە من توانای وتارنووسینم نییە، هەربۆیە لەبەرئەوەی نەمدەتوانی بە باشی پێشنیارەکەی ئەنجام بدەم، دەمزانی کە دواجار هەر شەرمەزارییم بۆ دەمێنێتەوە لە وەڵامدا وتم:
"جاری تا ماوەیەک دەتوانم بەڕێی بکەم، سوپاس بۆ ئەو ڕێزەی نواندتان، مەمنوونم!"
کماندۆر، وەک ئەدەبێک کەمێک لە جێگەکەی بەرز دەبێتەوە و خواحافیزییەکی گەرمم لێ دەکات، سەرباری ئەوەش سوپاسگوزاری بووم، چونکە خۆم بە شایستەی ئەو ڕێز و میهرەبانییە نەدەزانی و لە دڵمدا دەموت دەبێ هەوڵ بدەم، خۆم بە شایستەی ئەو میهرەبانییە زۆرە دەربخەم، لە لایەکی ترەوە بەڵێنم بە خۆم دەدا تا شتێک نەنووسم کە خۆم ڕازی بکات نەگەڕێمەوە بۆ لای، دەبێ وتاریک

بنووسم که **کماندۆر** شەیدا و حەپەساو بکات و یەکسەر دە کرۆن بخاتە دەستمەوە، بەهەرحاڵ، هەر کە گەڕامەوە بۆ ماڵ دەستم کرد بە نووسین.

لەو بەرروارە بە دواوە چەند شەوی یەک لەدوای یەک نزیک سەعات هەشت، یانی ئەوکاتەی چراگازەکەی شەقامەکە دادەگیرسا، ئەم دیمەنەی خوارەوەم دەبینی:

هەموو شەوێک دوای ئەوەی بۆ حەوانەوەیەک، دوای کاری ڕۆژانە و بۆ هەڵمژینی هەوایەک لە ماڵ دەردەچم، ژنێکی ڕەشپۆرش دەبینم، کە ڕێک لای چراگازەکە و تەنیشت دەرگای ماڵەوە وەستاوە، کە بە بەردەمیدا تێدەپەڕم ئاوڕم بۆ دەداتە و بە چاو دوام دەکەوێت، جلەکانی قەت ناگۆڕێت، دەموچاوی بە تۆڕێکی ئەستوور داپۆشیوە و تا سەرووسینگی شۆڕ بۆتەوە، چەترێکی بچووک کە دەسکەکەی ئەڵقەیەکی عاجی پێوەیە، بەدەستەوە دەگرێت، سێ شەوی بەردەوام لە هەمان شوێن و لە هەمان حاڵەتدا دەیبینم، هەر لەگەڵ تێپەڕین بە بەردەمیدا، بە نەرمی وەردەسوڕا و دەچووە ناو کۆڵانەکە و لە بەرچاوم دوور دەکەوتەوە.

مێشکمە ماندووەکەم خستەکار، تا بزانم مەسەلەکە چییە و نازانم بۆچی لەخۆوە هەستم کرد، لەبەر من دێتە ئەم ناوە، زۆری نەماوە قسەی لەگەڵ دامەزرێنم و بڵێم ئایا بۆ کەسێک دەگەڕێت، یان پێویستی بە یارمەتی هەیە؟ ئایا چاوەڕێیە ئەوەم لێ دەکات بەو سەروچاوە شڵەژاوەوە، بیگەنمە ماڵەکەی و لە تاریکیی شەودا ئاگام لێی بێت؟ بەڵام دەترسام ئەم کارە قورس لەسەرم بکەوێت، بۆ نموونە ناچار بم ئەسپوعارەبانەی بۆ بگرم و فەرمووی پێکێک شەرابی لێ بکەم، لەو کاتەدا مەحاڵ بوو هیچ خەرج بکەم، چونکە یەک فلسم نەبوو، ئەم بێ پارەییە چەند بێهیوات دەکات و هەموو ورەیەک لە دڵی ئینسان دەسەنێتەوە، تەنانەت لە کاتی تێپەڕیندا نەمدەوێرا سەیرێکی بکەم، برسێتی دیسان بووبوو بە بەڵای گیانم!

هەڵبەت بۆ من کە ڕۆژانێکی درێژ لە بەردەم برسێتیدا خۆڕاگریم کردبوو، شەوێک برسێتی شتێکی گرنگ نەبوو و بە کاتێکی زۆرم نەدەزانی، لێتان ناشارمەوە لە شەوی پێشووەوە تا ئەو کاتە هیچم نەخواردبوو، خەریکبوو هێزم تێدا نەدەما، چیتر ئەو هێز و خۆڕاگرییەی جارانم نەمابوو، ڕۆژێک برسێتی لە پەلوپۆی خستبووم و سەرگێژەی بۆ دروست کردبووم، لەگەڵ خواردنەوەی یەک قوم ئاودا دڵم تێکەڵ دەهات و بەردەوام دڵەکزێم هەبوو! هەڵبەت سەرمای شەویش کاری خۆی دەکرد، شەوان بە جلەوە دەخەوتم، بەڵام سەرما بەڕادەیەک تیژ و زۆر بوو، کە لەشم مۆر دەبووەوە و تا بەیانی دەتەزیم، بەدرێژایی شەو ئەوەندە دەلەرزیم، کە گیانم وەک تەختەی وشک و ڕەقی لێدەهات، نەدەکرا چاوەڕێی ئەوە بکەم ئەم بەتانییە کۆنە لە سەرما بمپارێزێت، دەمەوبەیان کزەیەکی تەزیو دەهاتە ناو ژوورەکە و لە خەوی هەڵدەساندم، قوڕگ و لووتم دەنووسا.

بەهەرحاڵ، ماندوو و برسی بە کۆڵان و بازاڕدا دەکەومە ڕێ و هەوڵ دەدەم چارەیەک بدۆزمەوە، تا تەواوکردنی وتارەکەم خۆڕاگر بم، ئەگەر مۆمێک هەبوایە دەمتوانی تا دەرنگانی شەو بمێنمەوە و ئیشەکەم زووتر تەواو بکەم، ئەگەر زەوقم هەبێت، دەتوانم بە دوو کاتژمێر وتارەکە تەواو بکەم، ڕۆژی دواتر بیبەمە لای **کماندۆر**.

لەمە زیاتر وەستان بە باش نازانم و سەردانی کافێ **ئیلاندسک** دەکەم، بەو هیوایەی کوڕە گەنجەی هاوڕێم کە لە بانکدا کار دەکات بدۆزمەوە و دە ئۆرا واتە پارەی یەک دانە مۆمی لێ وەربگرم، بێ ئەوەی ڕێگەم لێ بگرن بە هەموو هۆڵەکانی کافێکەدا تێپەڕ دەبم، بە بەردەم دە دوانزە مێزدا، کە مشتەرییەکان دەوریان داوە و سەرقاڵی خواردن و خواردنەوە و قسەکردن بوون، تێپەڕیم، تا کۆتایی کافێکە و تا **ساڵۆنی سوور** ڕۆیشتم و هاوڕێکەمم نەبینی، بێتاقەت و دڵتەنگ هاتمە دەرەوە و دەستم کرد بە پیاسەکردن بەرەو **کۆشکی پاشا**، من

وەک شــەیتانی بەنەفرەتکـراو بەردەوام جرتــوفرتم بــوو و نەدەمــرم! کێشە و ئازارەکانم بڕانەوەیان نەبوو.
دەستم خستە گیرفانی پانتۆڵەکەم و ملیوانەی چاکەتەکەم تا پشتەملم بەرز کــردەوە، بە هەنگــاوی گــرژ و تــوڕە دەڕۆیشــتم و لە ڕێــگەدا بەردەوام جنێــوم بە بەختوناوچــاوی خــۆم دەدا، لە ڕاســتیدا حەوت هەشــت مانــگ دەبــوو یەک ســەعاتی بێخەم و خۆشــم نەبــووە، ئەگەر هەفتەیەکیش بە هەزار زەحــمەت مەمــرەومەژییەکم دەســت بکەوتــایە، یەکسەر هەژاری و بێدەرەتانی تەنگی پێ هەڵدەچنیمەوە، بەڵام لەگەڵ هەمــــوو ئەمــــانەش و ســــەرباری دەســــتکورتی و کڵــۆلی، هێمــــای ڕاستودروستی بووم و شـەرەف و دەستپاکی خۆم دەپاراست، ئاخ ، چەند ڕەفتاری بێمانا و پووچم لێ وەشابووەوە! خودایە گوناهەکانم ببەخشە! ئەوسا مەسـەلەی بەتانییەکەی **هـانس پۆلی** هـاتەوە خەیـاڵم، بیرم لەوە کردەوە چۆن ئەوکاتە ویستبووم مـاڵی کەسێکی تر بـخەمە ڕەهنەوە، ئازار و ویژدان و پەشیمانی بەرۆکی گرتم، ئێستا لە دڵەوە بە خۆم پێدەکەنیم و تانەم لەخۆم دەدا، کە بۆچی ئەوەندە بۆ ئەمـانەت هەســتیارم و وەسواســم هەیە، لەتـاو ســووکێتی خـۆم تفـم هەڵدەدایە ســەر ئەرزەکە، نەمــدەزانی چــۆن پاســاو بــۆ دەبەنگــی ڕابــردووم بهێنمەوە، ئەگەر ئێســتا شــتی وا ڕووی بـدایە جـۆرێکی تـر ڕەفتــارم دەکرد، ئەمڕۆ ئەگەر لە سـەر شـەقامێک دەخیلەی منداڵێکی قوتابخـانە بـدۆزمەوە، یـان ئـۆرایەک بـدۆزمەوە، بەدڵنیـایی و ســەرباری ئەوەش بــزانم ئەم پـارەیە هەمــوو ســامانی بێــوەژنێکە، بە ئاســوودەییەوە دەیــخەمە گیرفـانم و دەیکەم بە هیـی خـۆم، شـەویش دەمخستە ژێـر ســەرم و بێ کێشــە دەخەوتـم و کەمتـرین پەشـیمانیم بـۆ ئەم بـابەتە نەدەبوو.
ئێتــر توانــام نەمــابوو و بەرگەگرتنــی ئەو هەمــوو ئــازار و کێشــە تـاقەتپڕووکێنە، هەمـوو کـارێکی پێ دەکـردم و سـڵم لە هـیچ هەڵەیەک نەدەکردەوە، سێ چوار جار بە دەوری **کۆشکی پاشادا** گەڕام و دواتر

بڕیارم دا بگەڕێمەوە، پیاسەیەکیشم بە ناو پارکەکەدا کرد و دواجار لە شەقامی **کارل یۆهان**ەوە بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە، سەعات نزیکەی یانزەی شەو و شەقامەکە بەشی پێویست تاریک بوو، ژن و پیاوان دووقۆڵی و بێدەنگ بە شەقامەکەدا پیاسەیان دەکرد، ناوبەناویش هەندێک بە دەنگەدەنگ بە کۆمەڵ لە سوچ و قوژبنەکانەوە دەڕۆیشتن، ئەوکاتەی شەو، کاتی خۆشی و ڕابواردن و گەرمەی بازاڕی عاشقانی شەونخوونە، لە ڕەشایی شەودا بەسەرهاتی شاراوە و چێژبەخش دەستی پێ دەکرد، هەمووکەس بۆ خۆی بەدوای هاوجێیەکدا دەگەڕێت، دولبەرانی شەوگەڕ بە داوێنی درێژ و پڕچین لە هەمووولایەکەوە لە هەوڵدا بوون، ئاوازی پێکەنینی کورت و هەوەسبزوێن، لە هەموو لایەکەوە بەرگوێ دەکەوێت، هەناسەکان قووڵ و نیگەران دەبن و سینگەکان دەلەرزن و دەشڵەژێن.

نزیک **گراند ئوتێل**[1] لە دوورەدەستەوە، کەسێک ژنێک بە ناوی خۆیەوە بانگ دەکات و بە دەنگی بەرز دەڵێت "ئیما! ئیما!"، شەقامەکە وەک زەلکاوێکی فریودەرە، کە لە هەموو لایەکەوە هەڵمی لێ هەڵدەسێت.

لەخۆڕا گیرفانەکانم دەگەڕێم، ڕەنگە دوو کرۆن بدۆزمەوە، وەک ئەوەی ئەم شەوە هێمنە پڕ بێت بە سەرکێشی سەیر، ڕۆشنایی لێڵی چراگاز، هەموو شەقامەکە دادەپۆشێت، جووڵەی ڕێبوارەکان شەهوەتاوییە، هاواری نزم، گفتوگۆی دەروونی، دەنگی ماچومۆچ و چرپەی عاشقانە و بەڵێن و وادەی هەژێنەر، بڵاو دەبێتەوە. لە ژێر دەروازەی گەورەی بینای **بێلمکویست** پشیلەیەکی بریقەدار

---

[1] یەکێک لە ئوتێلە پلە یەک و ناودارەکانی شاری ئۆسلۆ، کە لە ژیانی ئەدەبی و هونەری نەرویجدا، زۆر گرنگ بووە و لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم، ناوەندی کۆبوونەوەی ئەدیب و هونەرمەندان و ڕۆشنبیران بووە، ئەبسن بەردەوام سەردانی کردووە و ئێدوارد مۆنک، نیگارکێشی گەورەی ئەو وڵاتە، قوتابخانە هونەرییەکەی خۆی لەوێ دامەزراند. (و.ف)

جووتەکەی خۆی ڕادەمووسێت و خرۆشانێکی بەرپا کردووە، زەین و خەیاڵی منیش کەمکەم دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەم ژینگەیە، بەڵام سوودی چییە، دوو کرۆنەکەم پێ نییە، بۆ دەبێ ئەوەندە قوڕبەسەر و مایەپووچ و لێقەوماو بم؟ چ سووکی و سەرشۆڕییەک لەمە زیاتر! دیسان بیرکردنەوەم بەرەو شوێنێکی تر ڕۆیشت و ئارەزووم کرد خۆزگە دوادیناری بێوەژنێکم دەدزی، یان کڵاو و دەستسڕی منداڵێکی بچکۆلەم دەرفاند، تەنانەت ئەگەر تورەکەی سواڵەکەیم بدزیایە، یەکسەر دەڕۆیشتم و ساغم دەکردەوە و دەمدایە خواردن و خواردنەوە و ڕابواردن.

بۆ خۆهێمنکردنەوە و دڵدانەوەی خۆم، هەموو نوقسانی و عەیبەیەکم دەخستە پاڵ ئەوانەی دڵخۆش و لێوبەخەندە بەلامدا تێدەپەڕین، بە تووڕەییەوە شانم هەڵتەکاندبوو و سووک و ڕقاوی سەیری ئەو ژنوپیاوانەم دەکرد، کە دوودوو بە بەرچاومدا تێدەپەڕین، ئەم گەنجە خوێندکارە برسی و هەژارانە، کە شەووڕۆژ خەریکی دەستپەڕ بوون، دڵیان تەنیا بەوە خۆشە کە دەستیان بەر مەمکی کچێکی کارەکەر بکەوێت، پێیانوایە خۆشترین ڕابواردنی دنیایان کردووە!

ئەم گەنجە دەوڵەمەندانە، کە لەملاولای شەقامەکەدا هەڵڕژاون، دەستبەرداری کۆنەحیزەکانی کۆڵان و بازاڕ نابن و بە قەحبەکانی بازاڕی **گافرۆشەکان**یش، کە بۆ پەرداخێک بیرە هەموو ئیشێکی ناشیرینیان لێ دەوەشێتەوە، دانامرکێن. بەڕاستی چ لەشفرۆشانێک دەخەنە داوی خۆیانەوە، ئەو لەشفرۆشانەی لە باوەشی فلان شاگرد و فیسار کەناسەوە دێنە باوەشی ئەمانیش!

ئەم ژنە پڕ خێروبەرەکەتانەی کە باوەشیان بۆ هەموان دەکەنەوە و دەڵێن:

"فەرموون شەرم مەکەن، جێ بۆ هەموان زۆرە"

بە جۆرێک قێزم لەوێناکردنی ئەم بابەتە هاتەوە، کە تفێکی گەورەم ڕۆکردە سەر ئەرزەکە و ئەگەر بەر کەسێکیش بکەوتایە، بەلامەوە

گرنگ نەبوو، تورە بووم و بە سووکی سەیری ئەوانەم دەکرد کە لە بەرچاوم پێکەوە جووت دەبوون، لە خۆڕا شانازییم بە خۆمەوە دەکرد، کە پاکم و خۆم لەو پیسییە بەدوور گرتووە و سەرفرازم.
لە مەیدانی ستۆرتینگ ژنێکم بینی و کە نزیکی کەوتمەوە زەقزەق سەیری دەکردم، سلاوێکم کرد، وەلامی سلاوەکەی دامەوە و وەستا.
پرسیم بۆچی بەم درەنگانی شەوە لە کۆلان ماویتەوە؟ بۆ ژنێکی گەنج پیاسەکردن بەم درەنگانە لە شەقامی **کارل‌یۆهان** زۆر ترسناکە، ڕەنگە یەکێک قسەی لەگەڵ دابمەزرێنێت و بێزاری بکات، یان باشترە بڵێم بانگهێشتی ماڵەوەی بکات، بە واقوڕمانەوە سەیری کردم و لە سەروفەساڵم ورد بووەوە، تا لە مەبەستی دەروونیم تێ بگات، دواتر دەستی خستە ژێرباڵم و وتی:
"ئێ باشە، کەواتە با پێکەوە بڕۆین؟"
چەند هەنگاوێک لەگەڵی ڕۆیشتم، کە گەیشتینە بەردەم وێستگەی ئەسپوعارەبانەکان وەستام و دەستیم بەردا، خۆم وادەرخست ئامادەی ڕۆشتنم و وتم:
"خانم ئەوە بزانن من یەک فلس پارەم نییە."
سەرەتا باوەڕی بە قسەکانم نەکرد، بەلام پاش ئەوەی دەستی بە هەموو گیرفانەکانمدا کرد، تێگەیشت بەڕاستی هیچم لە باردا نییە، سەری بە خۆبەزلزانییەوە کشاندە دواوە و وتی چەند لاتوپوتێکی سەیری!
خواحافیزم لێکرد، بەلام دیسان بانگی کردم و وتی:
"هەرچۆنێک بێت با بڕۆین!"
داوای ئەم ژنە سەرجادەییە بەلامەوە سوکایەتی بوو و قبولم نەکرد، بیانووم هێنایەوە کە زۆر درەنگە و لە شوێنێک چاوەڕێم دەکەن، جگە لەوەش لەم ژنە داماو و قوڕبەسەرەوە، چاوەڕێی فیداکاری و لەخۆبردووییەکەی وا نەبووم.
وەلامی دایەوە:

- "ئێستا کە وای لێهات، حەز دەکەم هەر لەگەڵم بێی."
- "کەوایە ئیتر نایەم."

دیسان وتی:

- "کەواتە ژوانت لەگەڵ ژنێکی تر هەیە."

وەڵامم دایەوە:

- "بێگومان نا!"

هەژاری و دەستکورتی هەموو هێزی لێ بڕیوم، بە جۆرێک کڵۆڵی کردووم ژن لەب ەرچاوم وەک پیاوە، لە لایەکی تریشەوە هێزی جەستەمی وێران کردبوو، لە بەردەم ئەم ژنە سەیرەدا، دۆخێکی ناخۆش و ترسناکم هەبوو و دواجار بڕیارم دا، لانیکەم بەڕواڵەت حەیای خۆم نەبەم. لێم پرسیی:

- "ناوتان چییە؟" ناوتان مارییە؟ زۆرباشە ماری خانم، دیقەت بدەن دەڵێم چی و دەستم کرد بە پاساوهێنانەوە بۆ ڕەفتارەکانی خۆم.

ژنەکە زیاتر و زیاتر سەری سوڕمابوو، ئایا پێی وایە لەو کەسانەم کە درەنگانی شەو بۆ ئەم جۆر ئیشانە هاتوومەتە دەرەوە؟ ئایا بەڕاستی گومانی ئەوەی لێ کردبووم؟ ڕەنگە سەرەتای بەرکەوتنمان قسەیەکی نەشیاوم پێ وتبێت؟ ئایا ئەگەر کەسێک مەبەستێکی خراپی هەبێت، بەم ڕێگەیە دەست پێدەکات؟ بە کورتی تێمگەیاند من تەنیا چەند وشەیەک قسەم لەگەڵ کردووە، چەند هەنگاوێکم لەگەڵ ناوە، بۆ ئەوەی تاقی بکەمەوە و جگە لەوەش من قەشەم و ناوم فلانە، وتم خانم شەوێکی خۆش و بڕۆن و داوای هیچ مەکەن و لێی جیابوومەوە.

بەوەی بیرۆکەیەکی وا نایابم بە خەیاڵدا هاتبوو، دڵخۆش بووم لە خۆشیدا دەستەکانم لە یەک دەخشاند و بە دەنگی بەرز قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد، چێژ لەوە زیاتر چییە، کە مرۆڤ پێ بنێتە هەر شوێنێک کارێکی خێر بکات، ڕەنگە هەر ئەم ڕەفتارەم کار لە ڕۆحی ئەم

مەخلوقە گومڕا و داماوە بکات، ڕزگاری بێت و بچێتە سەر ڕێی ڕاست.

ئیتر ڕەنگە تا کۆتایی تەمەنی، هەرکات بیری بکەوێتە سوپاسگوزاریی من بێت، تەنانەت لە سەرەوەختی مەرگیش بە دڵێکی منەتبارەوە یادم دەکات. بەهەرحاڵ، داوێنپاکی شتێکی باشە و چاکەش بێ پاداشت نامێنێتەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەش زۆر ڕووکراوە و دڵخۆش بووم، خۆم گرجوگۆڵ دەبینی و هەستم بە هێزێکی زۆر دەکرد لە خۆمدا، خۆزگە مۆمێکم هەبوایە و وتارەکەم تەواو بکردایە، بەدەم ورتەورت و فیکەلێدانەوە هەنگاوم دەنا، کلیلە تازەکەی ماڵەکەم بە نووکی پەنجەم دەخولاندەوە، بیرم دەکردەوە چۆن چرا یان ڕووناکییەک بۆ ژوورەکەم دەستەبەر بکەم، تاکە چارەسەر ئەوە بوو کە پێویستییەکانی نووسین بهێنم و لە ڕووناکی چراگازەکەدا دەست بەکار بم.

دەروازەی ماڵە گەورەم کردەوە و بۆ هەڵگرتنی کاغەز و یادداشتەکانم ڕۆیشتمە سەرەوە، لە کاتی هاتنەخوارەوەش دەرگاکەم لە دەرەوە بە کلیل قوفڵ کرد، لەبەر ڕووناکیی چراگازەکەی دەرەوە دانیشتم، هەموو شوێنێک بێدەنگ و هێمن بوو، وەک ماستی مەییوو، تەنها دەنگی قورسی پێی پاسەوانێک، کە لە کۆڵانی **ترافرسیەر** هەنگاوی دەنا، بەرگوێ دەکەوت لە دوورەوە نزیک گردی **سانتارهانس** سەگێک دەوەڕی. هیچ هۆکارێک نەبوو بۆ نیگەرانی. ملیوانەی چاکەتەکەم تا بناگوێم بەرز کردەوە و هەستیشم چڕ کردەوە و دەستم کرد بە بیرکردنەوە، ئەگەر کۆتاییەکم بۆ نووسینەکەم بدۆزیبایەتەوە، کارەکەم زۆر ئاسانتر دەبوو، ڕێک لە شوێنێکی هەستیار و وردەکاریی وتارەکەدا گیرم خواردبوو، دەبوو بۆ پەیوەستکردنەوەی دوو ناوەڕۆک لەگەڵ یەکتر، فێڵێک بدۆزمەوە، کە بەرچاو نەبێت و بەهۆیەوە ئەنجامی وتارەکەی لێ وەربگرێت، ئەم ئەنجامە دەبوو توند و ڕاشکاو بێت، وەکە تۆپێک دەنگ بداتەوە، وەک

شاخیک بتەقینەوە و خوێنەر گێژ بکات و بیحەپەسێنێت! خاڵێکم لە سەر کاغەزەکە دانا و چاوەڕێم کرد، بەڵام هیچ وشەیەکم نەدەهاتە مێشکەوە.

جارێکی تر بە نووسینەکەدا چوومەوە، دێڕەکانم یەکبەیەک بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە، ئەخێرەن نەمتوانی تەرکیز بکەم و بەهیچ شێوەیەک نەمتوانی دێڕەکانی کۆتایی، کە هێز و کاریگەریی وتارەکەی پێوە پەیوەست بوو، بنووسم. لەم کەینوبەینەدا کتوپڕ پاسەوانە گەڕۆکەکە هاتە ناوەڕاستی کۆڵانەکە و لای من وەستا، بەیەکجاری هەستەکانمی شڵەژاند، حاڵەتی ئامادەی و ئیلهامی منی وێران کرد، پاسەوانەکە نەیدەزانی خەریکی چیم و بەلاشیەوە کەی گرنگە، من خەریکم وتارێک بۆ **کماندۆر** دەنووسم یان نا، کۆتایی وتارەکەم باش دەردەچێت یان نا.

چیتر هەرچەند زۆرم لە خۆم کرد، مەحاڵ بوو دیسان بیرکردنەوەم ئامادە و زەینم ئامادە بکەمەوە بۆ نووسین.

سەعاتێکی تر لەوێ دانیشتم، پاسەوانەکە ڕۆیشت، بەڵام هەوا کەمکەم بەڕادەیەک سارد دەبوو، کە مەحاڵ بوو بتوانم لە کۆڵانەکە بمێنمەوە، ئەمجارەش نەگەیشتمە هیچ و دڵتەنگ و بێهیوا دەرگای ماڵەکەم کردەوە، ڕۆیشتمە ژوورەکەم. هەوای سەرەوە سارد و ژوورەکە بەڕادەیەک لێڵ و تاریک بوو، کە بە ئاستەم پەنجەرەکەم دەبینی، کوێرە کوێر بەرەو چرپاکەم ڕۆیشتم، پێڵاوەکانم داکەند و قاچەکانم بۆ گەرمکردنەوە خستە بەینی هەر دوو دەستمەوە، دواتر وەک عادەتی هەمیشەیی بە جلەوە ڕاکشام. هەر لەگەڵ هاتنی سپێدە و خۆرکەوتن، لە جێگەکەی ڕاپسکاو و لە سەر چرپاکە دانیشتم، خۆم بە نووسینەوە سەرقاڵ کرد، تا نیوەڕۆ سەرقاڵی کارکردن بووم، دە بۆ بیست دێڕی ترم نووسی، بەڵام دیسان نەمتوانی وتارەکە تەواو بکەم. پاشان لە جێگەکەم هەستام و پێڵاوەکانم لەپێ کرد، بۆ ئەوەی خۆم گەرم بکەمەوە لە پانی و درێژی ژوورەکەدا، هاتوچۆم دەکرد. لە بەر

سەرما شووشەی پەنجەرەکە بەستبووی، سەیری دەرەوەم کرد، بەفر دەباری.
چینێکی ئەستووری بەفر، بەلۆعەی ئاوەکە و حەوشەکەی داپۆشیبوو. بە ژوورەکەدا دەهاتم و دەچووم. لە خۆڕا سەیری دیوار و دەرگاکەم دەکرد، بە نینۆک دیوارەکەم دەڕووشاند و ناوچاوانم بە هێمنی دەنا بە دەرگاکەوە، بە پەنجەی دۆشاومژ دەمکێشا بە بنی ژوورەکەدا، گوێم هەڵدەخست، ئەم کارانەم بەڕادەیەک هێمن و وریا دەکرد، وەک ئەوەی سەرقاڵی کارێکی زۆر گرنگ و جددی بن، ئەوەندە بەرز قسەم دەکرد گوێم لە دەنگی خۆم بوو و بەردەوام دەمووت: خوایە مەگەر شێت بووم؟ دواجار دوای ماوەیەکی درێژ، کە ڕەنگە دوو سەعاتی خایاندبێت، هەموو هێزی خۆم کۆکردەوە، گازم لە لێوەکانم گرت و خۆم بێجووڵە و قنجوقیت وەستاند، دەبێ یەکلایی بکەمەوە! کەمێک پووشم بۆ جووین هەڵگرت و شێلگیرانە خۆم بە نووسینەوە سەرقاڵ کرد.
بۆ بەرەوپێشچوونی کارەکە، هەرچۆنێک بێت بیست وشەی سوواوم دۆزیەوە، زۆر بە زەحمەت چەند دێڕێکی کورتم پێکەوە نووساند. دواتر وەستام، چونکە مێشکم خاڵی بووبوو و نەمدەتوانی زیاتر بنووسم، چاوم بڕییە دواوشەکانی ئەم نووسنە ناتەواوە، بە نیگایەکی مات پێتە لەرزۆکەکانم، کە وەک دەموچاوێک لە ناو لاپەڕەکانەوە سەریان دەرکردبوو، تەماشا دەکرد، دواجاریش لە ماناکەیان تێنەدەگەیشتم و مێشکم لە ئیش دەکەوت، ئیتر نەمدەتوانی بیر لە هیچ بکەمەوە.
کات تێدەپەڕی، هەراوهوریای کۆڵان و دەنگی پێی ئەسپەکان و ئەسپوعارەبانەکان بەرگوێ دەکەوێت، گوێم لە دەنگی **ئینس ئۆلای** بوو، کە لە تەویلەکە لەگەڵ ئەسپەکان قسەی دەکرد، تەواو مەنگ و خەڵەفا بووم، هیچیشم پێ نەدەکرا، بە نەرمی زمانم تەڕ دەکرد، هەوا کەمکەم تاریک دەبوو، ماندوویێتی وڕی کردم و زیاد لە جاران سڕ و

گێژ بووم، دیسان لە سەر چرپاکە ڕاکشام، پەنجەکانم لە هەموو لایەکەوە دەخستە ناو قژمەوە، تا بەشکو گەرمیان بکەمەوە و هاوکات هەر بە پەنجەکانم، قژی شێواوم کە بە سەر سەرینەکەدا پەرشبووبوو، سافورێک دەکردەوە، سەیر ئەوە بوو ئەم کارە بێویستی خۆم و بێ هیچ ئاگادارییەک ئەنجام دەدا، ئەوکات هێشتا قژم زۆر و پڕ بوو، هەوڵم دەدا ئەو سڕییە سەیرەی کە بەسەر دەروونمدا زاڵ بووبوو، وەک تەمێکی چڕ هەموو گیانی گرتبوومەوە، لە کۆڵ خۆم بکەوە، دانیشتبووم و بە لەپی دەست دەمکێشا بە ئەژنۆمدا، تا ئەو شوێنەی سینگم بیتوانیایە کۆکەی قووڵم دەکرد، بەڵام دیسان نیوەبێهۆش کەوتم، چاوم بەرەو میچی ژوورەکە دەیڕوانی، وەک بڵێسەیەکی نیوەگیان بەرەو خامۆشی دەچووم، چارم نەبوو و دەردیشم بێ دەرمان بوو، پاش ئەو هەموو هەوڵە بێهوودەیە، نائومێدانە پەنجەی شایەتمانم خستە دەممەوە و ماوەیەک مژیم، هێواش هێواش مێشکم کەوتەوە ئیش و بیرۆکەیەکی تیایدا بریسکایەوە، ئەو بیرکردنەوە شێتانەیە لە کەللەی دام گاز لە پەنجەم بگرم، بێ هیچ وەستانێک چاوم داخست و پەنجەی ناو دەمم زۆر بە توندی گەست، لەپڕ لە جێگەکەم دەرپەڕیم و هاتمەوە خۆش خۆم، خوێن لە پەنجەم دەچۆڕا و دەملێسایەوە، برینەکە زۆر گرنگ نەبوو و ئێشوئازاری زۆر نەبوو، بەڵام لەناکاو ڕایچەڵەکاندم و هێنامییەوە هۆش خۆم، سەرم ڕاوەشاند و بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتم، بۆ ئەوەی پەڕۆیەک بۆ برینپێچکردنی پەنجەم بدۆزمەوە، لەم کاتەدا فرمێسک لە چاومدا قەتیس بوو، لە ناوەوە بۆ حاڵی خۆم گریام، ئەم پەنجە برینداره باریکە، حاڵەتێکی زۆر خەمگینی هەبوو، ئەی خوای ئاسمان! بڕوانە و ببینە چیم لێقەوماوە!

تاریکی زیاتر دەبوو، ئەگەر مۆمێکم هەبوایە ڕەنگە بە یەک شەو وتارەکەم تەواو بکەم، چونکە مێشکم دیسان ڕوون بووبووەوە و هێزی بۆ گەڕابووەوە، هزر و بیرکردنەوە ئاسان بە خەیاڵمدا ڕەت

دەبوون، خەم و دڵتەنگییم نەبوو و تەنانەت پێچەوانەی چەند سەعاتی پێشوو هەستم بە برسێتی نەدەکرد، بە جۆرێک تا سبەی دەمتوانی خۆم ڕابگرم، ڕەنگە ئەگەر سەرێکم لە دووکانی وردەفرۆشی، کە باش دەیناسیم بدایە و ڕاستیی مەسەلەکەم بۆ باس بکردایە، مۆمێکی بە قەرز پێ بدامایە.

لە ڕۆژە خۆشەکان، ئەوکاتەی پارەم هەبوو زۆربەی جار لەوێ نانم دەکڕی و لەبەر دەستودڵی کراوەم پێگەیەکی باشم لەوێ هەبوو، هەربۆیە گومانم نەبوو، کە لە مۆمێک بێبەشم ناکات، ئەگەرچی لە تاریکیی ژوورەکەمدا شوێنێکم نەدەبینی، جلەکانم بە شاڵ پاک کردەوە و تاڵە قژەکانم کە بەسەر چاکەتەکەمدا هەڵوەریبوو، تەکاند. ماوەیەکی زۆر بوو کاری وام نەکردبوو، دواتر کوێرەکوێر بە پلیکانەکاندا هاتمە خوارەوە.

کە پێم نایە کۆڵانەکە، وام هەست کرد، باشترە لەبری مۆم، نان قەرز بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی دوودڵ بووم، وەستام و ماوەیەک هێنام و بردم، دواجار وتم جا کڕینی نان بۆچی، چونکە بەداخەوە حاڵم بە جۆرێک بوو، هەرچی بە قورگمدا بڕۆیشتایەتە خوارەوە، گەدەم وەری ناگرێت، دیسان ئەوەندەی تر سەرم قورس و خراپتر دەبێت، وەهم و خەیاڵی سەیر و بێتاقەتیی ڕۆحی، گیرۆدەم دەکات، جگە لەوەش جارێ دەبێ وتارەکە تەواو بکەم، تا زووە بڕۆمە لای **کماندۆر**، چونکە ڕەنگە مەسەلەکە لە بیر بکات، کەواتە وەرگرتنی نان بە هیچ شێوەک باش نییە! دواجار بڕیارم دا مۆم وەربگرم و یەکسەر ڕۆیشتمە ناو دووکانی وردەفرۆشییەکە.

ژنێک خەریکی کڕینە و نزیک لە من چەند پاکەتێکی بچووک، کە لە کاغەزی جۆراوجۆرەوە پێچراون، لە سەر مێزەکە داناوە، شاگردی دووکانەکە، کە زۆرباش دەمناسێت و دەزانێ بەزۆری چی دەکڕم، وازی لە ژنەکە هێنا و بە هەڵەداوان هاتە لام و بێ پێشەکی، نانێک لە ڕۆژنامەیەک دەپێچێت و دەیداتە دەستم و چاوەڕواننەکراو دەڵێم:

- "نا، ئەمشەو پێچەوانەی جاران مۆمێکم دەوێت!"

ئەم دێرە بە ئاوازێکی هێمن و مەزلوومانە دەڵێم، بەشکو بەزەیی بجوڵێت و مۆمەکەم بە قەرز پێ بدات، وەڵامەکەم حەپەساندی، چونکە یەکەمجارە جگە لەجیاتی نان، داوای شتێکی تر دەکەم. لە وەڵامدا وتی:

- "دەی ئێستا کەمێک ڕاوەستن و یەکسەر گەڕایەوە بۆ بەڕێکردنی مشتەرییەکە."

ژنەکە شتەکانی هەڵگرت و پێنج کرۆنییەکی پێدا، باقییەکەی وەرگرت و ڕۆیشت، ئێستا ئێمە هەردووکمان تەنیاین، شاگردی دووکانەکە و من! ڕووم تێدەکات و دەڵێت:

- "فەرمووتان مۆمتان دەوێت؟"

پاکەتێکی کردەوە و دانەیەکی دەرکێشا، هەردووکمان سەیری یەکتر دەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەی داوای قەرزەکە هاتۆتە سەر نووکی زمانم ناتوانم بیڵێم، لەم کاتەدا دەڵێت:

- "ئەها، باش بوو بیرم کەوتە! خۆ پارەکەتان دا!"

ئەمە دەڵێت و خەریکی ژماردنی پارەی ناو دەخیلەکە دەبێت؛ پارەی بریقەداری گەورە یەکبەیەک دەژمێرێت، باقی پارە پێنج کرۆنییەکە کە ژنەکە پێی داوە، دەداتە من و دەڵێت:

- "فەرموو ئەمەش باقییەکەی!"

بۆ ماوەی چرکەیەک سەیری پارەکە دەکەم، هەڵبەت دەزانم هەڵەیەک ڕووی داوە، بەڵام هیچ خۆم تێناگەیەنم، لە بەردەم ئەم گەنجینە دۆزراوەیە، کە لە بەرچاوم لە سەر مێزەکە هەڵی ڕشتووە و دەبریکسێتەوە، دۆشداماوم و لە خۆوە پارەکە هەڵدەگرم، بەڵام هێشتا حەپەساوم، دواجار هەنگاوێک بەرەو دەرگاکە دەڕۆم و دیسان دەوەستم، چاو دەبڕمە خاڵێکی سەر دیوارەکە، لە سەروو دەستەیەک قەیتانی پێڵاو، زەنگۆڵەیەک بە دەسکێکی چەرمەوە بە دیوارەکەدا هەڵواسراوە، منیش مات و حەپەساو چاوی تێدەبڕم، بەوپێیەی پەلەی

ڕۆیشتنم نییە، شاگردی دووکانە وادەزانێت دەمەوێ شتێک بڵێم، بەردەم ڕێککردنەوەی چەند کاغەزێک کە لە بەردەمیدا دانراوە، دەڵێت:
"بەڵێ وادیارە زستان بەڕێوەیە."
"بەڵێ، وادیارە زستان خەریکە دەگات و..." دەشڵێم: "ئەوەندەش درەنگ نەهاتووە، بەڕاستی ئیتر هیچمان نەماوە بۆ زستان، درەنگیش نییە، کاتی خۆیەتی..."
خۆیشم هەست بە قۆڕی قسەکەم دەکەم، بەڵام دەتوت هەر وشەیەکی ئەم قسانە لە زمانی کەسێکی ترەوە دەیانڵێم. شاگردی دووکانەکە درێژە بە قسەکان دەدات و دەڵێت:
" ئای! کەواتە بەڕاست پێتانوایە زستان هاتووە؟"
دەستم خستە گیرفانمەوە و خستمە سەر پارەکە، دەسکی دەرگاکەم بادا و لە دووکانەکە هاتمە دەرەوە، دەنگی خۆم کە خواحافیزیم کرد و شاگردەکە کە وەڵامی دامەوە نەبیست.
هێشتا چەند هەنگاوێک دوورنەکەوتبوومەوە، دەرگای دووکانەکە بە توندی کرایەوە و شاگردەکە بانگی کردم، بێ سەرسوڕمان و بە ئاسوودەیی گەڕامەوە و پارەکانم بۆ گەڕاندنەوە ئامادە کرد، شاگردی دووکانەکە وتی:
"ببوورن مۆمەکەتان بەجێهێشت."
بەوپەڕی ساردوسڕییەوە وتم:
"ئەها، باش بوو پێتان وتم، سوپاس، مەمنونم، زۆر مەمنونم."
مۆمەکەم هەڵگرت و دیسان هاتمە دەرەوە و کەوتمەڕێ، هەموو هۆشم لای پارەکە بوو، ڕۆیشتمە شوێنێکی ڕووناک و پارەکانم دەرهێنا و ژماردم، لە دەستمدا کێشانەم کرد و لە دڵخۆشیدا پێدەکەنیم، بەم جۆرە لە کۆتاییدا بەهۆی ڕێکەوتێکی زۆر گەورەوەی پەرجووئاسا، بۆ ماوەیەکی درێژ، ماوەیەکی زۆر درێژ، لە بێ پارەیی و داماوی ڕزگارم دەبێت.

بەهەرحاڵ، دەستم بە توندی خستە سەر ئەو گیرفانەم کە پارەکەی تێدا بوو، دەستم بە جووڵە کرد، لە **شەقامی گەورە** لە بەردەم دووکانێکی خواردەمەنی وەستام، هەستەکانم چڕ کردەوە و بیرم لەوە کردەوە چۆنە پێش هەموو شتێک ژەمێکی چاک بخۆم! دەنگی بەرکەوتنی قاپەکان و چەقۆکان و کوتانی گۆشت دەگاتە گوێم، برسیترم دەکات. بێ بیرکردنەوە دەڕۆمە ناو ڕیستورانتەکە و داوای پارچەیەکی گەورە گۆشتم کرد، ژنە خزمەتکارەکە لە کونێکەوە کە دەگەیشتە لای شێفەکە، بە دەنگی بەرز وتی:

- گۆشتی برژاو!

لە پشت مێزێکی چۆڵی نزیک دەرگاکە دانیشتم و چاوەڕێی خواردنەکەم کرد، شوێنێک کە دانیشتبووم کەمێک تاریک بوو و هەستم دەکرد بەتەواوی لە چاوان ون بووم، ئەوسا کەوتمە نێو دەریای بیرکردنەوەوە، ژنە خزمەتکارەکە جاروبار بە نیگایەک، کە بەدەر نەبوو لە پرسوجۆ و فزوولی سەیری دەکردم.

بەڵێ، یەکەم جار بوو کە تووشی کردارێکی نایاسایی، یان باشترە بڵێم دزی هاتبووم، هەموو نییەت و ڕەفتاری ڕابردووم بەراورد بەم کارە هیچ نەبوو... ئەمە یەکەم هەڵەی بچووک یان گەورەی من بوو، بەرەو لێژایی و تیاچوون دەیبردم، ئای! ئەمە کەی گرنگە! تەنیا یەکجار ئەمە ڕوو دەدا و دوای ئەوە ئیتر هەرگیز دووبارە نابێتەوە، هەروەها هەرکات وەزعم باشتر بوو، دەتوانم مەسەلەکە بۆ دووکاندارەکە باس بکەم، قەرەبووی بکەمەوە و ئاشتی بکەمەوە، جگە لەوەش مەگەر بڕیارە من لە خەڵکی تر دەستپاکتر بم! خۆ ماڵم نەخەواندووە پێ لە ڕێگەی ڕاست دەرنەکەم! منیش کەسێک بووم وەک مرۆڤەکانی تر...

پرسیارم کرد:

- "گۆشتەکە زۆری پێدەچێت؟"

ژنه خزمەتکارەکە دەرگای کونەکەی کردەوە، سەیرێکی موبەقەکەی کرد و وتی:

"هەر ئێستا ئامادە دەبێت."

ئێ! گریمان مەسەلەکەش ئاشکرا بوو، گریمان شاگردی دووکانەکە گومان بکات و بیری نانەکەی بکەوێتەوە، پێنج کرۆنەکەی بیر بکەوێتەوە، کە باقییەکەی دایەوە بە من و باش بیر بکاتەوە، ئەی ئەوکاتە چی دەقەومێت؟ دوور نەبوو ئەگەر جارێکی تر پێم نایە دووکانەکە بیری بکەوێتەوە، شانم هەڵتەنکاند و بە خۆم دەوت خوا گەورەیە بۆ ئەو کاتەش!

لەم کاتەدا ژنە خزمەتکارە خواردنەکەی لە سەر مێزەکە دانا و بە ڕووخۆشییەوە وتی:

"فەرموون، ئەمەش گۆشتەکەی ئێوە!... ئێرە زۆر تاریکە، باشتر نییە بڕۆنە ژوورەکەی تر؟"

"نا، زۆر سوپاس، ئێرە باشترە."

میهرەبانییە پاکەکەی ئەم ژنە بەڕادەیەک کاری تێکردم، کە نەک هەر پارەی خواردنەکەم دا، بەڵکو دەستم کردە گیرقانم و چیم بەدەستەوە هات دەرمهێنا و وەک شاگردانەیەک خستمە دەستییەوە، بزەیەکی شیرینی هاتە سەرلێو و منیش، کە چاوم بە فرمێسک تەڕ بووبوو، بە گاڵتەوە وتم:

"باقییەکەشی بۆ خۆتان، ئیشەڵا بەرەکەتی تێدەکەوێت و ڤێلایەکی پێ بکڕن!"

ئەمەم وت و دەستم کرد بە خواردن، بەرەبەرە چڵێستر و نەوسنتر دەبووم، پارووی گەورەم دەخستە دەممەوە و بێ جووین قووتم دەدا، پلەگۆشتی کولاوم وەک وەحشییە مرۆڤخۆرەکان هەڵدەلووشی، خزمەتکارەکە نزیک کەوتەوە، کەمێک چەمییەوە و پرسی:

"حەز بە هیچ جۆرە خواردنەوەیەک ناکەن؟

دواتر بە ئەسپایی و شەرمەوە وتیشی:

- "بۆ نموونە نیوبوتڵ بیرە یان هەر خواردنەوەیەکی تر، ئەگەر حەزتان لێی بێت... ئەگەر قبوڵیش بفەرموون... ئەمەیان میوانی منن..."
- "نا، ئێستا نا، ئیشەڵا جارێکی تر کە هاتم".

لێم دوورکەوتەوە و ڕۆیشتە پشت مێزی پێشوازی و من تەنیا سەریم دەبینی، بەڕاستی چەند مەخلوقێکی سەیر بوو!

هەر کە خواردنەکە تەواو بوو هێڵنجم هات و بە جووڵەیەک خۆم گەیاندە دەرگاکە، خزمەتکارەکەش لە جێگەکەی هەستا، دەترسام ڕووناکی لە دەموچاوم بدات، تۆقیبووم نەوەک ژنەکە کە بەهیچ شێوەیەک نەیدەزانی ئەوەندە بێ پارە و لاتوپووتم، بمبینێت. تا بکرایە خۆم نیشان نەدەدا و هەربۆیە زۆر بەخێرایی خواحافیزیم کرد، کەمێک نووشتامەوە و ڕۆیشتمە دەرەوە، بەهێواشی کاریگەریی خواردنەکە دەرکەوت، بێگومان نەمدەتوانی ماوەیەکی زۆر خواردنەکە لە گەدەمدا بهێڵمەوە، زۆر بێتاقەت بووم، لە ڕێگەدا دەگەیشتمە هەر پەنایەکی چۆڵ و تاریک کەمێک دەرشامەوە، لەتاو هێڵنج و ڕشانەوە وەختبوو ڕێخۆڵەکانم دەپچڕا، بەردەوام هەوڵم دەدا خۆم هێمن بکەمەوە، دەستی قونجاوم دەگووشی و بە زەحمەت خۆم بە پێوە ڕادەگرت، بە نووکەپێ دەمکێشا بە زەویدا و چی لە قورگمدا دەهاتە دەرەوە، بەتوڕەیی فڕێم دەدا، بەڵام سوودی چی بوو! بە جۆرێک خۆم لوول دەکرد و ئاو لە چاومەوە دەردەپەڕی، کە هیچ شوێنێکم نەدەبینی، زۆر توڕە بووم بە دەست خۆمەوە و بە گریانەوە بە شەقامەکەدا دەڕۆیشتم، نەفرەتم لەو شەیتانە گڵاوانە دەکرد کە ئەوەندە ئازارم دەدەن، حەواڵەی قورسترین سزا و ئاگری دۆزەخ و ئەشکەنجەی تاهەتاییم دەکردن، ئەم شەیتانە بەدکارانە کە دەستبەردارم نەبوون، فریان بە جوامێری و ویژدانەوە نەبوو! لەم کاتەدا پیاوێکم بینی کە بە چاوی ڕاماوەوە سەرقاڵی تەماشای سندووقی ئاوێنەداری دووکانێک بوو، ڕێک بەرەو لای ڕۆیشتم و لێم پرسی:

"ئایا دەزانن ئەگەر کەسێک ماوەیەکی زۆر هیچی نەخواردبێت، دەبێ چی بخوات؟... گەدەی ئەم کەسە بەرگەی گۆشتی کولاو ناگرێت و گیانیشی لە برسا لە مەترسیدایە."

پیاوەکە کە پرسیارێکی چاوڕواننەکراو بەرۆکی گرتبوو وتی:

"بیستوومە لەم کاتانەدا شیر باشە بەومەرجەی کولاو بێت."

"ڕاستە! زۆر سوپاس، شیر خراپ نییە، لانیکەم شیری کولاو نابێ خراپ بێت."

ئەمەم وت و ڕۆیشتم، کە گەیشتمە یەکەم قاوەخانە چوومە ژوورەوە و داوای شیری کولاوم کرد، شیرە کولاوەکەم هەڵقوڕاند، پارەکەم دا و دیسان بەرەو ماڵەوە کەوتمە ڕێ، لەم کاتەدا ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا.

لە دوورەوە، لە بەردەم دەروازەی ماڵەوە، تارمایی ژنێک دەبینم، کە پاڵی بە دارتێلی چراگازەکەوە داوە و هەموو جەستەی لە ڕۆشنایییدایە... ئەم خانمە کە ڕێک و بێجووڵە لە شوێنی خۆی وەستاوە، هەمان ژنە ڕەشپۆشەکەیە، کە شەوانی پێشوو بینیبووم، بێگومان ئەمە چوارەم جارە کە لەم ناوە دەردەکەوێت، بابەتەکە بەڕادەیەک نائاساییی دیارە کە لە خۆمەوە هەنگاوەکانم هێواش دەکەمەوە، بەرەو پێشەوە دەچم، لەم کاتەدا بیرکردنەوەم لەسەرخۆیەتی و ئاگاشم لە خۆمە، بەڵام بەهۆی ئەو خواردنەی خواردوومە هەست بە شڵەژان و خرۆشێک دەکەم، زەینم وروژاوە، بەشێوەیەکی ئاسایی نزیکی دەکەومەوە و دەگەمە نزیک دەرگای ماڵەوە، ئامادە دەبم بڕۆمە ژوورەوە، لەناکاو بیرۆکەیەک بە خەیاڵمدا دێت، دەوەستم و لەخۆڕا بەرەو لای دەچم، دەچمە بەردەمی و سڵاو دەکەم، وەڵامی سڵاوەکەم دەداتەوە، داوای لێبووردنی لێدەکەم و دەپرسم کە ئایا ئیشی بە کەسێکە و پارەی دەوێت؟ دیسان داوای لێبووردنی لێدەکەم کە ئەم پرسیارەم کردووە، وەڵامێکی ئاشکرای نییە، دیسان بۆی ڕوون دەکەمەوە کە لەم ماڵەدا جگە لە من و چەند

ئەسپێک کەسی تری لێ ناژێ، چونکە بەشێک لە ماڵەکە تەویلە و بەشەکەی تریشی دووکانی تەنەکەچییە، ئەگەر ئێشی بە کەسێکە ڕەنگە هەڵە هاتبێت و لێی تێکچووبێت.

ڕووی وەردەگێڕێت و دەڵێت:

- "ئێشم بە کەس نییە و لە خۆمەوە حەز دەکەم لێرە بوەستم!"

تازە تێگەیشتم مەسەلەکە چییە! خانم حەزی کردووە هەموو شەوێک لەم شوێنە بوەستێت، بەڵام ئەم کارە بەڕاستی سەیر دیارە! چەند بیرم لێ دەکردەوە ئەقڵم نەیدەبڕێ، بارودۆخی سەیروسەمەرەی ئەم خانمە زیاتر دەیحەپەساندم، دواجار بڕیارم دا تۆزێک پیاوەتی بنوێنم، دەست بۆ گیرفانم برد و زرینگەم لە پارەکان هەستاند و بێ پێچ پێشەکییەک بانگهێشتم کرد، ئەگەر پێی خۆش بێت پێکەوە بڕۆینە شوێنێک و پێکێک شەراب بخۆینەوە... بە خۆشی دەستپێکی زستانەوە شەراب هەڵدەین! باسی ئەوەشم بۆ کرد کە زۆر لە کاتی ناگرم.

پێشنیارەکەمی قبوڵ نەکرد، بەڵام سوپاسی بانگهێشتەکەی کرد، چونکە دەیوت نەیدەتوانی مل بۆ ئەم کارە بدات، کە زۆر باش دیار نییە، بەڵام بێگومان حەز دەکات چەند هەنگاوێک لەگەڵی بڕۆم، زۆر سوپاسی ئەمەی کرد، چونکە ڕێگەی ماڵەوەی زۆر تاریکە و ئەم کاتەی شەویش باش نییە، تاکوتەنیا بە شەقامی **کارل یۆهان** تێپەڕێت.

هاتە لای ڕاستمەوە و کەوتینەڕێ، بەوەی خۆم لە پاڵ خانمێکدا دەبینی و شانبەشانی دەڕۆیشتم، هەستێکی بەرز لە مندا دروست بوو، بە درێژایی ڕێگەکە خەیاڵم لای ئەو بوو، هەر سەری دەسوڕاند بۆنی خۆشی هەناسەی بەر لوتم دەکەوت، بۆنی خۆشی قژی سەرمەستی دەکردم، لە جەستەیەوە بۆنێکی ژنانە بڵاو دەبووەوە و گەرمییەکی دڵگیری هەبوو، هەر ئەمەش بێئاگای دەکردم و بە قووڵی ڕۆدەچووە ناو هەستەکانمەوە، تەنها دەموچاویم دەبینی، دەموچاوێکی گۆشتنی هەبوو، کە بە تۆڕێکی تەنک داپۆشرا بوو، کەمێک ڕەنگپەڕیو دەردەکەوت.

بەرزیی مەمکە قوتەکانی لە ژێر ڕووپۆشەکەیەوە دیار بوو، وێناکردنی ئەم هەموو سۆز و جوانییە کە لە ژێر ڕووپۆشەکەوە شاراوە بوو، شێتوشەیدای دەکردم، نازانم لەبەر چ هۆکارێکی گەمژانە خۆم بە بەختەوەر و دڵخۆش دەزانی، دواجار بەرگەم نەگرت و دەستم بۆ برد، لە خۆمەوە پێدەکەنیم و دەستم بە شانیدا دەهێنا و لەم کاتەشدا گوێم لە ترپەی دڵی بوو.

وتم:

"بەڕاستی ئێوە ئینسانێکی سەیرن!"

وتی:

"مەبەستتان لەم قسەیە چییە؟"

ئەوسا بۆم باس کرد، سەرسوڕمانی من ئەوەیە کە بۆچی هەموو شەوێک حەز دەکات بێ مەبەستێکی دیاریکراو، لە بەردەم دەرگای تەویلەکە بوەستێت، وتی بێگومان مەبەستێکی هەیە کە نایەوێت بیلێت، جگە لەوەش عادەتی وایە درەنگ بخەوێت و زۆر حەزی لە شەونخوونییە، دواتر لە منی پرسی ئایا حەز دەکەم پێش نیوەشەو بخەوم؟

وتم:

"حەیفتان نەکرد، منیش زۆر ڕقم لەوەیە پێش نیوەشەو بخەوم!"

وتی:

"ئێستا لە دەردی من تێدەگەن؟"

بەڵێ، ئەویش خووی بەوەوە گرتووە ئەو شەوانەی کە وەڕس دەبێت، خۆی بە شتێکەوە سەرقاڵ بکات، ماڵەکەی لە مەیدانی سانت ئۆلافە.

بە دەنگی بەرز وتم:

**ئیلایالیی من!**

پرسیاری کرد:

"وتتان چی؟"

- "هیچ! وتم **ئیلایالی**، شتێکی زۆر گرنگ نییه، قسەکەتان بکەن."

باسی ئەوەی کرد لەگەڵ دایکی دەژی و نزیک لە سانت ئۆلاف نیشتەجێن، ژیانێکی هێمن و بێدەنگ و گۆشەگیریان هەیە، گوێی دایکی بەڕادەیەک قورسە، کە بە زەحمەت دەتوانی قسەی لەگەڵ بکەیت، بەم پێیە ئایا هاتنەدەرەوەی ئەم دیسان جێی سەرسوڕمانە.

- "نەخێر، بەم شێوەیە بێت سەیر نییە."

به ئاوازی دەنگیدا زانیم خەریکە پێکەنینێک دەشارێتەوە.

زۆرباشە؟ ئێستا دەبێ بزانین درێژەی چیرۆکەکە چییە؟ خوشکی هەیە؟ پێی سەیر بوو من چۆن ئەمە دەزانم، بەڵێ، خوشکێکی هەیە لە خۆی بچوکترە، بەڵام ڕۆیشتووە بۆ هامبۆرگ، بەم دواییانە ڕۆیشتووە؟ نەخێر ماوەیەکە ڕۆیشتووە! نزکەی پێنج حەفتە دەبێت، بە زۆر دەیویست بزانێت من چۆن زانیومە خوشکی هەیە، هیچ ئاگام لەمە نەبوو و بەڕێکەوت ئەو پرسیارەم کرد.

دواتر هەر دووکمان بێدەنگ بووین، لەم کاتەدا پیاوێک کە جووتێک پێڵاوێکی خستبووە ژێرباڵییەوە، بە لای ئێمەدا تێپەڕی، جگە لە ئەو هیچ ڕۆحلەبەرێکمان نەبینی، تا ئەو شوێنەی چاوم بڕی دەکرد، کۆڵانەکە چۆڵوهۆڵ بوو، نزیک لە تیۆلی ڕیزێک چرای ڕەنگاوڕەنگ دەدرەوشایەوە، ئاسمان کراوە و ڕووناک بوو، بەفر نەدەباری.

کچەکە لەپڕ سەیرێکی کردم و بە ترسولەرزەوە وتی:

- "ئەی هاوار! خوایە گیان! ئێوە بێ پاڵتۆ سەرماتان نابێت؟"

پێویستی دەکرد بڵێم بۆچی پاڵتۆم نییە؟ ئایا باش بوو هەر لە سەرەتاوە، بێ وردبوونەوە ژیان و وەزعوحاڵی خۆم بخەمە بەردەستی و بیترسێنم و تەرەی بکەم؟ جگە لەوەش لەوە خۆشتر نییە ساتێک زیاتر ئاگای لە شتەکان نەبێت و خۆشم ئاسوودە و نائاگا لای بمێنمەوە، هەربۆیە لە وەڵامدا وتم بە هیچ شێوەیەک هەست بە سەرما ناکەم، هەروەها بۆ ئەوە بابەتەکە بگۆڕم پرسیارم کرد:

- "باخچەی ئاژەڵانی **تیڤوولی**تان بینیوە؟"

وەلامی دایەوە:
"نا، بەلام هەر بەڕاست شوێنێکی خۆشە؟"
"ئەگەر حەز بکەن سەردانی ئەوێ دەکەین."
هاتەوە بیرم کە ڕەنگە باش نەبێت لە ناو خەلکدا دەربکەوم، لە ڕووناکیدا سەروفەسالم ببینێت، چونکە بێگومان بێزار و بێتاقەت دەبێت، بە بینینی جلی شڕ و دەموچاوی وشک و لاوازم، کە دوو ڕۆژە ئاوی بەرنەکەوتووە، منی لێ دەبێزرێت... جگە لەوەش ڕەنگە بزانێت کە هێلەکم لە بەردا نییە.
هەربۆیە قسەکەم گۆڕی و وتم نەخێر، باوەڕ ناکەم ئەوە بهێنێت سەردانی بکەین، هەلەکەم قۆستەوە و لەخۆڕا چەند وشەیەکی سادە و ناوەڕۆکجوانم، کە لە مێشکە پەککەوتەکەمدا ئامادەم کردبوو و هاتە خەیالمەوە، خستمە خزمەتی و بۆ پشتڕاستکردنەوەی قسەکەشم وتم:
"چاوەڕێی چی لە باخچەیەکی ئاژەلانی تەنگ و پەرژینکراو بکەین؟ جگە لەوەش پێمخۆش نییە ئاژەلان لە ناو قەفەزدا ببینم، چونکە تێدەگەن کە خەریکە تەماشا دەکرێن و هەست بە سەدان نیگای فزوول دەکەن، کە ئاڕاستەیان کراوە و کە دەشکەونە ژێر کاریگەریی سەیرکردنی بینەرەکانەوە، حالەتی سروشتی و ڕەسەنی خۆیان لەدەست دەدەن، چەند خۆشە کە ئاژەلەکان هەر نەزانن کەس تەماشایان دەکات و چاودێرییان دەکەن، بەلێ، گیاندارێک شایانی تەماشایە، کە هەست بە مرۆڤ نەکات و ئازادانە لە هێلانە و کولانەکەی خۆیدا، بە چاوی سەوز و ماتەوە لە سووچێک لێی کەوتووە و چڕنووکی دەلێسێتەوە و بیردەکاتەوە، گیانداری ڕاستەقینە ئەمەیە!"
کچەکە قسەکانمی پشتڕاست کردەوە، من قسەکانم درێژە پێدا و وتم:
"ئەسلی مەسەلەکە ئەوەیە کە مرۆڤ، گیانداران لە حالەتی وەحشیبوونی ڕەسەندا ببینێت، بە بینینی ترسولەرز بکەوێتە دلییەوە، چەند خۆشە مرۆڤ لە تاریکیی ناکۆتای شەودا، دەنگی هەنگاوی

هێمن و شاراوەی گیانداره دڕەندەکان ببیستێت، گوێی له چرپەی ترسناکی دارستان و گڤەی با و هاواری مەلێک بگرێت، که به ئاسماندا دەڕوات! ئەوێ ژینگەی حەیوانییه و ڕۆحێکی دڕندانه بەسەر بوونیاندا زاڵه! لەوێیه که بۆنی خوێن بەرلووتی مرۆڤ دەکەوێت و دەنگی ترس له دوورەوه بەرز دەبێتەوه.

لێرەدا قسەکانم کورت کردەوه، دەترسام قسەڕیزکردنەکانم ماندووی بکات، لەپڕ لێقەومانی خۆم هاتەوه بیرم و ئەو هەستەش بەوپەڕی هێزەوه دەروونمی گرتەوه، بیرم کردەوه چەند خۆش بوو ئەگەر سەروشێوەیەکی ڕێکوپێکم هەبوایه، دەمتوانی بۆ پیاسەیەک بیبەمه **تیڤوولی** و دڵخۆشی بکەم، به ڕەفتاری ئەم کچه حەپەساببووم، تێنەدەگەیشتم پیاسه لەگەڵ بەرەڵایەکی نیوەڕووتی وەک من له شەقامی **کارل یۆهان**، چێژی چییه بۆ ئەو، خوایه مەبەستی چییه؟ ئەی بۆچی قبوڵم کرد لەگەڵی بێم و بۆچی له خۆمەوه پێدەکەنیم و خۆم فش دەکردەوه؟ بۆچی له خۆمەوه ملم بۆ ئەم پیاسه دووردرێژه دا، خۆم خسته داوی ئەم مەله ناسکەوه؟ خۆ دەمزانی تاقەتی ڕۆیشتنی زۆرم نەماوه.

کزەبایەک تا مۆخی ئێسقانەکانم هات، سەرمای مردنی دەڕژانده گیانمەوه، بەهۆی قوڕبەسەری و دەستکورتی بەردەوامەوه چەندین مانگی درێژ ڕۆحم ئاڵۆزکا بوو، گێژاوێکی شێتانه مێشکمی تەنیبوو، ئایا ئەمه خۆی نیشانەی شێتی نەبوو؟ بوونی ژنەکه نەیدەهێشت بگەڕێمەوه بۆ ماڵەوه، کوپێکی تر شیر بڕژمه قوڕگمەوه، ڕەنگه ئەمجاره گەدەم بەرگه بگرێت، ئاخر چی له منی داماو دەوێت و بۆچی نایەڵێت بڕۆمەوه به لای قوڕبەسەری خۆمەوه، بەڕادەیەک بێهیوا و کڵۆڵ بووم، که دواجار خۆم پێ ڕانەگیرا و پێم وت:

- خانم ئەگەر ڕاستیتان بوێت ئێمه نابێ پێکەوه پیاسه بکەین، بوونی ئێوه لەگەڵ من له بەرچاوی خەڵک باش نییه، ئەگەر هەموو شتەکانی تر بخەینه لاوه، تەنیا سەروشێوەی پەڕپووتی من بۆ ئێوه خۆش نییه،

ئەوەی بە مێشـــکمدا بێــت دەیڵــێم و پێویســـت ناکــات حاشـــای لە ڕاستییەکە بکەم.

حەپەسابوو و سەیرێکی کرد و وتی:

- "ئەی هاوار ئێوەش..." و قسەکانی تەواو نەکرد.

پرسیم:

- "مەبەستتان لەم قسەیە چییە؟"
- "گوێ مەدەنێ و داوای ڕوونکردنەوە مەکەن، چونکە زۆرمـان نەمـاوە و وا خەریکە دەگەین."

ئەمەی وت و هەنگاوەکانی خێراتر کرد، بەرەو کۆڵانی زانکۆ پێچمـان کردەوە، لەوێوە چراکانی مەیدانی **سانت ئۆلاف**مان دەبینی، لەم کاتەدا خێراییەکەی کەم کردەوە و منیش وتم:

- "ئەگەر فزوولی نەبێت ئایا دەکرێت پێش ئەوەی لە یەکتر جیـابینەوە، بڵـێن ناوتـان چـیـە و ئایـا دەکـرێ سـاتێکیش بـووە تـۆڕەکە لە سـەر دەموچاوتـان لادەن کە سـەیرێکتان بـکەم؟ ئەگەر تکـاکەم قبـوڵ بـکەن زۆر سوپاستان دەکەم."

کەمێک وەستام، وەڵامی دامەوە:

- "منتان پێشتریش بینیوە."

بـۆ دووەم جـار دیسـان وشـەی **ئیلایـالی**م وتەوە، بەڵام ئەو دیسـان درێژەی بە قسەکەی دایەوە و وتی:

- "ئێوە نیـوەڕۆژێکی تەواو تـا بەردەم مـاڵەوە دوای مـن کەوتـن، مەگەر ئەو ڕۆژە ئەوەندە سەرخۆش بوون کە بیرتان نەمابێت؟"

گـوێم لە دەنگـی پیکەنیـنەکەی بـوو، دانـم بەوەدا نـا کە بەداخەوە ئەو ڕۆژە ســـەرخۆش بـــووم، منـــی ســـەرکۆنە کـــرد و خۆیشـــم بە پەشیمانییەوە وتـم کارێکی خراپم کردووە، لەم کاتەدا گەیشـتینە لای فـوارەکە و هەردووکمـان وەسـتاین، سـەیری پەنـجەرە ڕووناکەکـانی بینای ژمارە ٢مان کرد.

لەوێ وتی:

- "لەمە زیاتر پێویست ناکات لەگەڵم بێن، سوپاس بۆ میهرەبانی ئەمشەوتان."

کڵاوەکەم هەڵگرت و سەرە رووتەکەم دانەواند، جورئەتی ئەوەم نەبوو شتێک بڵێم، نەمدەزانی ئایا دەیەوێت دەستی بۆ خواحافیزی بەرز بکاتەوە یان نا، بەڵام بەدەم سەیرکردنی نووکی پێڵاوەکانییەوە بەلاساریی‌یەوە وتی:

- "ئێستا ناتانەوێ منیش کەمێک لەگەڵتان بێم؟"
- "ئەگەر خۆتان حەز بکەن لە خوام دەوێت."
- "زۆرباشە کەمێک لەگەڵتان دێم."

گەڕاینەوە و دیسانەوە کەوتینەڕێ، زۆر شڵەژابووم و نەمدەزانی قوڕی کوێ بکەم بەسەرمدا، چونکە بوونی ئەم بوونەوەرە جوانە تەواو هەژاندبوومی، زۆر دڵخۆش بووم و خۆم بە نوقمی بەختەوەری دەزانی، چونکە بێ ئەوەی مەیلم نواندبێت، خۆی حەزی دەکرد و تەنانەت بە ئەنقەست دەیویست لەگەڵم بێت، بەدەم ڕۆیشتنەوە بەردەوام سەیری دەکەم و ورەم بەبەردا دبێتەوە، قسەکانی سەرنجم ڕادەکێشێت و هیوام پێ دەدات، بۆ ساتێک لە بەڵا و کارەساتی ژیان دووردەکەومەوە، قوربەسەری و وەزعی خۆم لە بیر دەکەم، وەک ئەوەی گەڕابێتمەوە بۆ سەردەمە خۆشەکانی ڕابردوو و وەک جاران، خوێنێکی گەرم و تازە ڕژابێتە گیانمەوە، بۆ ئەوەی پێشەکییەک دابنێم، بڕیارم دا فێڵێکی بچووک بخەمەکار و دەڵێم:

- "جاری پێشوو من دوای ئێوە نەکەوتبووم، بەڵکو بە دوای خوشکەکەتانەوە بووم."

بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە وتی:

- "یانی مەبەستتان خوشکەکەم بوو؟"

وەستا و سەیرێکی کردم و چاوەڕێی وەڵام بوو، دەتوت دەیەوێت بەڕاستی قسەم لێ دەربهێنێت.

لە وەڵامدا وتم:

- "هەڵبەت مەبەستم ئەوەیە، کە ئەو خانمەی لە ئێوە گەنجتر بوو، لە بەردەم مندا بووا"

لەپڕ وەک منداڵ لە دڵەوە دەستی کرد بە پێکەنین و وتی:

"وتتان گەنجتر بوو، بەڕاستی کەسێکی ساختەچین، لە مەبەستەکەتان تێگەیشتم، ئەم قسەیەتان کرد تا تۆڕەکە لە سەر دەموچاوم لاببەم... زۆرباشە، خۆتان بەرپرسیارن!"

دواتر دەستم کرد بە گاڵتە و پێکەنین، ماوەیەک قسەمان کرد و من نەمدەزانی دەڵیم چی، بەڵام زۆر پڕ وزە و کەیفساز بووم، بۆی گێڕامەوە ماوەیەک پێشتر جارێک منی لە شانۆ بینیوە، وادیارە من لەگەڵ سێ کەسی تر بووم و گاڵتەجارێم نواندووە، زۆر ترسا بوو چونکە بێگومان ئەوجارەش سەرخۆش بووم، بۆچی منی بە سەرخۆش زانیوە؟ بۆ ئەوەی زۆر پێکەنیوم؟ ڕاستی دەکرد، ئەو سەردەمە ڕۆژە خۆشەکانی من بوو و زۆر پێدەکەنیم، مەگەر ئێستا پێناکەنن؟ با ئێستاش پێدەکەنم چونکە ژیانم لا خۆشە!

کە دەگەینە شەقامی **کارل یۆهان**، ئەو دەڵێت با لەمە زیاتر دوور نەکەوینەوە، هەربۆیە دیسان دەگەڕێینەوە بۆ کۆڵانی زانکۆ و بەرەو سەرەوە دەڕۆین، کە گەیشتنە لای کانییەکە هەنگاوەکان خاوتر دەکەینەوە، چونکە دەمزانی نایەڵێت لەمە زیاتر لەگەڵی بم، لەوێ وەستا و وتی:

"ئێستا دەبێ ئێوە بگەڕێنەوە."

وتم:

"بەڵێ کاتی گەڕانەوەیە."

بەڵام ئەو ساتێک بیری کردەوە و وتی:

"دەتوانن تا بەر دەرگای ماڵی ئێمە بێن، خۆ عەیب نییە؟"

وەڵامم دایەوە بێگومان، بەڵام کە گەیشتینە نزیک دەرگای ماڵەکەی خەموخەفەتێکی لەبیرچوو، دیسان یەخەم دەگرێتەوە، کاتێ مرۆڤ بەم ڕادەیە لە ژیاندا کەوتە ژێر فشارەوە، بێگومان ورە و ڕۆحیەتی خۆی

دەدۆڕێنێت، دەمبینی من بە سەروچاوێکەوە کە لەتاو برسێتی خراپ گۆڕاوە، بە جلوبەرگی شڕ و شێوەیەکی پیس و پەڕپووتەوە، لە کاتێکدا جلوبەرگی پێویستم لە بەردا نییە، لە بەردەم ژنێکی گەنج و عەیاردام، حەزم دەکرد زەوی دەم بکاتەوە و قووتم بدات، لەخۆڕا خۆم بچووک کردەوە، کەمێک نوشتامەوە و وتم:

- "دەکرێ دیسانەوە بتانبینم؟"

هەڵبەت باوەڕم نەدەکرد قبوڵی بکات، حەزم دەکرد بە جوابێکی ڕەق هەموو شتێک ببڕێنێتەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە وتی بەڵێ پێمناخۆش نییە، پرسیم کەی؟ وتم نازانم کەی و وەستا، داوام لێکرد ئایا دەکرێ لوتف بنوێنێت و تەنیا یەک جار تورەکە لە سەر دەموچاوی هەڵگرێت؟ تەنیا ساتێک بۆ ئەوەی بزانم هاوقسەکەم کێیە، دەبێ بزانم کەسی بەردەمم کێ بووە!.... لە وەڵامدا وتی:

- پێتان باشە شەوی سێشەممە لە بەردەم ئەم دەرگایە یەکتر ببینین؟"
- بێگومان ئەگەر ڕێگە بدەن زۆرم پێخۆشە."
- "کەواتە سەعات هەشت"
- "زۆرباشە!"

دواتر بۆ ئەوەی بە بیانوویەک دەستم بەری کەوتبێت، دەستم بۆ پاڵتۆکەی درێژ کرد و بەفری سەر شانیم تەکاند، زۆرم پێخۆش بوو لەگەڵ ئەودام.

دیسان پێکەنی و وتی:

- "بەڵام نابێ خراپ لەبارەی منەوە بیر بکەنەوە."

وتم:

- "حەیفتان نەکرد!"

لەناکاو حاڵەتێکی پێداگری وەرگرت، تۆڕەکەی لە سەر دەموچاوی لابرد، ماوەی چرکەیەک هەر دووکمان سەیری یەکترمان دەکرد و منیش لەژێر لێوەوە وتم:

- "ئەی ئیلایالی من!"

دواتر لە سەر نووکەپێ بەرز بووەوە، قۆڵی لە دەوری ملم گرێدا و لێوەکانمی ماچ کرد، هەستم کرد هەناسەسوار و نیگەرانە و سینگی دەلەرزێت، لەناکاو لە باوەشم هەڵهات و بە دەنگێکی هێمن و لەرزۆکەوە شەوباشی کرد، بێ ئەوەی قسەیەکی تر بکات گەڕایەوە و بەخێرایی بە پلیکانەکاندا سەرکەوت... و دەرگاکە داخرا.

بۆ سبەینێ بەفرێکی قورس و تێکەڵ بە باران دەباری، دەنکە درشت و پروشە خۆڵەمێشییەکانی لە سەر زەوییەکە دەکەوت و هەموو شوێنێکی قوڕاوی دەکرد، فەزا بەستوو و هەوا شێدار بوو، من درەنگ لە خەو هەستام، ئەم ڕێکەوتە خۆشە دڵی پڕ دەکردم لە خۆشی و بەهۆی شڵەژانی دوێشەوەوە، هێشتا بێئۆقرە و پەرێشان بووم، ماوەیەک بە خۆشی لە سەر چرپاکەم مامەوە و بە خەیاڵی ئەوەوە خۆم دڵخۆش دەکرد، دەستەکانم دەکردەوە و لە باوەشم دەکرد و ماچم هەڵ دەدا، دواجار هەستام و کووپێکی تر شیرم خواردەوە، دوای ئەوەش شفتەیەکم خوارد، برسێتی دامرکایەوە بەڵام دیسان زەین و خەیاڵم شڵەژا.

ڕۆیشتمە بازاڕی **کۆنەفرۆشەکان** و بیرم کردەوە، ڕەنگە بتوانم هێلەکێکی کۆنی هەرزان بدۆزمەوە، مەبەست ئەوەبوو شتێک بکڕم و لە ژێر چاکەتەکەوە لە بەری بکەم، لە بازاڕەکەوە ڕۆیشتمە سەرەوە و هێلەکێکم هەڵگرت و دەستم کرد بە سەیرکردنی، لەم کاتەدا ناسیاوێک بە لامدا تێپەڕی و بەسەر ئاماژەیەکی بۆ کردم، هێلەکەکەم دانا و ڕۆیشتمە لای، ئەم کۆنەناسیاوە کە ئەندازیاری تەکنیکی بو، لەوکاتەدا بەڕێوە بوو بۆ ئیشەکەی، هەر منی بینی تکای کرد پێکە ـە بیرەیەک بخۆینەوە، لەبەرئەوەی کاتی کەم بوو زۆری لێکردم پەلە بکەم... پرسیاری کرد:

"ئەو خانمەی دوێشەو پیاسەت لەگەڵ دەکرد کێ بوو؟"

ئەم قسەیە ئیرەییمی وروژاند و لە وەڵامیدا وتم:

"کریمان دەستگیرانمە! مەگەر نازانن دوێشەو بووینە دەستگیران."

ڕاچڵەکا و باوەڕی بە قسەکانم کرد و زۆریش بێتاقەت بوو، بۆ ئەوەی لێی دەرباز بم تا توانیم درۆم بۆ ڕیز کرد، بیرەیان بۆ هێناین، خواردمانەوە و کەوتینەڕێ و پاشان خواحافیزی کرد و وتی:

- "چەند کرۆنێکی تۆ قەرزارم و بەڕاستی شەرمەزارم، کە ئەوەندە دوام خستووە، ئیشەڵا هەر هاتە دەستم دەیگەڕێنمەوە."

ئەگەرچی لە دڵەوە دەمزانی هەرگیز ئەم پارەیە نابینمەوە، بەڵام سوپاسم کرد، بەداخەوە بیرەکە یەکسەر گرتمی و سەرم گەرم بوو، بەسەرهاتەکەی دوێشەو بەتەواوی بێ ئاگای کردبووم، وەختبوو شێتی دەکردم، ڕەنگە سێشەممە نەیەتە ژوان؟ ڕەنگە زیاتر وردبێتەوە و گومان بکات؟ ئاخر گومانی چی بکات؟ لەپڕ مێشکم زۆر سەیر ڕۆشن بووەوە و لەسەر پارەکە چڕ بووەوە، دڵەڕاوکێ و ترس و بێزاربوون لە خۆم گیرۆدەی کردم، بیرم کردەوە دزی بکەم و ئەم بیرۆکەیەم بە هەموو وردەکاریی و ئاکامەکانی بە مێشکدا هات، دووکانێکی بچووکم دەهاتە خەیاڵ و دەستی باریک و لەرزۆکم، کە بۆ هەڵگرتنی پارە درێژ دەکەم، سەروفەسالی پۆلیسیش کە بۆ گرتنم دەهاتە پێشەوە، دەهاتنە بەرچاوم، کەلەپچەم لە دەستدایە و دەستوپێم زنجیر کراوە! ڕەنگە تەنیا دەستێکیشم ببەستنەوە، لە بەردەم دادگام، پشکنەرەکە قسەم لێ دەپرسێت، دەنگی خشەی قەڵەم لە سەر کاغەز دەبیستم، چ نیگایەکی ترسناکی تێکرتم، باشە! بەڕێز **تانگن** فەرموون! دواجاریش قوژبنی زیندان و تاریکیی تاهەتایی... بەڵێ ئاکامەکەی ئەمەیە!

ئەوسا دەستم بە توندی دەقوونجێنم و خێرا هەنگاو دەنێم، هەوڵ دەدەم ئازایەتی بدەمە بەرخۆم، لەم کاتەدا گەیشتمە مەیدانی **بازاڕی گەورە**، لە شوێنێک دانیشتم و لە بەرخۆمەوە وتم ئەم خەیاڵە منداڵانەیە چییە؟ چۆن دەتوانن دزییەکە بسەلمێنن؟ گریمان ڕۆژێک شاگردی دووکانە زانی فێڵم لێ کردووە، نەیدەوێرا دەنگەدەنگ

بنێــتەوە، چــونکە ئەنجــامەکەی ئەوەیە کە خۆشــیان دەردەکــرد، دەشمزانی زۆر حەزی لە کارەکەیەتی.
بە خۆم دەوت بۆ خاتری خوا بیبڕەوە و لەمە زیاتر خۆت بێ ئەقڵ مەکە، بەڵام هەر ئارامم لێ بڕابوو و پارەی ناو گیرفانم لێ بووبوو بە بـار، کە بـاش وردبـوومەوە و بیـرم کـردەوە، وەک ڕۆژی ڕوونـاک تێگەیشتم کە پێشتر، واتە ئەوکاتەی بە شەرەفەوە ئازارم دەچەشت و هەڵەم نەدەکرد، بەختەوەرتر بووم، لەپڕ کەوتمەوە بیری ئیلایالی، ئایا بە دەستی پیسـەوە ئەویشـم تێوەنەدەگلانـد؟ خـوایە ڕەحمـم پـێ بـکە! دڵدارە ئازیزەکەم فریام بکەوە!
لەپڕ وەک بولبولێک شاد و سەرمەست بووم، لە جێگەکەم دەرپەڕیم و ڕێــک بەرەو ژنە شیرینیفرۆشـــەکە ڕۆیشـــتم، کە مێـــزەکەی لای دەرمانخانەی **فیل** دانابوو، هێشتا کاتم هەبوو و دەمتوانی ئابڕووی تکاوم بگەڕێنمەوە و قەرەبووی بکەمەوە، بەڵێ، ڕێگەی ڕزگاربوون هێشتا دانەخراوە! دەبێ بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنم، کە دەتوانم خۆم لە گێژاوی بەدناوی و کەوتن بپارێزم.
تـا دواهەمـین فلسـی پـارەکەم بە دەسـتەوە بـوو، بە سـەر مێـزی ژنە داماوەکەدا چەمامەوە، حاڵەتێکی بیرمەندانەم وەرگرتبوو، وەک ئەوەی بمەوێت شـتێک بکـرم، بـێ هـیچ ڕوونکـردنەوەیەک پـارەکەم خسـتە چنگـیـیەوە، بـێ ئەوەی هـیچ بڵـێم یەکسـەر لێـی دوورکەوتـمەوە، بـۆ مرۆڤ چ چێژێک لە چاکە و چ هەستێک لە دەستپاکی بەرزترە؟ لەم کـاتەدا بـێ پـارەیی زۆر خۆشـحاڵی دەکـردم، بە گیرفـانی بەتـاڵ ئاسوودەتر بووم، ئەم پارەیە چەندی جار گیانی هێنابوومە لەرزین و دنیـایەک خەمـی شـاراوەی بـۆ دروسـت کردبـووم، تاسـابووم و بیرکردنەوەی دوورودرێژ بردبوومیەوە، ئێستا تێدەگەیشتم من قابیلی باشبوونم، بە تەواوی دانەڕزاوم، چونکە کردنی کارێک خراپ ئازارم دەدات و سروشـتی پاکیشـم دەڕوشـێنێت، سوپاسـی خـوا دەکەم لە بەردەم ویژدانـی خـۆم ڕووسـپی دەرچـووم، سـەیرێکی مەیـدانە

قەرەباڵغەکەم کرد و وتم: وەرن ئەی خەڵکینە پەندم لێوەربگرن، پەیڕەوی لە سروشت و شێوازی چاکی من بکەن، بڕوانن چ کارێکی خێرم کردووە و چۆن ویژدانم ئاسوودە کرد، من بەم کارەم بوومە هۆی دڵخۆشی پیرەژنێکی داماو، کە لەتاو قوڕبەسەری چۆقۆ گەیشتۆتە سەر ئێسقانی، ئەمشەو منداڵەکانی وەک شەوانی پێشوو، بە برسێتی سەر ناخەنە سەر سەرین...

بەم قسانە هان درام و خۆیشم دەستخۆشیم لەو کارە چاکە کرد، کە کردبووم، سوپاس بۆ خوا کە ئەو پارە پیسە لە دەستم بووەوە، تەواو شڵەژابووم و شانازیم بە خۆمەوە دەکرد، سەرفراز بە شەقامەکاندا تێپەڕیم و بە خۆم دەوت: ئێستا ئیدی کابرایەکی شەریف و دەستپاکم و دەتوانم بە چاوی پاکەوە بڕوانمە دەموچاوی ئیلایالی، پێویستی بە دڵخۆشی نەبوو، چونکە لە وەجد و خۆشییەکی بێوێنەدا بووم، ژەنگی پیسی و گومان لە ویژدانمدا دەسڕایەوە، مێشکم پاک و ڕووناک بوو، لە دەموچاومەوە نوورێک پرشنگدار و نەمر دەهاتە دەرەوە، هەموو گیانمی نوورانی دەکرد، وەک منداڵە دڵسادەکان مەیلی لاساریی و هاروهاجیم هەبوو، دەمویست کاری دوور لە ئەقڵم لێ بوەشێتەوە و شار ژێراوژوور بکەم، بەدرێژایی شەقامی گرنسن جووڵەکانم لە شێتەکان دەچوو، مەستی و سەرخۆشی لە دەروونما، هەرایەکی گەورەی دروست کردبوو و لە گوێمدا دەزرنگایەوە، خرۆشی ناو سەرم بە جۆرێک هاری کردبووم، کە بێهۆ و بێ هیچ ڕێزگرتنێک ڕێگەم لە دەلاڵێک گرت، کە بێدەنگ و هێمن دەڕۆیشت و نیگایەکی توندم تێگرت، دەستیم گرت و تەمەنی خۆم پێوت، بێ ئەوەی ئەم کارە ناشایستەی بۆ ڕوون بکەمەوە کەوتمەڕێ و لێی دوورکەوتمەوە، لە قسە و پێکەنینی ڕێبوارەکان تانە و گاڵتەم دەخوێندەوە، لەناکاو چەند باڵندەیەکی بچوک، کە لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا جرتوفرتیان بوو، سەرنجیان ڕاکێشام و بە وردی کەوتمە تەماشاکردنیان، دواتر بیرم لە بەردرێژی شەقامەکە کردەوە،

ماوەیەک لە شێوازی دانانی بەردەکان و شێوە و ئاماژەی سەیر، کە بە ڕێزکردنیان دروست بووبوو ڕامام، لەم کەینوبەینەدا بێ ئەوەی بە خۆم بزانم، لە مەیدانی **سترتینگ** بووم، دەوەستم و چاو دەبڕمە ئەسپوعارەبانەکان، عارەبانەچییەکان بەدەم پیاسەوە قسە دەکەن و ئەسپەکانیش لەتاو سەرما لمۆزیان شۆڕ کردۆتەوە.

ئانیشکم دەکێشم بە لاکەمەرمدا و دەڵێم زووکە برۆ، چاوەڕێی چیت؟ سوار یەکەم ئەسپوعارەبانە دەبم و فەرمان بە عارەبانەچی دەکەم بەرەو شەقامی **ئۆلوفال** بڕوات، لە بەردەم ماڵی ژمارە ٣٧ بوەستێت!

کەوتەڕێ، لە ڕێگەدا عاەربانەچی ئاوڕی دەدایەوە، سەیرێکی ناو عارەبانەکەی کرد و هەموو گیانمی هەڵسەنگاند.

من لە ناو عارەبانەکەدا بووم و ڕووپۆشێکی چەرم قاچمی دەشاردەوە، ئایا گومانی کردبوو؟ بێگومان جلی شڕ و کۆنی من سەرنجی ڕاکێشاوە، بۆ ئەوەی دڕدۆنگییەکەی زیاتر نەبێت، وتم دەمەوێت بڕۆمە سەردانی کەسێک و بەوپەڕی هەوڵەوە تێمگەیاند بینینی ئەم کەسە گرنگییەکی زۆری هەیە.

لە کۆتاییدا، ئەسپوعارەبانەکە لە بەردەم ماڵی ژمارە ٣٧ وەستا، لە عارەبانەکە هاتمە خوارەوە، بە هەڵەداوان بە پلیکانەکاندا سەردەکەوم و خۆم دەگەیەنمە نهۆمی دووەمی بیناکە، گوریسی زەنگی ماڵەکە بە توندی ڕادەکێشم، دەنگی زەنگەکە شەش حەوت جار زۆر بە ترسناکی لە ناو ماڵەکەدا دەنگ دەداتەوە، کارەکەری ماڵەکە دەرگاکە دەکاتەوە و تۆقیو سەیرم دەکات، گوارەیەکی ئاڵتوونی لە گوێدا و هێلەکیکی خۆڵەمێشی، کە چەند قۆپچەیەکی ئاوریشمی لە سەر دووراوە، لە بەردایە. دەڵێم:

"ببورن کارم بە **کیرۆلف**ە، بەڕێز **خواکیم کیرۆلۆف** کە خوری دەفرۆشێت، وابزانم ئەمە ماڵەکەیەتی."

کارەکەر سەری بە ئاماژەی ڕەتکردنەوە دەجوڵێنێت و دەڵێت:

"لێرە **کیرلۆف**مان نییە"

دواتر لێم ورد دەبێتەوە و دەستی دەخاتە سەر دەسکی دەرگاکە و دەیەوێت دەرگاکە دابخات، بەڵام بە سەروچاویدا دیارە بێ بیرکردنەوە وەڵامی داوەتەوە، ڕەنگە ئەو کەسەش کە ناوم هێنا بناسێت، بەڵام تەممەڵی نایەلێت باش بیربکاتەوە.

تورە و پەست پشتی تێدەکەم و بەڕاکەڕاک لە پلیکانەکانەوە دێمە خوارەوە و بە عارەبانەچییەکەم وت:

- "ئەو کەسەی دەمویست لێرە نەبوو."
- "سەیرە، کەواتە لێی نەبوو؟"

وەڵامم دایەوە:

- "نەخێر، بەڵام ئێستا بڕۆن بەرەو کۆڵانی **تامت** ژمارە ١١."

بە جۆرێک شڵەژابووم، کە عارەبانەچییەکەش بێتاقەت بوو، چونکە وای دەزانی مەسەلە مردن و ژیانە و یەکسەر کەوتەڕێ، وەک برووسکە غاری دەدا، لەو کاتەدا ئاوڕی دایەوە و پرسی:

- "ئەم کەسە کێیە؟"
- "خوریفرۆشە و ناوی **کیرلۆف**ـە."

تەنانەت گومانی لەویش کرد و پرسی:

- "ئەمە هەر ئەو کەسە نییە هەمیشە چاکەتی کاڵ لە بەر دەکات؟"

بەسەریدا هاوارم کرد:

- "شێت بووی؟ وادەزانی بۆ کابرایەکی ئاسایی دەگەڕێم! ڕەنگی چاکەت چ پەیوەندییەکی بە مەسەلەکەوە هەیە؟"

بە وشەی چاکەتی کاڵ تورە بووم، چونکە وێنایەکی وەهماویم کە بۆ ئەم پیاوە هەبوو، لەناوی دەبرد.

دیسان پرسی:

- "فەرمووتان **کیرلۆف**؟"
- "بێگومان، مەگەر ئەم ناوە شاخوگوێی لێ ڕوواوە؟ ناوی سەیر خۆ عەیبە نییە."

دواتر پرسی؛

"ئایا موو سوور نییه؟"
لێتان ناشارمەوە دوور نەبوو کە ئەم کابرایە ڕیشی سوور بێت، بەم قسەیە ئەوەم بۆ سەلما کە عارەبانچییەکە ڕاست دەکات و هەقی خۆیەتی، زۆر سوپاسی ئەم داماوەم کرد، کە ئەم خاڵە وردەی بۆ ڕوون کردمەوە، قسەکەی دەقاودەق لەگەڵ ڕاستی یەکدەهاتەوە، لە بەرخۆمەوە دەموت ڕەنگە بوونەوەرێکی وا سەیروسەمەرە هەر دەبێ بە مووی سوورەوە وێنای بکەین.
عارەبانەچییەکە وتی:
"سەیرە! سەیرە! کەواتە هەر ئەو کەسە بوو، کە چەندیجار سوارم کردبوو، تەنانەت گۆچانێکی گرێگرێی وەک کوتەک بە دەستەوە بوو."
بەم ڕوونکردنەوە وردانە وێنەیەکی زیندووم دەهاتە بەرچاو.
وتم:
"بێگومان ئەم کوتەکەی هەمیشە هەڵگرتووە، دڵنیا بن تا ئێستا کەس بەبێ گۆچان نەیبینیوە."
بەڵێ بێگومان خۆی بووە کە چەندین جار سوار بووە، چونکە عارەبانەچییەکە باش دەیناسی، لەم کاتەدا عارەبانەچی وەها لێی دەخوڕی، کە سمی ئەسپەکان پزیسکی دەردەپەراند.
لەگەڵ ئەوەی ئەعسابم تەواو وروژابوو، بەڵام مێشکم تەواو ئامادە بوو و سەرنجم لە هەموو وردەکارییەکان دەدا، بۆ نموونە بە بەردەم پاسەوانێکدا تێدەپەڕین و ژمارەکەی کە ٦٩ نووسراوە، بە باشی دەبینم و وا لە یادەوەریمدا دەمێنێتەوە، وەک ئەوەی لەمێژە لە مێشکمدا هەڵکۆڵراوە؛ بەڵێ ژمارە ٦٩ بوو، ڕێک ٦٩ بوو، هەرگیز ئەم ژمارەیەم لە یاد ناچێت، لە پشتەوەی ئەسپوعارەبانەکە دانیشتووم و بە جۆرێک خۆم لە ژێر چەترەکەدا گرمۆڵە کردبوو، کە هیچکەس لە دەرەوە ورتەورتی لێومی نەدەبینی، نوقمی بیرکردنەوە و وێنای سەیر بووبووم، بێهودە قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد، لە مێشکمدا گێژاوێکی شەیتانە هەڵایساوە و خۆم داوەتە دەستی، دەزانم لەم کەینوبەینەدا

هیچ ئیرادەیەکم نییە، کەوتوومەتە ژێر کاریگەریی هۆکاری دەرەکی، دەستم کرد بە پێکەنین، پێکەنینێک کە پڕخرۆش و بێدەنگ بوو و هیچ هۆکارێکی نەبوو، هێشتا لە ژێر کاریگەریی چەند پێکە بیرەیەک سەرخۆش بووم، کەمکەم کەفوکوڵم دادەمرکا و گەڕامەوە هێمنی سەرەتام، لە پەنجەی بریندارمدا هەستم بە سەرما دەکرد، بۆ ئەوەی کەمێک گەرم بێتەوە دەیخەمە بەینی یەخەی کراسەکەم.

لەم کاتەدا دەگەینە کۆڵانی **تامت** و عارەبانەچی وەستا.

بەخێرا و بێ وەستان و بە لەشی داهێزراو و سەری قورسەوە، لە ئەسپوعارەبانەکە دادەبەزم، لە ڕێڕەوێکی پانەوە دەڕۆمە نێو حەوشەکە و لەوێ تێدەپەڕم و دەگەمە دەرگایەک، دەرگاکە دەکەمەوە و دەڕۆمە ژوورەوە، خۆم لە سەرایەکدا دەبینمەوە کە دوو پەنجەرەی بەرەو دەرەوە دەکرێنەوە، لە سووچێکی ئەو شوێنەدا دوو سندوقیان لەسەر یەک داناوە، لە پانتایی ژوورەکەش چرپایەکی داپۆشراو لە داری سپی، نووسێنراوە بە دیوارەکەوە، لە ژووری لای ڕاستەوە هاتوهاواری منداڵ بەرز بۆتەوە، لە نهۆمی یەکەمدا لە سەرەوە دەنگی جەمۆلینێک دێت، کە بە چەکوش دەکێشن بە سەریدا، ئەوەی لە سەرەتای ڕۆیشتنە ژوورەوەدا سەرنجم دەبات هەر ئەمە بوو، بە هێمنی بە ژوورەکەدا تێدەپەڕم و بێ ئەوەی پەلە بکەم، خۆم وا دەردەخەم ئامادەی هەڵهاتنم. دەرگای بەرامبەرم دەکەمەوە و دەچمە نێو کۆڵانی **ولاخدارەکان**، دواتر سەیری ئەو بینایە دەکەم کە لێی تێپەڕبووم، دەبینم لە سەر دەروازەکەی نووسراوە: "میوانخانە بۆ گەشتیاران". عارەبانەچی لەوێ چاوەڕێم دەکات، منیش بێ ئەوەی مەبەستم هەڵهاتن بێت لە ئەو، ئاگام لە دزێوی ئەم کارە بێت، بەوپەڕی هێمنی و بێ هیچ ترسێک، بە ناوەڕاستی کۆڵانی **ولاخدارەکان** تێیدەپەڕم و دەکەومە ڕێ، مەسەلەی **کیرۆلۆف**ی خوری فرۆش، وەک وێنای شێتانەی تر کە ناوبەناو دێنە خەیاڵمەوە و دیار نامێنن، دەڕەوێتەوە! ئەم بوونەوەرە خەیاڵییە کە ماوەیەکی زۆر

سەرقاڵی کردبووم، بۆ دۆزینەوەی ماڵەوماڵم دەکرد، بە یەکجاری لە خەیاڵما نەما، جگە لە یادەوەرییەکی دوور و تەماوی هیچی لێ بەجێ نەما، بەدەم ڕێگەوە کەمکەم بەری دەدام و هەستم بە ماندوویی و داهێزران دەکرد، بە زەحمەت پێیەکانم کێش دەکرد، بەفر بە کڵووی گەورە و تەڕەوە دەباری، دواجار خۆم گەیاندە گەرەکی گرۆنلاند نزیک کڵێساکە و بۆ حەوانەوە لە سەر کورسییەک دانیشتم، ڕێبوارەکان بە سەرسوڕمانەوە تەماشایان دەکرد، من نغرۆی بیرکردنەوەکانم بووم.

خوایە خۆت دەزانی چ ڕۆژانێکی ڕەشم هەبووە! لەم ژیانە سەختە بەڕادەیەک ماندوو بووم، کە بیرم دەکردەوە هەوڵدان بۆ درێژەدان و پاراستنی نرخی چییە، بەلا و ئازارەکان بەڕادەیەک قورس بوون، کە کڵۆڵی کردبووم، تەواو وەختبوو لەناو دەچووم، بەمزووانە جگە لە سێبەرێک هیچم لێ بەجێ نەدەما، شانەکانم سست و شۆڕ بوون و لە کاتی ڕۆیشتندا بۆ ئەوەی سینگم ئازاری نەبێت پشتم کووڕ دەکردەوە، ماوەی پێشوو، ڕۆژێک پاشنیوەڕۆ لە ژوورەکەمدا خۆم ڕووت کردبووەوە، بۆ لەشی لەرولاوازی خۆم گریابووم، چەندین هەفتەیە کراسەکەم نەگۆڕیوە، لەناو ئارەقە وەک موشەمای ڕەقی لێهاتووە، بە بەرکەوتنی بەردەوام ناوکمی ڕووشاندبوو، برینەکەی ئازاری نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی لە ناوەڕاستی سکمدا بوو، ئەزێتی دەدام و خوێناوی لێ دەچۆڕا، هەڵبەت ئەم برینە خۆی چاک نابێتەوە و دەرمانیشم نەبوو بۆ چارەسەرکردنی، چار نەبوو جگە لەوەی برینەکە پاک بکەمەوە و بیشۆم، دیسان کراسەکە لە بەر بکەمەوە.

بە دڵتەنگییەوە لە سەر کورسییەکە دانیشتبووم و بیرم لەم شتانە دەکردەوە، لە خۆم بێزارم، تەنانەت ڕقم لە بینینی دەستەکانمە، کە سەیری پشتی دەستم دەکەم، کە حاڵەتی چرچبووی هەیە، قێز دەکەمەوە و ئازار دەچێژم و بە بینینی پەنجە لاوازەکانم بێتاقەت دەبم، ڕقم لە لەشولاری داچەکیومە، ڕقم لە بەرگەگرتنی باری

جەستەیەکی وەهایە، خوایە خۆزگە هەر ئێستا دەمردم، چەند حەز بە مردن دەکەم! ماندوو و وێرانم، بەڕادەیەک خۆم بە گڵاو و زەبوون دەزانم، کە لەخۆمەوە هەڵدەستم و بەرەو ماڵەوە دەکەومەڕێ.

بەدەم ڕۆیشـــتنەوە بە بەردەم دەروازەیەکـــی بەرزدا تێـــپەڕیم، ئەم تابلۆیەم لە سـەرەوەی خوێنـدەوە: "بـۆ کڕینـی کفن سـەردانی خـانمی ئەندرسـن بـکەن لای ڕاسـت، لە دەرگـای ژووره گەورەکە بـدەن." لە بەرخۆمەوە وتـم یـادی جـاران بەخێر! لەپڕ کەوتمەوە بیری گەڕەکی **هامربشێرگ** و ژوورەکەی جارانم، یادەوەریی کورسییە بێشکەییەکە و ئەو ڕۆژنامـــانەی کە دەرگاکەیـــان دادەپۆشـــی، ڕیکلامـــی بەڕێوەبەرایەتی فانۆسە دەریاییەکان و نانی تازەی **فابیان ئەلسن**، لە خەیاڵمدا زیندوو بووەوە، ئەفسووس، ئەوکاتە زۆر بەختەوەرتر بووم لە ئێستا، بۆ وتارێکی یەکشـەممان دە کرۆنم وەردەگرت، بەڵام ئێستا ئیتر ئەو هێزەم نەماوە، تەنانەت نـاتوانم یەک وشـەش بنووسـم و هەر کە قەڵەم دەگـرم بە دەسـتمەوە، مێشـکم بەتـاڵ دەبێتەوە، بەڵـێ دەبـێ ماڵئاوایی لەم دنیایە بکەم! بیرم لەمە دەکردەوە و بەدەم ڕۆیشـتنەوە پێداگرتر دەبووم لە بڕیارەکەم.

بڕیارم دابوو بڕۆمە لای شـاگردەکە و باسـی پـارە نـاهەقەکە بـکەم کە وەرم گرتبـوو، تـا لە دووکـانی وردەفرۆشـییەکە نزیکتـر دەکەوتـمەوە هەسـتم دەکـرد لە مەترسـی نزیکتـر دەبـمەوە، کە گەیشـتمە ئەوێ بە هێمنـــی بە پلیکانەکانـــدا ســـەرکەوتم، هەر کە دەگەمە بەر دەرگـــاکە کچێکـی کووپبەدەسـت دەبینـم و ڕێـگەکەی بـۆ دەکەمەوە، دەرگـاکە دەکەمە و بـۆ جـاری دووەم، بە تەنیـا مـن و شـاگردەکە دەمێنینـەوە، دەڵێت بەراسـتی چەنـد هەوایەکی پیسـە! بە خـۆم دەڵـێم بۆچی دوور بـڕۆم و یەکسـەر مەسـەلەکەی بـۆ بـاس نەکەم، لەپـڕ ڕادەچڵەکـێم و دەڵـیم مـن نەهـاتووم باسـی خـۆش و ناخۆشـی کەشـوهەوا بـکەم! بیرکردنەوەی شاگردە داماوەکە لە ئیش دەکەوێت، لە توندی بێ هۆی من واقی وڕدەمێنێت، چونکە بەهیچ شێوەیەک بە خەیاڵیدا نەهـاتووە

من پێنج کرۆنم لێ دزیبێت، لەمە زیاتر بەرگە ناگرم و دەڵێم مەگەر نازانن چۆن دەستم بڕیون؟ لە کاتی وتنی ئەم دێڕانە هەناسەی قووڵ دەدەم و دەلەرزم، ئامادەم ئەگەر یەکسەر بابەتەکە تێنەگەیشت بە توندوتیژی تێی بگەیەنم، بەڵام ئەو داماوە هەر نەیدەزانی باسی چی دەکەم، پەنا بەخوا! دەبێ لە ناو چ خەڵکانێکی مێشکپووچ و ناحاڵیدا بژیم! دواتر بەر جنێوی دەدەم و مەسەلەکەی بە وردەکارییەوە بۆ دەگێڕمەوە، پێی دەڵێم لە کاتی ئەم کارەدا من لە کوێ بووم و ئەو لە کوێ وەستا بوو، پارەکان لە کوێ بوون و من چۆن هەڵم گرتن و خستمە دەستمەوە و دەستم بە توندی قونجاند، دوای ئەم هەموو ڕوونکردنەوەیە لە بابەتەکە تێدەگات، بەڵام هیچ کاردانەوەیەک نانوێنێت، تەنیا سەیری چواردەوری دەکات و گوێ لە دەنگی پێیەک دەگرێت لە ژوورەکەی تەنیشتی، ئاماژەم بۆ دەکات وسسس، بۆ ئەوەی هێمنتر قسە بکەم، دواجار دێتە قسە و دەڵێت:

"بەڕاستی کارێکی نانەجیبانەتان کردووە!"

لەبەرئەوەی دەمویست قسەکەی ببڕم و زیاتر بیشڵەژێنم، هاوارم کرد لێگەڕێن قسەکانم تەواو بکەم، دواتر ڕوونم کردەوە ئەم کارە ئەوەندەش بەپێی بیرکردنەوەی ئەو، کە هەر خەریکی نۆک و فاسۆلیایە، ناشیرین و شەرمەزاری نییە، هەڵبەت من پارەکەم لای خۆم گل نەدابووەوە، بە هیچ شێوەیەک بیرم لە بەرژوەندیی خۆم نەکردۆتەوە، بەڵکو سروشت و دەروونی پاکم ڕقی لەم بیرکردنەوانە بوو، ئینجا پرسی:

"ئەی پارەکەتان چی لێکردووە؟"

"دڵنیا بن تا دوا فلسم دا، بە ژنێکی دەستکورت و داماو، ئێستا دەبینن من کەسێک نیم کە لە یارمەتی هەژارەکان غافڵ بم..."

دەکەوێتە بیرکردنەوە و ئاشکرا دیارە ناتوانێت بڕیار بدات، بەڕاستی من کەسێکی بێوەییم یان نا، لە کۆتاییدا دەڵێت:

"ئایا ئەرکی ئێوە نەبوو پارەکە بگەڕێننەوە؟"

بەوپەڕی بێشەرمییەوە وەڵام دەدەمەوە:

- "لەڕاستیدا بیرم لە بەرژەوەندی ئێوە دەکردەوە و حەزم نەدەکرد تووشی کێشە بن، ئایا پاداشتی کەسێکی ئاوا نەفسبەرز و خێرۆمەند ئەمەیە، من خۆم بەسەرهاتەکەتان بۆ دەگێڕمەوە و ئێوەش بەقەد سەگێک شەرم ناکەن، ئامادە نین چاوپۆشی لەو هەڵەیە بکەن، ئێستا کە وای لێهات چی دەبێ با ببێت، من خۆم لە هەر بەرپرسیارییەکی ویژدانی بە دوور دەزانم."

دەرگاکەم توند پێوەدا و هاتمە دەرەوە.

کاتێک بە ئەژنۆکانمەوە کە بەهۆی بەرەلایی تاقەتپڕوکێنی ڕۆژانەوە دەلەرزی، گەڕامەوە ژوورەکەم، یان باشترە بڵێم هاتمەوە ئەم قوژبنە دڵتەنگەی کە بەفر خوساندبووی، داڕمام و دیسان کەوتم، پەشیمان بوومەوە و کەوتمە گریان کە بۆچی بەو جۆرە پەلاماری ئەو دووکاندارە داماوەم دابوو، بۆ سزادانی خۆم قوڕگم دەگووشی و بۆ قەرەبووی ئەم کارە سووک و ناشیرینە، نەمدەزانی چی بکەم، وەک سەگ دەترسا نەوەک کارەکەی لە دەست دەربچێت، نەیدەوێرا بۆ ئەو پێنج کرۆنە کە زیانی دووکانە بوو، دەنگەدەنگ بنێتەوە و منیش ترسەکەی ئەوم قۆستەوە و بە دەنگی سەرکێشم تۆقاندبووم، بە هەر هاوارێک و هەر وشەیەکم دڵی دەڕما، ڕەنگە بەڕێوەبەر لە ژووری پشتەوە بووبێت و زۆری نەمابوو گومان بکات، ئاگاداری مەسەلەکە بێت، بەڕاستی من سڵم لە هیچ جۆرە بێشەرمی و سەرسەرێتییەک نەکردەوە، ئەی بۆچی دەستگیریان نەکردبووم؟ ئەمەش خۆی ڕێگەچارە بوو، هەڵبەت منیش دەستم لە هەموو شتێک شۆردبوو، نەک هەر بەتەمای بەرگری نەبووم، بەڵکو ڕەزامەندانەش خۆم بەدەستەوە دەدا، ئەی خوای زەوی و ئاسمان، تەنیا یەک چرکە بەختەوەریم پێ ببەخشە، هەموو ژیانم لەبری قاپێک نۆکی کوڵاو پێشکەش بە تۆ! لانیکەم تەنیا ئەمجارە داواکارییەکەم قبوڵ بکە.

بە جلـی تەڕەوە ڕاکشـام، وەک ئەوەی ئیلهـامم بـۆ هاتبێـت، هەر ئەو شـەوە بمرم و ئەوپەڕی هێزم کۆکردەوە و چرپاکەم ڕێکوپێک کرد، بـۆ ئەوەی لانیکەم دوای مـردنم چرپاکەم تۆزێک حـورمەتی هەبێت، دەستەکانم پێکەوە هەڵپێکا و حاڵەتی مردنم وەرگرت.

لەپڕ کەوتمەوە بیری ئیلایالی و بە خۆم وت چۆن لە دوانیوەڕۆوە تـا ئێستا لە بیرم کردبوو، بەم بیرکردنەوەیە دیسان بروسکەی هیوایەک هـاتە دەروونـمەوە، ئەم بروسـکە کـزە وەک هەتاوێـک گەرمـایەکی گیانبەخشـی لە سـەرتاپێم دروسـت کـرد، بەرەبەرە بـڵاو بـوویەوە و ڕوونـــاکییە خۆشــــەکەی وەک ئاوریشـــــمی نەرم دەیلاوانـــدمەوە، دەیخستمە چێژێکی خەوهێنەرەوە، دیسان ڕووناکییەکە زیاتر بووبوو، لاجانگەکانمی بە قوولی دەسوتاند و قورسـی دەکرد، مێشکیشمی کە وەک خـوێن وروژمـی بـۆ هێنـابوو، دەهێنـایە جـۆش، بەهەرحـاڵ، گورزەتیشکەکان بە شێوەیەکی ترسناک ئاوێتە دەبوون و لە بەرچاوم گڕ دەگرن، ئەرز و ئاسـمان کولاوە! مـرۆڤ و ئـاژەڵ لە ئـاگردان، لە هەموو لایەکەوە خەرمـانی ئـاگر و شـەیتانی گڕاوی دەبینم، هەڵدێڕی ترسناک و بیابـانی گڕدار دێتە بەرچـاوم، جیهـان و هەمـوو شـتەکانی ناوی بوونەتە پارووی ئاگر، دووکەڵەکەی چاوی خۆری لێڵ و تاریـک کـردووە. بەڵـێ، قیـامەت هـاتووە! لە دوای ئەوە نە هـیچم بینـی و نە دەنگێکم بیست...

بـۆ سـبەینێ، خووسـاو لە ئـارەقە لە خەو هەسـتام، هەمـوو گیـانم تەڕ بـوو و تــایەکی قورســم گرتبـوو، ســەرەتا هەر نەمـدەزانی چـیم لێقەومـاوە، بە سەرسـوڕمانەوە سـەیری چـواردەورم دەکـرد، وەک ئەوەی تەواو گـۆڕابم، چـونکە ئیتـر مرۆڤـی پێشـوو نەبـوو و خـۆم نەدەناسـییەوە، لە پـوزمەوە تـا سـەرەوە و لە لەپـی دەسـتمەوە بـۆ خوارەوە، دەستم بە دەستوپێی خۆمدا دەهێنا، پێم سـەیر بوو بۆچی پەنـجەرەکە لەم دیـوارەدایە و لە دیـواری بەرامبەریـدا نییە، گـوێم لە

دەنگی پێی ئەسپەکان بوو و وام دەزانی لە سەرەوە دەیبیستم، دڵیشم کەمێک ئازاری هەبوو.
قژم سارد و تەڕ بووبوو و نووسابوو بە ناوچاومەوە، قورساییم خستە سەر دەستم و هەستام و سەیری سەرینەکەم کرد، لە سەر سەرینەکە چەند چەپکەقژێک بە جێمابوو، پەنجەکانی پێم لە شەوی پێشووەوە لە پێڵاوەکەدا تلۆقی دەرکردبوو، ئازاری نەبوو، بەڵام بە هیچ شێوەیەک نەمدەتوانی پەنجەگەورەکەم بجووڵێنم، بەوپێیەی کەمکەم عەسر دەهات و هەوا تاریک دەبوو هەستام، ماوەیەک خۆم لە ژوورەکەدا هەڵفریواند، هەوڵم دەدا بە وریایی و بە هەنگاوی کورت، بێ ئەوەی زۆر لە قاچم بکەم، بڕۆم، زۆر بێتاقەت نەبووم و نەشدەگریام، بەگشتی خەمێکی وام نەبوو، بەڵکو ئێجگار دڵخۆش و کەیفساز بووم، لەو ساتە تایبەتەشدا بە خەیاڵمدا نەدەهات، ئەوەی لەم دنیایەدایە دەتوانێ جۆرێکی تر بێت.
ماوەیەک دوای ئەوە لە ماڵەوە هاتمە دەرەوە، ئەگەرچی خواردنم لە بەرچاو کەوتبوو، بەڵام دیسان تاکە بابەتێکی ئازاری دەدام برسێتی بوو، مەیلی خواردنم بە جۆرێک بەرەو زیاتر دەڕۆیشت، کە ڕیسوایی دروست دەکرد و وەک گیانداری دڕندە چڵێسیم تاوی دەسەند، ئەم نەوسنییە بەرەبەرە زیاتر دەبوو، بێڕەحمانە بەسەرمدا زاڵ دەبوو، بە شێوەیەک سەیر بەکاوەخۆ دزەی دەکردە سینگمەوە، وەک ئەوەی بیست گیانداری وردی نادیار سەریان چەقاندۆتە لایەکی سینگم و بەهێواشی دەیخۆن و دەیجوون، دواتر ڕوودەکەنە ئەولاش و دەیخۆن، پاشان ساتێک دەوەستن و دیسان دەست پێدەکەنەوە، دواجار بێدەنگ و خێرا دەچنە ئەولا و فەزایەکی بۆش بەجێ دەهێڵن، نەخۆش نەبووم، بەڵام شەکەت و ماندوو بووم و لەبەر لاوازی بەردەوام ئارەقەم دەڕشت، بیرم کردەوە بڕۆمە **بازاڕی گەورە**، کەمێک بحەوێمەوە، بەڵام ڕێگەکەی سەخت و دوور بوو، لە کۆتاییدا هەرچۆنێک بێت خۆم گەیاندە نزیکی ئەوێ، یانی گەیشتمە مەودای

نیوان مەیدان و شەقامەکە، ئارەقە دەتکایە چاوم و چاویلکەکەمی لێڵ دەکرد بە جۆرێک هیچ شوێنێکم نەدەبینی، بەناچاری کەمێک وەستام بۆ ئەوەی چاویلکەکەم بسڕم، نەمدەزانی و حەزیشم نەدەکرد بزانم لە کوێم.
هەراوهوریا و دەنگەدەنگێکی سەیر لە هەموو لایەکەوە لە ئارادا بوو، لەناکاو دەنگی شاورێک بەرز بووەوە و بە ئاوازێکی ڕەق و وشک دەنگی دایەوە، باش گوێم لە دەنگی شاورەکەیە و بە جووڵەیەکی گرژ و تووڕە خۆم دەخزێنمە لاوە و تا ئەو شوێنەی قاچە بێهێزەکانم بتوانن، هەنگاوێک دەگەڕێمە دواوە، لەم کاتەدا عارەبانەیەکی نانەوا وەک دێوێکی زەبەلاح بە بەردەممدا تێپەڕ دەبێت و تایەکەی بەر جلەکانم دەکەوێت، ئەگەر خێراتر بجولآمایە ئازارم پێ نەدەگەیشت، ڕەنگە ئەگەر زەحمەتێکی زیاترم بدایەتە بەرخۆم، ڕەنگە کەمێک زیاتر و وریاتر بێمەوە سەرخۆم و بجولێم، بەلآم ئێستا کار لە کار ترازا بوو، هەستم بە ئازار کرد لە یەکێک لە قاچەکانم، وابزانم چەند پەنجەیەکم پان بووبووەوە، تێگەیشتم پەنجەکانم لە ناو پێلاوەکە پان بوونەتەوە، نانەواکە کە عارەبانەکەی لێدەخوڕی، بەوپەڕی هێزی خۆیەوە ئەسپەکانی ڕاگرت و لە شوێنەکەی خۆیەوە، تۆقیو پرسیاری کرد:
"چی بوو؟"
"ئەهـ برا! شکور هیچ نەبوو، چونکە ڕەنگە خراپتر بقەومایە... ئەوەندەش ناخۆش نییە... پێم وانییە شوێنێکم شکابێت... تکایە بێتاقەت مەبن."
بە خێرایی بەرەو کورسییەک ڕۆیشتم، دیمەنی ئەو هەموو خەڵکە کە وەستاون و لە من ڕاماون، دەمحەپەسێنێت، بەهەرحاڵ قەدەرە و هاتووە، شانسم هەبوو و زەبرێکی قورسم بەرنەکەوت، قورپەسەرییەکە ئەوە بوو کە پێلاوەکانم دڕابوون و نووکەکەی لێ بووبووەوە، کاتێ قاچم بەرز کردەوە، لە شوێنی دڕاوییەکە

دڵۆپەخوێنم بینی، بەڵام نە من خەتابار بوو و نە ئەویش بە ئەنقەست وای کرد، پیاوەکە نەیدەویست بمخاتە ئەو دۆخەوە و خراپترم بکات، داماوە خۆیشی ترسا بوو، ڕەنگە ئەگەر داوای نانێکی ناو عارەبانەکەیم بکردایە، ڕەتی نەکردایەتەوە و بێگومان لە دڵەوە پێی دەبەخشیم، خوایە لە هەرکوێیە پاداشتی بدەرەوە و دڵی خۆش بکە! وەک گورگ برسیم بوو و نەمدەزانی چۆن بەرگەی ئەم نەوسە ترسناکەم بگرم.

لە سەر کورسییەکە خۆم لوول دەکرد و تەوپاوتلم بوو، سینگم لە سەر ئەژنۆمدا دەنووشتێنمەوە، کە هەوا تاریک داهات بە گریانەوە بەرەو مەیدانی **زیندان** دەڕۆم، خوا دەزانێ چۆن خۆم دەگەیاندە ئەوێ و لای سیاجەکە دانیشتم، یەکێک لە گیرفانەکانی چاکەتەکەم لێکردەوە و لە خۆمەوە خستە دەممەوە و دەستم کرد بە جووینی، لەم کاتەدا دەموچاوم گرژ کردبوو و چاوەکانم ڕێک بڕیبووە بەرامبەرم و هیچم نەدەبینی، لەناکاو بیرم کردەوە بڕۆمە خوارەوە و بڕۆمە یەکێک لە دووکانەکانی بازاڕ گۆشتفرۆشان و پارچەیەک گۆشت بهێنم، یەکسەر هەڵدەستم و بە سەر سیاجەکەدا خۆم هەڵدەدەم، تا کۆتایی سەربانی **عەمباری خواردەمەنی** دەڕۆم و لەوێوە دێمە خوارەوە، کە گەیشتمە گوێسەبانەکە و چوومە سەر پلیکانەکە، بە دەنگی بەرز هاتوهاوارم نایەوە بۆ ئەوەی وادەربخەم سەگێک بەدوامەوەیە، ئاماژەیی هەڕەشەئامێزیشم بۆ دواوە دەکرد، کە گەیشتمە یەکەم قەساب بەوپەڕی بێشەرمییەوە وتم:

- "پارچەئێسقانێک بێزەحمەت بۆ ئەوەی بیدەم بە سەگەکە، هیچی ترم ناوێت تەنیا ئێسقانێک بۆ ئەوەی ئەو بەسەزمانە بیخاتە دەمییەوە."

ئەوسا پارچە ئێسقانێکی بچووک کە کەمێک گۆشتی پێوە بوو، پێدام و لە ژێر چاکەتەکەم شاردمەوە، ئەوەندە بە گەرمی سوپاسی قەسابەکەم کرد، کە سەیرێکی حەپەساوی کردم و وتی تکایە بەڕێز، شایانی نییە! لە وەڵامیدا لە ژێر لێوەوە وتم لەمە زیاتر خەجاڵەتم

مەکەن، بەڕاستی زۆر گەورەییتان نواند، کەوتمەڕێ و بەرەو سەرەوە ڕۆیشتم، دڵم زۆر پەلەپەل لێی دەدا، چوومە گوزەری بونبەستی ئاسنگەرەکانەوە و تا شوێنێک ڕۆیشتم، کە کەسی لێوە دیار نەبوو و لە بەردەم دەرگایەکی شکاو کە بەسەر خوانی حەوشەیەکدا دەکرایەوە، وەستام، لەوێ ڕووناکییەک بوونی نەبوو و تاریکییەکی حەشاردەر دەوری گرتبووم، دەستم کرد بە خواردنی گۆشتێک کە نووسابوو بە ئێسقانەکەوە، هیچ تامێکی نەبوو، بۆنی هێلنجهێنەری خوێنی مردوو لە ئێسقانەکەوە دەهات، یەکسەر ڕشامەوە، جارێکی تر دەستم پێکردەوە، ئەگەر بمتوانیایە ئەم تۆزقاڵە گۆشتە قووت بدەم و لە گەدەمدا بیهێڵمەوە، بێگومان بۆ دامرکاندنەوەی برسێتی کەڵکی هەبوو، گرنگ ئەوەبوو کە گۆشتەکە لە گەدەمدا بمێنێتەوە، بەلام دیسان دڵم تێکەڵ هات، دواتر تووڕە بووم و زۆر بە توندی قەپاڵم لە گۆشتەکە گرت، پارچەیەکی تەنکم لێ کردەوە و بە زۆر قووتم دا، بەلام سوودی نەبوو، بەهۆی گەرمی گەدەمەوە پارچەگۆشتەکانیش گەرم دەبوو و خێرا لە قورگمەوە دەهاتنە سەرەوە، وەک شێتێک دەستی قونجام گوشی و لەتاو داماوی خۆم دەستم کرد بە گریان، ئێسقانەکەم بە ددانمەوە گرتبوو و دەمجووی، وەک پەرکەملێهاتووەکان خۆم لوول دەکرد، ئەوەندە فرمێسکم ڕشت کە ئێسقانەکە تەڕ بوو، دیسان ڕشامەوە، بە جنێودان و بەوپەڕی توندییەوە ئێسقانەکەم خستە بەینی ددانمەوە و دەمکڕاندەوە، بەدڵی شکاوەوە هۆنهۆن دەگریام، جارێکی تر ڕشامەوە و بە دەنگی بەرز جنێوم بە داروبەرد و ئەرزوئاسمان دا.

بێدەنگییەکی ڕووتوقووتە، نە بانگێک بەرگوێ دەکەوێت و نە چرایەک دەسوتێت، هیچ ڕۆحلەبەرێک لە دەورەم نییە، گەیشتوومەتە ئەوپەڕی تووڕەیی و بە دەنگی بەرز هەناسە دەدەم، هەرکات ئەو پارچەگۆشتانەی کە ڕەنگە تێرم بکەن، دەمرشاندەوە، دەگریم و ددانەکەم لە یەک توند دەکرد، چونکە ئەم هەموو هەوڵ و تەقەلایە

ناگـاته هـیچ؛ له کۆتاییـدا پـارچه ئێسـقانەکه بەرەو دەرگـایەک فـڕێ دەدەم، پڕ بووم له ڕق و ناتوانم هیچ بکەم، له تورەییدا دەرپەڕیوم و جنێـو به ئەرز و ئاسـمان دەدەم، به پەسـتی نـاوی خـوا دەهێـنم و پەنجەکانم وەک چڕنووکی دڕندەکان دەگووشم و دەڵێم: ئەی ئەو بته ستەمکارەی له ئاسماندای! ئاشکرا و بێپەردە بوونت ڕەت دەکەمەوە، ئەگەر بشزانم هەیت به جۆرێک نەفرەتت لێ دەکەم، که ئاگری دۆزەخ سەرلەبەری عەرشت بگرێتەوە، بزانه که بەندەی ملکەچت بووم و تۆ قبوڵت نەکردم، له بەردەرگاکەت دەرت کردم، له ئێستاوه بۆ هەمیشه ڕووت لێ وەردەگێڕم، له ساتی پاکیم تێنەگەیشتی و لێم تورەبوویت، بـزانه، ئەگەرچـی له سـەرەمەرگدام، به نەفرەتـت دەکەم، ئەگەرچـی له لێواری مەرگدام، ئەی مانگای ئاسمانی، ڕەتت دەکەمەوە، تۆ حەربەی زۆر و فشـارت لـێ تونـد کـردم، بەڵام نـازانی هەرگیـز لەتـاو بەلا و کارەسـات نـاکەومە سـەرچۆک، هەر دڵـۆپە خوێنێک به دەمارەکانمـدا بگەڕێت، تاهەتایه به نەفرەتت دەکات و ئەو زمانه دەبڕم ناوت بهێنێت، ئەگەر بەڕاستی بوونت هەیه، دوا قسەکانم ببیسـته و بـزانه ماڵئاواییت لـێ دەکەم و بێـدەنگ دەبـم، پشـتت تێـدەکەم و سـەرم کـز دەکەم و دەڕۆم!

ئەمه دەڵێم و بێدەنگ دەبم.

لەتـاو شـڵەژان و لاوازی دەلەرزم، له جێگەکەم دانیشتووم و جووڵەم بـۆ ناکرێـت، زمـانم هەر خەریکـی جنێـو و کـوفرکردنە، دوای ئەو هەمـوو گریـانه تووشـی نـزگەره دەبـم و دوای ئەو تەقینەوه ڕقـاوییه مـات و مەلـوول له سـووچێک دەکەوم، بەدبەختـی و کڵـۆڵیم زمـانی هێنـابوومه گـۆ، دنیـایەک دەسـتەواژەی ئەدەبـی و دێـڕی کتێبـیم ڕیـز دەکرد! ڕەنگه نیوسەعات زیاتر خۆم به دەرگاکەوه نووسـاندبێت و له بەرخـۆمەوه قسـەم دەکـرد و نـزگەرەم دەکـرد، لەناکـاو گـوێم له دەنگەدەنگـێکه، دووکەس دێـنه کۆتـایی بونبەسـتەکه و پـێکەوه قسـه دەکەن، له دەرگـایەک که پێـوەی نووسـاوم دوور دەکەومەوه، له نـاو

بیناکانەوە دەڕۆمە کۆڵان و شەقامە ڕووناکەکانەوە، بە پێخشکێ لە گردۆڵکەی یۆنگەوە بەرەو خوارەوە دێم، لەناکاو خەیاڵێکی سەیر دێتە مێشکمەوە، لە بەرچاوم ئەم کەپرە ناشیرینانە، کە لای بازاڕەکە دروستکراون، ئەم کاروانسەرا و کۆلانەی سەروپێیانە دزێو و شەرمەزارین و ئەو ناوە گڵاو دەکەن، دیمەنی بازاڕەکە دەشێوێنن، تف لەم وەزعە! با بڕوخێت ئەم کەلاوە و کەپرانە! بەدەم ڕێگاوە دەیخەملێنم بزانم گواستنەوەی بەڕێوەبەرایەتی پلانداناان بۆ ئەم ناوچەیە چەندی تێدەچێت، هەرکات بە بەردەم ئەم بینا جوانەدا تێدەپەڕیم بەڕاستی چاوم تێر دەبوو، ڕەنگە بە کەمتر لە حەفتا بۆ هەشتا هەزار کرۆن، ئەم کارە سەرنەگرێت، بە ویژدانەوە بڵێم ئەم پارەیە پاروویەکی چەورە، ئەگەر جارێ ئەم پارەیەم لە گیرفان بوایە زۆر خراپ نەبوو، کەللەی مەنگ و وڕی خۆم ڕادەوەشێنم و پێم وابوو کە لە ئێستادا ئەو بڕەپارەیە بۆ پارەی گیرفان کەم نییە، دیسان دەلەرزم و دوای گریان و ڕۆڕۆیەکی زۆر دیسان نزگەرەم تووش دەبێت.

دەمبینی ئیدی هیچ توانایەک لە گیانمدا نەماوە، ڕەنگە دواساتەکانی ژیانم بەڕێ بکەم، بەلام هەر بە خەیاڵمدا نەدەهات، خۆم دابووە دەست چارەنووس و زۆر بە ئاسوودەیی بەرەو خوارەوە، ڕووەو دەریا دەڕۆیشتم و زیاتر لە ماڵەوە دوور دەکەوتمەوە.

لە دڵەوە حەزم دەکرد لە سەر پشت، لە سەر شەقامەکە ڕاکشێم و باوەش بۆ مردن بکەمەوە، چەرمەسەری و ئازاری زۆر بەکاوەخۆ منیان سڕ و بێهەست کردبوو، برینی قاچم زۆر دەکزایەوە، تەنانەت هەستم دەکرد ئازار تا پووزی پێم هەڵکشاوە و هەموو گیانم دەگرێتەوە، بەلام ئەمەش ئازاری نەدەدام، چونکە من قووڵترین دەردەکانم چەشتبوو و بەرگەی هەموو شتێکم گرتبوو.

گەیشتمە خوارشار و خۆم لە شەقامی لای ئاسنەڕێ بینیەوە، گوێم لە کەمترین دەنگ نییە و هاتوچۆی گالیسکە و ئەسپوعارەبانە بوونی

نەبوو، پاش هەوڵ و گەڕانی زۆر ئەگەر چاوت بە مرۆڤێک بکەوتایە، دەریاوان یان حەماڵێکی بەندەر بوو، کە دەست لە گیرفان نەرمنەرم دەڕۆیشت، لەم کاتەدا پیاوێکی شەلم بینی، کە نزیکم کەوتەوە سەیرێکی کردم، لەخۆڕا چوومە لای و کڵاوەکەم هەڵگرت، پرسیم ئایا ئاگای لە کاتی ڕۆیشتنی کەشتیی **لانۆن** هەیە یان نا.

ئاگام لە کەشتیی **لانۆن** نەمابوو، بەڵام تەواو لە بیرم نەکردبوو، بێ ئەوەی بمەوێت دەکەوتەوە بیرم، پیاوەکە نەناسەکە لە وەڵامدا بەسەرسوڕمانەوە وتی:

- "سەیرە، مەگەر نازانن کە کەشتیی **لانۆن** بەمزووانە دەڕوات."

پرسیم:

- "دەزانێت بەرەو کوێ دەچێت."

پیاوەکە قاچە کورتەکەی ڕاگرتبوو، لە سەر قاچە درێژترەکەی وەستابوو، لە کاتێکدا قاچە نوقسانەکەی بە ئاسمانەوە هەڵواسرابوو، بیرێکی کردەوە و وتی:

- "نەخێر ئاگادار نیم."
- "بەڵام ئێوە نازانن کەشتییەکە چی بار دەکات؟"

بێئاگایی خۆم نیشاندا و هێشتا هیچ نەبووبوو، مەسەلەی کەشتییەکەم تەواو لە بیر کرد و پرسیم:

- "مەودای ئێرە تا **هلمشتراند**، بە مایلی دەریایی چەندە؟"

کەمێک ڕاما و وتی:

- "وتتان **هلمشتراند**؟[1] پێم وایە نزیکەی..."

قسەکەم پێ بڕی و درێژەم پێدا:

- "... یان بۆ نموونە **فبلۆنگشنسن**[2]، چەند دوورە؟

دیسان بیری کردەوە و وتی:

---

[1] Holmestrrand: یەکێک لە بەندەرەکانی نەرویج لە کەنداوی ئۆسلۆ. (و.ف)

[2] Voblungsnaes: یەکێکە لە بەندەرە زۆر بچووکە و کەسبەهاکانی وڵاتی نەرویج. (و.ف)

"ئەگەر ڕاستیتان بوێت نازانم... تا هملشتراند، وابزانم کە..."
قسەکانی تەواو نەکردبوو دیسان قسەیەکی ترم کرد و وتم:
"ئێستا با واز لەوە بهێنین، زۆر ببوورن دەکرێ کەمێک توونتم بدەنێ بۆ جووین؟ زۆریشم ناوێت، تۆزێک بەسە."
پیاوەکە توونتەکەی پێدام و منیش بە گەرمی سوپاسم کرد و ڕۆیشتم، توونتەکەم بەکارنەهێنا، بەڵکو یەکسەر خستمە گیرفانمەوە، بەڵام پیاوەکە بە چاو ئاگای لێم بوو، ڕەنگە گومانی لێ کردبم، هەستم کرد بڕۆم یان بمێنمەوە لە نیگای پڕگومانی ئەو ڕزگارم نابێت، چونکە ئەو هەستە زۆر ئازاری دەدام، دواتر ڕێک بەرەو لای دەچم و دەڵێم: پینەچی پیس! هەر ئەم وشەیە دەڵێم و بێدەنگ دەبم، لە کاتی وتنیدا بەڕادەیەک ڕاماو و ترساو چاوم تێبڕیوە، وەک ئەوەی بمەوێت گیانی بکێشم، دوای ئەوە کەمێک دەوەستم و دواتر شەلەشەل بەرەو مەیدانی **ئاسنەڕێ** دەڕۆم، پیاوەکە قسەی نەکرد و تەنیا بە چاو دوام کەوت، هەستم دەکرد پێشتر ئەم پیاوە نوقسانەم بینیبوو، تەنانەت سەرەتاش وام هەست کرد، لەپڕ وەستاوم و وشەی پینەچیم بیرکەوتەوە، بەڵێ ڕۆژێک کە هەتاو بوو و هێڵەکەکەم دەبرد بۆ دووکانەکە، لە سەروو کۆڵانی **گرنسن** بەری کەوتم، بەڵام وادیارە لەو کاتەوە چەندین سەدە تێپەڕیوە.
پاڵم بە دیوارێکەوە داوە و لە نزیک شەقامی بەندەر و ئاسنەڕێ بیرم لەمە دەکردەوە، کە لە ناکاو حەپەسام و خۆم لە بەردەم **کماندۆر** بینییەوە، ویستم هەڵبێم، بەڵام نەمتوانی چونکە ڕێگەی هەڵهاتن نەبوو، بەناچاری حەیا و شەرمم لە بیر کرد و زەقزەق سەیرم کرد، بێباکی و بێدەربەرستییەکی ناشیرین دەنوێنم، هەنگاوێک لە دیوارەکە دوور دەکەومەوە و هەوڵ دەدەم هەر جۆرێک بێت سەرنجی ڕابکێشم، هەڵبەت نامەوێ هەستی بەزەیی بوروژێنم، بەڵکو مەبەستی دەروونیم ئەوەیە خۆم نزم بکەمەوە و خاکی و مەزلوم بێمە بەرچاوی.

ئامادەم لەخۆبردووییم بگەیەنمە لوتکە، بۆ نموونە خۆم بخەم بەسەر پێیدا و ببمە خاکی بەرپێی، بە جۆرێک لە بەردەمیدا هیچوپوچ و سووک بووم، کە تەنانەت سڵاویشم نەکرد، ڕەنگە **کماندۆر** هەستی کردبێت چیم لێقەوماوە، چونکە هەنگاوەکانی هێواش کردەوە و منیش بۆ ئەوەی نەهێڵم بڕوات وتم:

- "بڕیار بوو وتارێکتان بۆ بنووسم، بەڵام تا ئێستا نەمتوانیوە."

**کماندۆر** بە حاڵەتی سەرسوڕمانەوە وتی:

- "سەیرە کەواتە هێشتا وتارەکەتان تەواو نەکردووە؟"
- "نەخێر، هێشتا تەواو نەبووە."

لەپڕ بەهۆی دڵدانەوەی گەرم و تێگەیشتنی ئەوەوە، فرمێسک لە چاومدا قەتیس دەبێت، بۆ ئەوەی خۆم بچووکتر نەکەمەوە بە زۆر کۆکەیەکم کرد، **کماندۆر** بە لووتی هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژێت و سەیرێکی من دەکات و دەڵێت:

- "ئێستا تا وتارەکە تەواو دەبێت پارەتان پێیە؟"
- "نا فلسێکم پێ نییە، تەنانت ئەمڕۆش نانم نەخواردووە، بەڵام..."

دەست دەخاتە گیرفانی و دەڵێت:

- "کوڕم، بۆچی ئەوەندە خۆت برسی دەکەیت، ڕەنگە تەواو تیا بچیت!"

قسەکەی بەڕادەیەک خەجاڵەتی کردم، کە ئەژنۆم شل بوو و دەستم بە دیوارەکەوە گرت و بێدەنگ بووم، بینیم لە جزدانەکەی دەگەڕێت و دە کرۆنییەک دەردەهێنێت و یەکسەر دەیخاتە بەردەمم و دەڵێت:

- "مەحاڵە بهێڵم ئاوا برسێتی بچێژی و تیا بچی!"

هەڵبەت من ئاسان پارەکەم وەرنەگرت، بەڵکو موجامەلەم کرد و وتم ئەم پارەیە زۆرە و شەرمەزاری ئێوەم... **کۆماندۆر** بەردەوام سەیری سەعاتەکەی دەکرد و دواجار وتی:

- "زووتر وەری بگرن و شەرم مەکەن، چونکە من چاوەڕێی شەمەندەفەرم و وابزانم گوێم لە دەنگی شاورەکەیە..."

له کۆتاییدا پارەکەم وەرگرت، له خۆشیدا وەها حەپەسابووم که زمانم گوێ نەدەکرد، تەنانەت سوپاسیشم نەکرد، **کماندۆر** وتی:

"بۆ ئەمه بێتاقەت مەبن، چونکه لەبری ئەمه دەتوانن وتارمان بۆ بنووسن."

ئەم قسەیەی کرد و ڕۆیشت، که دوورکەوتەوە ئینجا بیرم کەوتەوە تەنانەت سوپاسم نەکردووە، بڕیارم دا دوای بکەوم و دەستخۆشی لێ بکەم، بەڵام قاچم سست و لەرزۆک بوو و دەترسام به دەما بکەوم، یان لانیکەم نەتوانم خێرا بڕۆم و بیگرمەوە، لەم کاتەدا ئەو دوور دەکەوتەوە، بیرم کردەوە ئێستا که ناتوانم پێی بگەمەوە با بانگی بکەم، بەڵام پرکێشی ئەوەشم نەکرد، هەرچۆنێک بێت دوای ئەوەی هاتمەوە سەرخۆم، یەک دوو جار بانگم کرد، بەڵام بەداخەوە دەنگ لاواز و ناڕوون بوو و ئەویش دیار نەمابوو.

لای شۆستەکە وەستابووم و به چاوم بەڕێم دەکرد، له ناوەوە دەگریام و دەموت ئایا بەڕاستی ده کرۆنی پێدام؟ شتی وام له خەونیشدا نەدەبینی، دواتر گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی ئەوم بینیبوو و هەموو جوڵەکانیم بەبیرهێنایەوە، له خەیاڵمدا وێنام کردەوە، پارەکەم خستە بەرچاوم، چەندین جار ئەملاولای پارەکەم سەیر کردەوە، به هاوارەوە سوێند دەخۆم ئەوەی دەیبینم ڕاستییه نەک خەون و ئەوەی بەدەستمەوەیه ده کرۆنییە.

ماوەیەک دواتر و ڕەنگه ماوەیەکی زۆریش دوای ئەوە، بەڕێکەوت و پەرجووئاسا خۆم له بەردەم ماڵی ژمارە ١١ی کۆڵانی **تامت** دا بینییەوە، بێدەنگی هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو، بیرم کەوتەوە جارێک به ئەسپوعارەبانه هاتبوومه ئێرە و عارەبانەچییەکەم هەڵخەڵاتاندبوو و ڕام کردبوو، یانی لەم دەرگای بیناکەوە هاتبوومه ژوور و له دەرگاکەی ترەوە هەڵهاتبووم و کەسیش منی نەبینیبوو، سەیرم لەم یادەوەرییەم هات و پاش چڕکردنەوەی خەیاڵ، بۆ جاری دووەم له

هەمان دەرگاوە ڕۆشتمە ناو میوانخانەکە، داوای ژوورێکم کرد و یەکسەر چرپایەکیان خستە خزمەتمەوە.

*****

ڕۆژی سێشەممە هەوا خۆش و ئاسمان ساماڵ بوو، چەند ڕۆژێکی خۆشی درەوشاوە بوو! بەفرەکان دەتوانەوە و دەموچاوەکان دڵخۆش و لێوەکان گەشابوونەوە، لە هەموو شوێنێک جموجووڵ و دڵخۆشی دەبینرا، ئاو لە نافورەکەوە بەرز دەبووەوە، لە کاتی هاتنە خوارەوەدا ڕەنگی ئاسمانیی شین و تیشکی زێڕینی خۆری وەردەگرت، وەک کەوانەی زێڕین و شین لە هەوادا دەدرەوشایەوە.
نزیک نیوەڕۆ لەو ژوورەی لە کۆڵانی **تامت** بەکرێم گرتبوو هاتمە دەرەوە، هێشتا بەهۆی ئەو دە کرۆنەی کە **کماندۆر** پێی دابووم لەوێ دەژیام و ژیانێکی خۆشیشم هەبوو. بەهەرحاڵ، ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش و کەیفساز بووم، هەموو ئەو پاشنیوەڕۆیەم بە پیاسەی کۆڵانە قەرەباڵغەکان تێپەڕاند، پێش سەعات حەوت سەردانێکی کورتیشم بۆ مەیدانی **سانت ئۆلاف** کرد، هاوکات بە دزیشەوە ئاگام لە پەنجەرەکانی ماڵی ژمارە ٢ بوو، دوای سەعاتێک بە دیداری شاد بووم، هەموو ئەو ماوەیەم بە چاوەڕوانی و دڵەڕاوکێوە هەنگاو هەڵدەگرت، بەڵام چەند دڵەڕاوکێیەکی خۆش و دڵگیر بوو! ئێستا بزانین چی دەبێت، کە لە ماڵەوە هاتەدەر و نزیکم بێتەوە چۆن دەست بە قسە بکەم، بڵێم سڵاو خانم یان بزەیەکی بۆ بکەم، لە کۆتاییدا بڕیارم دا تەنیا بە زەردەخەنەیەک قەناعەت بکەم، هەڵبەت سڵاوێکیش دەکەم بەڵام زۆر بە هێمنی.
بۆ ئەوەی بەر لە کاتی دیاریکراو لە ژوانگەکەمان ئامادە نەبم و نەشڵەژێم، خۆم شاردەوە و پیاسەیەکم بە شەقامی **کارل یۆهان**دا کرد، بەڵام چاوم لە کاتژمێری زانکۆ هەڵنەدەگرت، هەر کە بوو بە سەعات هەشت جارێکی تر تا سەرەوەی شەقامی زانکۆ ڕۆیشتم، لەپڕ

هەستم کرد ڕەنگە چەند خولەکێک درەنگ بگەم، هەربۆیە هەنگاوەکانم خێراتر کرد و دەستم کرد بە ڕاکردن، پێیەکانم هێشتا چاک نەبووبوونەوە و زوو ئازاری پێدەگەیشت، بەڵام ئەگەر لەمە گەڕێین بە گشتی زۆر باش بووم، گەیشتمە نزیک کانییەکە و وەستام، فووم لە ئاوەکە دەکرد و ماوەیەکی درێژیش لەوێوە سەیری پەنجەرەکانی ماڵی ژمارە ٢م دەکرد، بەڵام نە دەنگی هەبوو نە ڕەنگ.

قەیچێکا! من پەلەم نەبوو و هێشتا دەمتوانی چاوەڕێ بکەم، ڕەنگە کێشەیەکی بۆ دروست بووبێت، چاوەڕێ بووم و ماوەیەکی زۆر خەیاند و نەهات و بە خۆم وت گرنگ نییە، ئەمەم لە سەرەتاوە دەزانی، مەگەر یەکەم جار کە بینیم ئەو شەوە نەبوو کە تام هەبوو؟ دواتر دوودڵ کەوتمە بیرکردنەوەوە و دڵتەنگ بووم لەوەی ئەمە بگاتە هیچ، لەپڕ گوێم لە دەنگی کۆکەیەک بوو لە پشتەسەرمەوە، گوێم لە دەنگی سووکەڵەی پێیەک بوو لە دەوروبەری خۆم، بەڵام ئاوڕم نەدایەوە و بەردەوام بوو لە سەیرکردنی ماڵەکە، بەوەی ئەو لە ڕێگەیەکی ترەوە دەرکەوت بەڕادەیەک دەحەپەسێم، کە زەردەخەنەکەم بیر دەچێتەوە و تەنانەت کڵاوەکەشم لانابەم، وەک ئەوەی ڕێگەیەکی زۆری بڕیبێت بە هەناسەبڕکێوە وتی:

"زۆر چاوەڕێتان کرد؟"

"بە هیچ شێوەیەک، ئێستا گەیشتمە ئێرە، خۆ کێشەش نییە زۆر چاوەڕێ بم، جگە لەوەش وام زانی لەولاوە دێن."

"دایکم گەیاندە شوێنێک و شەویش لەوێ دەمێنێتەوە."

" ڕاستە... ئاوا."

دەست دەکەین بە هەنگاونان و پاسەوانی سووچی کۆڵانەکە سەیرمان دەکات، کچەکە وەستا و وتی:

"باشە ئێستا بۆ کوێ دەچین؟"

وتم:

- "بۆ هەر شوێنێک پێتان خۆش بێت، هەر جێیەک بەڕاستی دڵتان حەز بکات."

وتی:

- "ئاخ! بڕیاردان بە تەنیایی چەند قورسە" و ماوەیەک بێدەنگ بوو.

دواتر بۆ ئەوەی بێدەنگی بشکێنم، وتم:

- "وابزانم پەنجەرەی ماڵەکەتان ڕووناک نییە."

یەکسەر وەڵامی دایەوە:

- "ئاخر کارەکەرەکەشمان ناردۆتەوە و جگە لە من کەس لە ماڵەوە نییە."

دواتر هەردووکمان بە وەستانەوە، بە جۆرێک سەیری پەنجەرەکانی ماڵی ژمارە ٢ دەکەین، وەک ئەوەی تازە بێت و تا ئێستا نەمابینیبێت.

وتم:

- "کەواتە ئێستا دەتوانین بڕۆینە ماڵی ئێوە، ئەگەریش بێتاقەت دەبن من ئامادەم تەنیا لای دەرگاکە دابنیشم."

یەکسەر شڵەژام و لە بێشەرمی خۆم پەشیمان بوومەوە و لەرزەیەک کەوتە گیانمەوە، بیرم کردەوە ڕەنگە پێی ناخۆش بێت و بڕوات و بۆ هەمیشە نەیبینمەوە، چەند سەروشێوەیەکی پەڕپووت و پاتاڵم هەبوو! بەهەرحاڵ، بە هیچ ئومێدێک چاوەڕێی وەڵامەکەی بووم. وتی:

- "بە هیچ شێوەیەک ڕازی نابم لە بەردەرگا بمێننەوە..."

ڕۆیشتینە سەرەوە، ڕێڕەوەکە تاریک بوو، دەستی گرتم و ڕێنمایی کردم و وتی:

- "بۆچی دەبێ ئەوەندە بێدەنگ بن؟ مەگەر زمان لە دەمتاندا نییە؟"

لەم کاتەدا ڕۆیشتینە ناو ماڵەکە، لە کاتی داگیرسانی مۆمەکە وتی:

- "تکایە سەیرم مەکەن زۆر شەرم دەکەم! دوای ئەمە ئیتر شتی وا ناکەم."

- "مەبەستتان شتەیە؟"

- "نا، نا، خوا فریام بکەویت! لەمە بەدوا ئیتر ماچتان ناکەم!"

"بێگومان هەرگیز و بەم قسەیە هەر دووکمان پێکەنین."

دەستم بەرەو لای درێژ کرد، بەڵام خۆی لادا و ڕۆیشتە ئەولای مێزەکە، ماوەیەک بێدەنگ سەیری یەکترمان کرد، دواتر بە هێمنی تۆڕی سەر دەموچاوی لادا و کڵاوەکەی لە سەری هەڵگرت، بەڵام بە چاوە پڕپێکەنینەکانی لە من ڕامابوو و چاودێری جووڵە و ڕەفتارەکانی دەکردم نەوەک لە پڕ بیگرم، ئامادە بووم دیسان دەست بکەمەوە بە هێرشکردن، هەر لەگەڵ هەستاندا قاچم لە سەر فەرشەکە خزا و کەوتم، چونکە نەمدەتوانی لە سەر پەنجە برینداره‌کەی قاچم بوەستم، شینەوەبوو و شەرمەزار هەستامەوە. وتی:

"ئەی هاوار بۆ وا سوورهەڵگەڕاون؟ چۆن لە کاتی هەنگاوناندا وریا نەبوون؟"

وتم:

"بەڵام ناشیانە جووڵام."

دیسان بەزم و ڕاکەڕاکە دەستی پێکرد.

پرسی:

"وادیارە دەشەلن."

وتم:

"ڕەنگە کەمێک قاچم بشەلێت، بەڵام زۆر بچووکە و گرنگ نییە."

وتی:

"جاری پێشوو پەنجەتان بریندار بوو، ئەمجارە سەرەی قاچتانە، بەم ئازارانەی دەیچێژن دەترسم."

وتم:

"ڕاستییەکەی چەند ڕۆژی پێشوو پێم کەوتە ژێر شتێکەوە."

وتی:

"ڕەنگە دیسان سەرخۆش بووبن و پێتان کەوتۆتە ژێر شتێک، بۆ خاتری خوا! گەنجێکی وەک ئێوە بۆچی دەبێ بەوجۆرە بژی!"

پاشان حاڵەتێکی جیدی وەرگرت و بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی بۆ من کرد و بە هەڕەشەوە وتی:

- "بەسە! با وەک دوو زەلامی ئاقڵ دانیشین. نەخێر، لای دەرگاکە دامەنیشن، زۆر دەستەپاچەن، وەرنە نزیکتر، من لێرە و ئێوە لەوێ... وا باشە! خەڵکی دەستوپێ سپی بێزارت دەکەن، ناچار دەبێت هەموو قسەیەک خۆت بیکەیت و هەموو کارێکیش هەر خۆت. هەر ئامادە نین هیچ دەستپێشخەرییەک بکەن و لە جێگەکەیان بجووڵێن، بۆ نموونە هیچ بیرتان لەوە کردۆتەوە ئەگەر دەستتان بخەنە سەر پشت کورسییەکەی من، هیچ کێشەیەکی تیا نییە، وایە یان نا؟ ئێستا کە ئەمە دەبیستن چاوتان وا لێ دەکەن وەک ئەوەی باوەڕ بە قسەکەم ناکەن، ئەوەی وتم ڕاستییەکە و چەندجار بیرم لەمە کردۆتەوە، سەیرکە وا دیسان خەریکە دەست پێدەکەنەوە، ئەی بۆ کە بەوپەڕی جورئەتەوە خۆتان هەڵدەدەنە سەرم ئاوا مەزلووم و دەستەپاچە نین؟ بۆچی ئەو ڕۆژە بە سەرخۆشی تا بەردەم ماڵەوە دوام کەوتن، هەزار جۆر فیلۆتەڵەکەتان خستە کار بۆ ئازاردانم و دەتانوت "خانم کتێبەکەتان جێ هێشت"، "خانم کتێبەکەتان ون کرد" ئەوەندە شەرمن نەبوون؟ بەڵێ وەلامتان چییە بۆ ئەمە؟ ئاهـ! ئەو ڕۆژە کارێکی زۆر ناشیرینتان کرد.

من لە جێگەکەی خۆم دانیشبووم و ئەوقی قسەکانی بووبووم، دڵم پەلەپەل لێی دەدا، خوێن لە دەمارەکانما دەکولا، چێژێکی زۆرم وەردەگرت ئێستا لە ماڵێکدام گوێم لە دەنگی چرکەچرکی سەعاتەکەیەتی، لەبری ئەوەی قسە لەگەڵ خۆم بکەم، لەگەڵ خانمێکی دڵخۆش و تەڕوبڕ دەمەتەقێمە.

کچەکە پرسی:

- "بۆچی هیچ ناڵێن؟"

وتم:

"ئاخ ئێوە بۆچی ئەوەندە نازدارن! بەڕاستی دڵمتان بردووە، لە ناخەوە عاشق و شەیداتان بووم، چی بکەم بەدەست خۆم نییە، بەڵێ، ئێوە سەیرترین مەخلوقن کە... بڵێم چی؟ چاوتان هەندێ جار وا سەرنجڕاکێش و ڕوون دەبێت، کە تا ئێستا وێنەیم نەبینیوە، دەڵێی دوو نێرگسی دەمبەخەندەن، نا، ڕەنگە نێرگسیش شایستەی چاوە جوانەکانتان نەبێ... من عاشق و دێوانەتانم، بەڵام سوودی چییە! ناوتان چییە؟ بەڕاستی دەبێ ناوەکەتانم پێ بڵێن...

کچەکە وتی:

"یەکەم جار ئێوە ناوی خۆتان بڵێن، خوایە دیسان خەریکبوو بیرم دەچوو ئەمەتان لێ بپرسم، دوێنێ هەر بیرم لەمە دەکردەوە ئەگەر ئێوەم بینی بپرسم، هەڵبەت ناڵێم ئەو ڕۆژە هەمووی بیرم لە ئێوە کردۆتەوە".

وتم:

"دەزانن چ ناوێکم لێناون؟ ناوم ناون **ئیلایالی**، چۆنە؟ چ کێشێکی ڕەوان و دلفرێنی هەیە!

وتتان **ئیلایالی**؟

بەڵێ.

ئەم ناوە بیانییە؟

نا، بیانیش نییە.

بڵێم چی، ناوێکی خراپ نییە!

دوای گفتوگۆیەکی درێژ ناوی یەکترمان زانی، لە سەر چرپاکەی ڕاکشا و خۆی بە منەوە نوساند و کورسییەکەی بە قاچ دوورخستەوە، دیسان باسی هەموو شتێکمان کرد. پرسی:

"وادیارە ئەمشەو ڕیشتان تاشیوە، بەگشتی حاڵتان لە جاری پێشوو باشترە، بەڵام زۆر هەستی پێناکرێت... نەوەک بەم قسە وابیربکەنەوە کە... بەڕاست جاری پێشووی زۆر سەروشێوەتان چلکن بوو،

پەرۆكۆنەیەكی پیسیشتان بە پەنجەوە پێچابوو، زۆریشتان لێ دەكرد بڕۆینە شوێنێك و شەراب بخۆینەوە، بەڕاستی ئافەرم!"

وتم:

- "كەوابێ لەبەر سەروفەسالّی چلكنی من بوو كە نەهاتن؟"

چاوەكانی داخست و وەلآمی دایەوە:

- "نا، نا، خوا دەزانێت لەبەر ئەمە نەبوو، هەر بیریشم لەمە نەكردەوە."

دیسان وتم:

- "گوێ بگرن، ئێوە بەڕاستی وادەزانن من دەتوانم حەزم لە هەر شتێك بێت بیپۆشم و چۆنم پێخۆشە بژیم، ئەمە لە توانای مندا نییە، چونكە زۆر هەژارم."

سەیرێكی كردم و وتی:

- "كەواتە ئێوە ئەوەندە دەستكورتن؟"

- "بەلێ"

ماوەیەك هەردووكمان بێدەنگ ماینەوە، دواتر سەری خۆی بە جۆرێك وەك ئاماژە بێت بۆ خۆڕاگری جولآند و وتی:

- "خوا دەزانێت منیش فەقیر و هەژارم و حالّم لە ئێوە باشتر نییە."

ئەگەرچی ئەو لە كچە زۆر ئاساییەكانی كریستیانیا بوو، لە كاتی قسەكردندا وشەی زۆر باوی بەكار دەهێنا، شێوازی دەربڕینی زۆر سوواو بوو، بێباكی و زۆربلێیی تایبەتی بەتەواوی هەلّگرتبوو، بەلآم قسەكانی لە دلّم دەنیشت و وەك دلّۆپە شەراب سەرخۆش و سەرمەستی دەكردم، هەر كات قسەی دەكرد ڕاهاتبوو سەری كەمێك لار بكاتەوە و گوێی نزیك بخاتەوە، هەناسەشی بەر گۆنام دەكەوت و شێتوشەیدای دەكردم و لە خۆشی و چێژدا ئاگام لە خۆم نەمابوو.

وتم:

- "دەزانن... بەلآم تكایە پێتان ناخۆش نەبێت!... دەزانن دوێشەو لە سەر چرپاكەم بووم دەستەكانم بەمشێوەیە كردەوە، وەك ئەوەی ئێوە لە

تەنیشتم خەوتبن و دەمویست باوەشتان بکەم، بەم جۆرش خەوم لێ کەوت."
"بەڕاست؟ چەند جوانە!"
دیسان بێدەنگی دروست بوو و دواتر دەستی بە قسە کردەوە و وتی:
"هەڵبەت لە من دوور بوون بۆیە وا ئازایەتیان نواند ئەگەر نا...."
"پێتان وانییە ئەگەر وانەبێت ناتوانم بیکەم؟"
"نا، باوەڕناکەم بتوانن."
ئینجا هاتمە سەر زەوق و وتم:
"بۆچی نا! من هەموو شتێکم لێ دەوەشێتەوە"
یەکسەر دەستم خستە دەوری کەمەری و لە وەڵامدا وتی:
"بەڕاست؟"
ئەم قسەیەم پێ ناخۆش بوو و تووڕە بووم، کە بۆچی دەبێ ئەوەندە سەرکز و پابەندی ئەخلاقم بزانێت، خۆم ڕێک کردەوە و سینگم دەرپەڕاند، هەموو ئازایەتییەک کە لە خۆمدا شکم دەبرد کۆم کردەوە و دەستیم گرت، بەڵام ئەو زۆر بە نەرمی دەستی لە دەستم دەرهێنا و کەمێک لێم دوورکەوتەوە، بەم جووڵەیە زەبرێکی ترم بەرکەوت و دڵسارد و خەجاڵەت بووم و چاوم بڕییە پەنجەرەکە، بۆچی دەبێ من کە ئاقڵ و سەرکز دانیشتووم بخاتە سەر کەڵکەڵە و ناچار بەم کارانەم بکات! ئەگەر لە ڕۆژانی خۆشی و بەختەوەری، ئەوکاتەی شێوەم لە بنیام دەچوو و لانیکەم دەستم لە گیرفانی خۆمدا بوو، ئەوم بناسیایە، ئێستا مەسەلەکە جۆرێکی تر بوو، بەڵام ئێستا هەستم بە نائومێدی و شکست دەکرد.
وتی:
"ئەوەتا دەبینی کە بە گرژی و دوورکەوتنەوەیەک چۆن مەیدان چۆڵ دەکەن، تەنها بە کەمێک خۆبواردن چۆن شپرزە و دەستەپاچە دەبن."
چاوی داخست و پێکەنینێکی لاسارانەی کرد، وەک ئەوەی شەرم بکات سەیری دەموچاوی بکەم، دەرپەڕیم و وتم:

- "تەواو ناخۆشتان کرد، لەمە بەدوا چی ڕووی دا خۆتان بەرپرسن."

دواتر بە توندی دەستم خستە سەر شانی، یان بەڕاستی فێڵبازە یان منی بە تازەکار دەزانی! بەڵێ، شەیتان دەڵێت بیکەم ئەوەی نابێ بیکەم، تا وانەزانێت لەم شتانە نازانم! ئایا ئەم ژنە شەیتانێکی بەرجەستە نەبوو؟ مەبەست ئەوەیە دەست بەکار بم، ئەوکات بەڵێ ئیتر... وەک ئەوەی بەم هەموو بانگەشە و کەشوفشەوە بەڕاستی شتێکم پێدەکرێت! ئەو هێمن و بێگوناه چاوی داخستووە و لە شوێنەکەی خۆی دانیشتووە، کەسمان قسەمان نەدەکرد، بە توندی لە باوەشم گرت و بە خۆمەوە گووشیم، خۆم نا بە سینگییەوە، بەڵام هیچی نەکرد.

دەنگی دڵی خۆم و ئەو، هەردووکمانم دەبیست، وەک ئەسپێک چوارناڵ غار بدات، دەیترپاند، لە باوەشم گرت و ماچم کرد، بە هیچ شێوەیەک باوەڕم نەکرد ئەوە من بم کە ئەم کارە دەکەم، چەند وشەیەکی پەرش و پەرتەوازە لە دەمم دەرچوو و کەوتە پێکەنین، یەک لەدوای یەک ماچم دەکرد، گۆناییم دەلاواندەوە و قسەی عاشقانەم بە گوێیدا دەچرپاند، دوو قۆپچەی سەرەوەی هێلەکەیم کردەوە، مەمکی لە ژێر کراسەکەی وەک دوو شاکاری خوایی دەرکەوتن. پرسیم:

- "ئەتوانم سەیریان بکەم؟"

هەوڵ دەدەم قۆپچەکانی تریشی بکەمەوە، بۆ ئەوەی درزی کراسەکەی کراوەتر بێت، بەڵام بەڕادەیەک شڵەژاوم ناتوانم قۆپچەکانی خوارەوەی کراسەکەی، کە نووساوە بە کەمەرییەوە بکەمەوە.

- "دەتوانم کەمێک سەیریان بکەم... تەنیا کەمێک؟"

دەستێکی بە عیشوە و نازەوە دەئاڵێنێتەوە گەردنم، بە دەستەکەی تری قۆپچەکانی یەکبەیەک دەکاتەوە، هەناسەیەک لە لووتی سوورەوەبوو و لەرزۆکی دێتە دەر و ڕێک بەر دەموچاوم دەکەوێت،

پێکەنینی پچڕپچڕ و کورت دەکات و سەیرم دەکات، بزانێت لە ترسولەرزەکەی تێگەیشتووم یان نا، پەشۆکاو گرێی قرتێلە و دەرزی ستیانەکەی دەترازێنێت، منیش بە دەستی ئەستوور و نارێکمەوە یاری بە قرتێلە و قۆپچەکانی دەکەم... دواتر بۆ ئەوەی ئاگام لە ئیشەکەی نەمێنێت بە دەستی چەپ دەست بە شانمدا دەهێنێت و دەڵێت:

"بۆچی قژتان تۆپەڵ تۆپەڵ ڕژاوەتە سەر شانتان؟"

بەدەم پشتڕاستکردنەوەی قسەکانی هەوڵ دەدەم لێوم بگەیەنمە مەمکی، ئێستا ئیدی کراسەکەی تەواو کراوەیە و ڕاکشاوە، بەڵام لەپڕ وەک ئەوەی پەشیمان بێتەوە یان تێبگات لە سنوور ترازاوە، خۆی کۆ دەکاتەوە و کەمێک بەرز دەبێتەوە، هاوکات بۆ ئەوەی بێتاقەتییەکەی بۆ ئەو کارەی، یانی کردنەوەی کراسەکەی نەمێنێت، دیسان قسە لەسەر تاڵە قژە وەریوەکانی سەر شانم دەکات و دەپرسێت:

"بۆچی قژتان وا دەوەرێت؟"

وەڵام دەدەمەوە:

"نازانم."

دیسان دەپرسێت:

"لەوانەیە زۆر مەشروب بخۆنەوە و ڕەنگەش... نا، ناڵێم خەریکی چیترن، دەبێ شەرم بکەن، شەرمەزارییە! باوەڕم نەدەکرد ئێوەش وابن! حەیفە بەم گەنجییە ئاوا قژتان بوەرێت، دڵنیام ژیانتان شێواو و پرکێشەیە، دەبێ ڕاستییەکەی بڵێن و لە بیری نەبەرنەوە، ئەگەر بتانەوێت شتەکان بشارنەوە بە دەموچاوتانەوە دەیزانم، ئێستا باسی بکەن با بزانم."

ئاهـ چەند خراپ لە زەوقی دام! باشتر بوو لەبری ئەم هەموو خۆنواندن و جووڵە و پلانەی کە دامنابوو، هەوڵی جێبەجێکردنم دابوو، هێمن و لەسەرخۆ لە سووچێک دابنیشم و نوقمی تەماشای بم، من دوای بەرگەگرتنی ئەو هەموو ئازار و چەرمەسەرییە، لە

مرۆڤبوون کەوتووم و بووبوومەتە بوونەوەرێکی بێکەڵێک و هیچم پێ نەدەکرا.

کچەکە دیسان وتی:

- "بۆ وەستاون، دەست پێ بکەن..."

منیش هەلەکەم قۆستەوە و ڕاستییەکانم وەک خۆی باس کرد، هەموو وردەکارییەکانی ژیانم بۆ گێڕایەوە، بۆ وەسفی بەدبەختی خۆم زێدەڕۆییم نەکرد، چونکە مەبەستم ئەوە نەبوو بەزەیی پێمدا بێتەوە، تەنانەت وتم شەوێک پێنج کرۆنی کەسێکی ترم هەڵگرتووە، بە دەمی داچەقیو و ڕەنگی پەڕیو و چاوی مات و تۆقیو گوێی هەڵخستبوو، گوێی لە قسەکانم دەگرت، دواتر بۆ قەرەبووکردنەوەی هەموو ئەم قسە تاڵ و بەسوێیانە کە زۆر کاری لێکردبوو، خۆم قنجوقیت کردەوە و بە دەنگێکی جیدییەوە وتم:

- "ئێستا قسەکانم تەواو بوون و گرێی دڵیش کرایەوە، ئیتر باسی ئەم جۆرە قسانە ناکەین."

بەڵام ئەو زۆر گێژ و بێهۆش دیار بوو، تەنیا وتی "خوا فریام بکەوێت" و دەنگی نەما، ناوبەناو دەیوت "خوا فریام بکەوێت"، دیسان بێدەنگ دەبوو و من دیسان پیاهەڵدان و گاڵتەوگەپم دەست پێکردەوە، کەمەریم دەگرت و ختووکەم دەدا و تا ئاستی شانەکانم بەرزم دەکردەوە، بەڵام بە قۆپچە داخراوەکانی پەست بووم، باشە بۆچی ئەمەی کردبوو؟ ئەگەر بیزانیایە قژم لەبەر ڕابواردن و خۆشژیان ڕووتاوەتەوە لە بەرچاویدا زیاتر دەبووم؟ ئەگەر خۆم بە گەنجێکی هەرزە و بێدەربەست پێناسە بکردایە باشتر دەچوومە دڵییەوە؟ ئێستا ئیتر دەبێ واز لە گاڵتە و گەمژەیی بێنم و قۆڵی لێ هەڵماڵم، ئەگەر سەرکەوتن تەنها کردار بێت من پیاوی ئەم کارەم، چار نەبوو جگە لەوەی دەست پێ بکەمەوە، دواتر پاڵم خست و بەوپەڕی سادەییەوە لە سەر چرپاکەی ڕام کشاند، نەک هەر بەرگریی نەدەکرد، بەڵکو بە ڕەفتاریشم سەری سوڕمابوو.

دواجار وتی:
"پێم بڵێن مەبەستتان چییە؟"
وتم:
"یانی دەتانەوێ مەبەستەکەم بزانن؟"
بەڵام هەستی کرد و وتی نا نا ئاخر... منیش وتم با با لێگەڕێن... لەم کاتەدا هاواری کرد:
"باش گوێتان بکەنەوە! دەڵێم مەحاڵە و ئەم دێڕە ناخۆشەشی وت:
"سوێند بە خوا وادەزانم شێتن!"
کەمێک وەستام و دواتر وتم:
"خۆ ئەم قسەیەتان بەڕاست نییە؟"
وتی:
"بەڵێ، چونکە سەروچاوتان زۆر سەیرە و جوڵەکانیشتان سەمەرەیە، کەواتە ئەو ڕۆژە دوام کەوتن بەڕاستی سەرخۆش نەبوون وایە؟"
"نا ئەو ڕۆژە برسیشم نەبوو، هەر ئەوکاتە نانم خواردبوو."
"ئێ، خراپتر!"
"پێتان باش بوو ئەو ڕۆژە سەرخۆش بوومایە؟"
"بەڵێ پێم باشتر بوو... ئەی هاوار لێتان ترساوم! خوایە گیان وازم لێ بێنن..."
کەمێک بیرم کردەوە و هەستم کرد باش نییە بەری بدەم، چونکە فیلێکی گەورەم لێ دەکرێت، بەو درەنگانی شەوە و لە سەر چرپا خۆ نابێ ئەم هەڵیوتوپەڵیتانە ڕیز بکات، هەڵبەت ژنان لەم ساتە هەستیارەدا ڕێگەی هەڵهاتنی سەیر و پلان و دەسیسە و بەهانەی غەریب دەدۆزنەوە!
بەڕاستی دەبێ منداڵ بم بۆ ئەوەی نەزانم ئەمانە هەمووی لە شەرم و حەیاوە دێت، نابێ بوەستیت، بەشی پێویست قسە کراوە، دەبێ ئێستا قسە کەمتر و کردار زیاتر بێت، بەڵام بە هێزێکی زۆرەوە بەرگری دەکرد، خۆڕاگرییەی بە جۆرێک توند بوو نەدەکرا بە شەرمی بزانم،

لەم کاتەدا بەڕێکەوت دەستم بەر مۆمێک کەوت و کەوتە خوارەوە و کوژایەوە، ئەو بەردەوام تەقەلا و خۆڕاگری دەکرد، بەڵام لەناکاو هەناسەیەکی بچووکی هەڵکێشا و وتی:

- "ئەمەیان ئیتر نا... نا! ئەگەر بتانەوێ ڕێگە دەدەم مەمکم ماچ بکەن، ئاخر کەمێک وریا بن!"

یەکسەر دەستم هەڵگرت، چونکە ئەم قسەیەی ئەوەندە بە ترس و قێزەوە کرد، کە تەواو حەپەسام، لەم کارەدا دنیایەک کەیفوسەفا هەبوو، زۆری نەمابوو بکەوم بەسەر قاچیدا، ترساو و نیگەران وتم:

- "ئاخر گیانەکەم، دڵەکەم، من سەر لەم ڕەفتارانەی ئێوە دەرناکەم، ڕاستییەکەی لە مەبەستی ئەم یارییەش تێناگەم..."

هەستا و بە دەستی لەرزۆکەوە مۆمەکەی داگیرساند، لەم ماوەیەدا من بێجووڵە لە سەر چرپاکە دانیشتبووم، لەڕاستیدا زۆر ماندوو بووم و نەمدەزانی چی دەقەومێت، سەیرێکی دیوارەکە و سەعاتەکەی کرد و هەڵلەرزی و وتی:

- "وەی؟ هەر ئێستا کارەکەرەکەمان دەگەڕێتەوە!"

تاکە قسەیەک کردی ئەمە بوو، منیش بەم ئامازەیە تێگەیشتم و هەستام، ڕۆیشتە لای پاڵتۆکەی و خۆی وادەرخست کە دەیەوێت لە بەری بکات، بەڵام پاش ماوەیەک وەستان پاڵتۆکەی خستەوە شوێنی خۆی و بەرەو ئاگردانەکە ڕۆیشت، ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو و زیاد لە جاران شڵەژابوو، بۆ ئەوەی ڕۆیشتنەکەم وەک دەرکردن نەبێت، خۆم بە تەمای ڕۆیشتن نیشان دا و پرسیم:

- "باوکتان ئەفسەر بووە؟"
- "بەڵێ، ئێوە چۆن زانیتان؟"
- "نەمدەزانی و لەخۆوە وتم."
- "بەڕاستی سەیرە!"
- بەڵێ، من هەندێ جار لەم هەست و بۆچوونە ڕاستانەم هەیە، هەڵبەت ئەمەش لە بەرەکەتی شێتییەوەیە..."

چاوەکانی بە توندی بەرز کردەوە و هیچی نەوت، هەستم دەکرد ئامادەبوونم وەک ئەشکەنجە وایە بۆ ئەو، ویستم ئەم ئەشکەنجەیە تەواو بکەم و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتم، ئایا ئێستاش نەیدەویست ماچم بکات، یان لانیکەم دەستی بەرەو لای من درێژ بکات؟ چاو و دڵم نیگەرانی ئەم مەسەلە بوو، بەڵام ئەو وەک خۆی بێجووڵە لای ئاگردانەکە وەستابوو. وتی:

"کەواتە ئێوە دەڕۆن؟"

ئاخۆ وەڵامم چی بێت، بێدەنگ و بێتاقەت لە شوێنەکەم وەستام و تەنیا سەیرێکم کرد، ئەی هاوار چۆن هەموو شتێکم تێکدابوو! وەک ئەوەی جیابوونەوە لە منی هیچ بەلاوە گرنگ نییە، لەپڕ هەستم کرد بێچەندوچۆن لە دەستم داوە، ئەگەرچی دەمویست وشەیەک وەک ماڵئاوایی بڵێم، قسەیەک قووڵ و کاریگەر بکەم، کە بتوانم کار لە دەروونی بکەم، بەڵام بڕیارم دا بێباک و لەخۆبایی بم، بەڵام سەرباری ئەم بڕیارە خۆم بە دڵڕەنجاو و نیگەران و شڵەژاو نیشان دا، دیسان دەستم کردەوە بە قسەکردن لەسەر هەموو شتێک و وروژاندنی بابەتی پووچ، قسەکانم وەک شیعر و دێڕسازیی جوانی لێهاتبوو، لێم پرسی بۆچی ئاشکرا و ڕوون پێم ناڵێن لە ماڵەکەم بڕۆ دەرەوە، ئاخر بۆچی؟ پێویستی نەدەکرد شەرم بکات و لەبری ئەوەی بڵێت ئێستا کارەکەر دەگەڕێتەوە، دەیتوانی ڕێکوڕەوان بڵێت ئێستا ئیتر لە بەرچاوم ون بە، چونکە دەمەوێ بڕۆم بە دوای دایکمدا، نامەوێ لە کۆڵان و جادە کەس لەگەڵ ئێوە ببینێت، مەگەر مەیلە دەروونییەکەی ئەمە بوو؟ ئاماژەیەک بەس بوو بۆ من و بیرکردنەوەیم بە باشی دەخوێندەوە، هەر ئەم دەستبردن بۆ پاڵتۆ و دیسانەوە دانانەوەی بابەتەکەی تێگەیاندم، چونکە پێم وتبوو هەمیشە باش بۆ شتەکان دەچم، هەڵبەت ئەم خەسڵەتە سروشتییەش هەمیشە بەرهەمی شێتی نییە...

ئەو بە هەمان شێوەیە مات و بێدەنگ لە جێگەکەی خۆی وەستابوو و بە دەنگی بەرز وتی:

- "ئۆف خوایە! ببورە بۆ ئەو قسەی کردم، ئەم قسەیەم لە دەم دەرچوو."

بەڵام من بە بێباکییەوە درێژەدادڕیم دەکرد، ئەگەرچی دەمزانی یەک وشە لە قسەکانم کاری تێناکات، بەڵکو بێزاریشی دەکات، قسەکانم نەدەبڕییەوە، دەمویست تێی بگەیەنم هەر کەس کە سروشتی هەستیار و وردەکاری هەیە شێت نییە، زۆر لەم کەسانە بچووکترین شتیان لێ دەبێتە شاخێک، ڕەنگە گیانی خۆشیان لەبەر قسەیەکی زبر و توند بخەنە مەترسییەوە، ناڕاستەوخۆ وتم منیش سروشتێکی وەهام هەیە، ڕاستییەکە ئەوەیە کە هەژاری و دەستکورتی هەندێ هەستی بەڕادەیەک لە مندا بەهێز کردووە، کە خۆشمی تەواو ئازار داوە.

بەڵێ باوەڕ بکەن، ئەم هەستیارییە زۆرە هەندێ جار ئازارێکی گەورە و نەبڕاوەم پێ دەچێژێت، بەڕاستی جێی داخە، چونکە هەندێ جاریش سوودی خۆی هەیە و زۆرجار فریام دەکەوێت، مرۆڤی هەژاری ئاقڵ مەسەلەکان وردتر و ناسکتر لە پارەدارێکی زانا تێدەگات، کەسی پڕ دڵەڕاوکێ و نیگەران لەگەڵ هەر هەنگاوێک سەیری چواردەوری دەکات، هەر قسەیەک دەیکات بە گومانەوە هەڵی دەسەنگێنێت، هەمیشە ناچار بە هەوڵ و تەقەلایە و بە ئەرکی خۆی دەزانێت هێزی مێشک و هەستەکانی خۆی بخاتە کار؛ ئەم کەسە زیرەک و هەستیار و دەردەدار و ساردوگەرمچەشتوو پەروەدە دەبێت... دواتر لەبارەی ئەم چەرمەسەرییانەی ئەم جۆرە خەڵکە، لە ژیانیاندا چەشتوویانە قسەم کرد، بەڵام تا زیاتر قسەم دەکرد نیگەرانییەکەی زیاتر دەبوو، بە جۆرێک بەردەوام دەستەکانم لەیەک دەخشاند و بەردەوام دەیوت خوایە! خوایە! ئەگەرچی دەمبینی بەدەستمەوە ئازار دەچێژێت، بەڵام

بەردەوام بووم لە ئازاردانی، دواجار پاش ئەوەی هەموو وتراوەکانم وت، نیگای نائومێدی بەڕاستی کارم لێ دەکات، وتم:

"هەر ئێستا دەڕۆم، مەگەر دەستم نابینێت کە لە سەر دەسکی دەرگاکە دامناوە؟ کەواتە خواحافیز، خواحافیز؛ لە کاتی ڕۆیشتن دووجار خواحافیزیتان لێ دەکەم، تەنانەت داوای بینینەوەی دووبارەی ئێوەم نەکردووە، لانیکەم وەڵام بدەنەوە، دەزانم کە دیداری دووبارەم دەبێتە مایەی ئازار و ئەزیەتی ئێوە، بەڵام لە ئێوە دەپرسم مەگەر خراپەم چییە بۆتان کە بەم جۆرە ئازارم دەدەن و ئۆقرەتان لێ بڕیوم، مەگەر دڕکی بەرپێتان بووم، ئاخر بۆچی ئاوا ڕوو وەردەگێڕن، وەک ئەوەی یەکتریشمان نەناسیبێت؟ ئێوە دواهەمین ڕۆژە خۆشەکانی منتان بە بادا و دەرچەی هیواتان لەسەر داخستم، لە جاران قوڕبەسەرتر و داماوترتان کردم، سوێند بە خوا من شێت نیم، ئەگەر کەمێک بیربکەنەوە خۆشتان لەوە تێدەگەن، من تەواو هۆشیار و ئاقڵم، ئێستا ئیتر واز لەم نازکردنە بهێنن و دەستتان بەرەو لام درێژ بکەن، یان لانیکەم ڕێگە بدەن من دەستپێشخەر بم و بەرەو لای ئێوە بێم، هەڵبەت ئەگەر حەز بکەن! مەترسن، ئازارتان نادەم تەنیا دەمەوێ جارێک، تەنیا جارێک لە بەردەمتاندا بکەومە سەرچۆک، دەتوانم؟ نا، نا ! کە دەبینم دەترسن پەشیمان بوومەوە! ئەمە ناکەم دڵنیابن هیچ ناکەم! بۆ خاتری خوا بۆچی ئەوەندە ترساون؟ خۆ من جووڵە ناکەم و هێمن و سەرکز لە سووچێک وەستام، خۆزکە یەک خولەک هەر لێرە لە سەر تەختی سووری فەڕشەکە لە بەردەمتاندا بکەومە سەر چۆک، بەڵام چاوەکانتان دەڵێت دەترسن و زیرەتان کردووە. هەربۆیە من هێمن لێرە وەستام، مەگەر نەتابینی لە کاتی وتنی داواکەم هەنگاوێکم هەڵنەگرت، ئەو کاتەی ئاماژەم بۆ تەختی سووری فەڕشەکەش کرد لە جێگەکەم نەجووڵام و پەنجەشم بۆ ڕانەکێشا، ئێستا لەبەرئەوەی ترساون لەم کارە پاشگەز دەبمەوە، تەنیا بە چاو سەیری تەختی سووری فەڕشەکە دەکەم و بە ئاماژەی

سەر مەبەستەکەم دەگەیەنم، خۆتان باش دەزانن مەبەستم کام بەشەی فەرشەکەیە، بەڵام ناتانەوێ ڕێگەم بدەن لەوێ بکەومە سەرچۆک، چونکە لە من دەترسن و ناوێرن نزیکم بکەونەوە، پێم وانییە لە دڵەوە بە شێتم بزانن، بەڕاستی وایە؟ بەڵێ جارێک، ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر لە هاویندا شێت بووم، لەوکاتەدا زۆر کارم دەکرد و لەبەرئەوەی هۆشیاریم زۆر پەرت بوو، لە بیرم دەچوو لە کاتی خۆیدا نان بخۆم، هەموو ڕۆژێک ئەمە دووبارە دەبووەوە و لەبیرچوونیش دەستبەردار نەبوو، سوێند بە خوای ئەرزوئاسمان بەڕاستمە، خوای عالەم تەرمەکەم لە ژوورە بخەرە دەرەوە ئەگەر درۆ بکەم! هەموو شێتییەکەم ئەمە بوو کە باسم کرد و ئێستا دەبینن چەند بێویژدانانە حوکمتان لەسەر من داوە، نەوەک وابزانن پارەم نەبوو بۆیە وام دەکرد، من لە ریستۆرانتی "ئینگبێرت" و "گرافسن" زۆر ناسراو و بەڕێزم، هەندێ جار پارەم پێ بوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئاگام لە خۆم نەبوو لە بیرم دەچوو شت بکرم، گوێتان لێمە؟ ئەی بۆچی وەک پەیکەر لای ئاگردانەکە وەستاون و هیچ نالێن؟ ڕەنگە چاوەڕێ بن بچمە دەرەوە...

لەپڕ هاتە لام و دەستی بۆ درێژ کردم، بەڵام من لە دڕدۆنگییەوە سەیریکم کرد، چونکە نەمدەزانی ئەمە لە دڵەوەیە یان بۆ ئەوەی لە شەرم ڕزگاری بێت، ئەوسا دەستی لە دەوری ملم گرێدا و فرمێسک لە چاویدا قەتیس بووبوو. نوقمی تەماشای جوانییەکەی بووم، دەمی هێنایە پێش، جێی باوەڕ نەبوو و بێگومان دەیویست لەخۆبردوویی و فیداکاری بنوێنێت، ڕەنگە بەم جۆرە خۆیم لێ دەرباز بکات، قسەیەکیشی وت کە پێم وابوو ئەمە بوو "سەرباری هەموو ئەمانەش خۆشم دەوێن!" بەڵام وشەکانی هێواش و نارێکوپێک وت، بە جۆرێک باش گوێم لێی نەبوو و ڕەنگە ئەم دێڕەشی نەوتبێت، بەهەرحاڵ لە کاتی وتنی ئەم قسەیە باوەشی پێدا کردم، ماوەیەک قۆڵی لە گەردنم گرێدابوو، دواتر بۆ ئەوەی دەموچاوی بگاتە ئاستی من لە سەر

پەنجەپێی بەرز بووەوە، ماوەیەک بەم جۆرە وەستا، هەموو ترسم ئەوە بوو نەوەک بە ناچاری ئەم کارە بکات و وتم:

"چەند جوانیت ئێستا!"

هەر ئەم قسەیەم کرد و بێدەنگ بووم، دواتر چەند هەنگاوێک هاتمە دواوە و هاتمە دەرەوە و بە تەنیا لە ژوورەکەدا مایەوە.

زستان هاتبوو. زستانێکی شێدار و بێ بەفر، کە وەک شەوێکی تاهەتایی لێڵ و تەماوی بوو. هەفتەیەک دەبوو تەنیا کزەبایەک دەهات و بە درێژایی ڕۆژ لە کۆڵان و شەقامەکاندا چراگازەکان هەڵکرابوون، بەڵام لەبەر تاریکیی هەوا و چڕیی تەم، چاو چاوی نەدەبینی، هەموو دەنگەکان، لە زەنگی ماڵەکانەوە تا زەنگۆڵەی ئەسپوعارەبانەکان و هاتوهاواری خەڵک و سمی ئەسپەکانیش، وەک دەنگێکی کپ لە هەوای قورس و خنکاو و قاندراودا، بەرەو خامۆشی دەچوون.

چەندین هەفتە تێپەڕی و هەوا نەگۆڕا، منیش وەک جاران لە گەڕەکی **واترلاند** دەژیام، چونکە خووم بە میوانخانەی **ئۆنس**ـەوە گرتبوو، سەرباری بێپارەییش دەمتوانی لەوێ بمێنمەوە، ئەگەرچی پارەکەم ماوەی پێشوو تەواو بووبوو، بەڵام سڵم لە مانەوە لەو شوێنەدا نەدەکردەوە، چونکە وەک خەڵکی ئەو ماڵە وابووم، خانمی خاوەنماڵ هێشتا هیچی نەوتبوو، بەڵام خۆم بە دواکەوتنی کرێکە بێتاقەت بووم، سێ هەفتە بەم جۆرە تێپەڕی، بەڵام بە هیچ شێوەیەک نەمدەتوانی هیچ بنووسم، لەگەڵ زەحمەتی شەوانە و جیددییەتی بەردەوام، ئیلهامێک دیار نەبوو و بۆ نووسینی بابەتێک خۆم بێتوانا دەبینی.

لە ژوورێکی نهۆمی یەکەم، کە بە باشترین ژووری میوانخانەکە هەژمار دەکرا، سەرقاڵی کار بووم و دەستوپەنجەم لەگەڵ قەڵەم نەرم دەکرد، لە یەکەم شەوەوە کە پارەم دەستکەوتبوو، توانای

پڕکردنەوەی پێویستییەکانم هەبوو، بێ هیچ نیگەرانییەک لەوێ دەژیام، هەمیشە بەو هیوایەوە بووم وتارێک بنووسم و کرێی ژوورەکە و قەرزەکانی تر بدەمەوە، هەربۆیە زۆر بە قووڵی و هەوڵەوە دەمنووسی، خەریکی نووسینی وتارێک بووم کە پێم وابوو زۆر باش دەردەچێت، ناوی وتارەکە "ئاگرکەوتنەوە لە کتێبخانە" و جۆرێک چیرۆک و خوازە بوو، ناوەڕۆکێکی وردی تێدا بوو و زۆر خەریکی باشکردنی بووم، دەمویست وەک پڕکردنەوەی قیستێک لەو پارەیەی کە **کماندۆر** پێی دابووم، ببەمە لای و تێی بگەیەنم ئەو پارەیەی پێی داوم بەفیڕۆ نەچووە، بەڵکو یارمەتیی کەسێکی داوە کە بەڕاستی خاوەن توانا و خەیاڵە، دڵنیابووم دان بەم بابەتەدا دەنێت، تەنها ئەوەندە بەسە چاوەڕێی هاتنی ئیلهام بم و پێم وانەبوو، کە تەنانەت لە یەکەم ڕۆژی ئامادەییمەوە نەیەت و نەتوانم بنووسم، هیچ لەمپەرێک بۆ کار و نووسین بوونی نەبوو، خاوەنماڵ هەموو ڕۆژێک نانی نیوەڕۆی دەهێنا و بەیانی و شەوانیش چەند نانێکی مرەباییم دەخوارد، تووڕەبوونەکەم تەواو دامرکابووەوە، ئیتر لە کاتی نووسیندا دەستم بە پەڕۆکۆنێک نەدەپێچا، کە لە پەنجەرەکەمەوە لە نهۆمی یەکەمەوە سەیری کۆڵانەکەم دەکرد، سەرم گێژ نەدەبوو، لە هەموو لایەکەوە لە جاران باشتر بووم، پێم سەیربوو بەم حاڵەوە چۆن نەمتوانیوە چیرۆکەکە تەواو بکەم، نەمدەزانی هۆکار چییە.

دواجار ڕۆژێک بەهۆی ڕێکەوتێکەوە زانیم، کە تا چ ڕادەیەک دەروونم کڵۆڵ و زەینم بێفەڕ و بێتوانایە، بەسەرهاتەکە ئەوە بوو کە ڕۆژێک خاوەنماڵ وەسڵێکی بۆ هێنام و تکای کرد بزانم ڕاستە یان نا، چونکە وەک دەیوت هەڵەیەک لە حساباتدا ڕووی داوە، لەگەڵ ئەوەی لە دەفتەری میوانخانەدا نووسراوە یەکنەدەهاتەوە، خۆیشی نەیتوانیبوو کێشەکە بدۆزێتەوە. بەهەرحاڵ، لەکاتێکدا خانمی خاوەنماڵ، لە بەردەمم دانیشتبوو و سەیری دەکردم دەستم بە حسابات کرد، هەر بیست بڕگەکەی وەسڵەکەم جارێک لەسەرەوە تا خوار ژمارد،

ئەنجامی کۆکردنەوەکە ڕاست دەرچوو، دیسان جارێکی تر لە خوارەوە بۆ سەرەوە ژماردم، دیسان ڕاست بوو و سەیرێکی ژنەکەم کرد، ڕێک لە بەردەمم دانیشتبوو و چاوەڕێی دوابۆچوونی من بوو، لەگەڵ ئەمەش سەیرکردنەکەم لە نییەتێکی خراپەوە نەبوو، هەر بە سەیرکردنی یەکەم زانیم دووگیانە و ئەم بابەتە چاوی گرتم.

وتم:

"لە کۆکردنەوەکەدا کێشە نییە."

وتی:

"دەی ئێستا هەر ژمارەیەک بەجیا سەیر بکەن، چونکە دڵنیام کۆی ژمارەکان ئەوەندە ناکات."

دیسان دەستم پێکردەوە و هەر برگەیەکم حساب کردەوە، دوو نان هەر کامیان ٢٥ ئۆرا، بۆریی چرا ١٨ ئۆرا، ٢٠ ئۆنس کەرە ٣٢ ئۆرا، خوێندنەوەی ئەم ژمارانە زیرەکییەکی تایبەتی نەدەویست، ئەم وەسڵە سادەیەی بەقاڵی کۆڵانەکە بە هیچ شێوەیەک ئاڵۆزی تێدا نەبوو، بەڵام هەرچی بە دڵوگیان ویستم هەڵەکە بدۆزمەوە، نەمتوانی، پاش ئەوەی چەند جارێک ژمارەکانم ژێروژوور کرد، بەداخەوە هەستم کرد هەموو ژمارەکان لە مێشکمدا دەخولێنەوە، ئیتر جیاوازییم لە نێوان قەرز و خواستدا نەدەبینی، هەموو شتێکم تێکەڵوپێکەڵ کرد، تا ئەوەی گەیشتمە (٣/٥ شانزەیەم پەنیر پانزە ئۆرا) ئیتر مێشکم لە ئیش کەوت، چاوم لە وشەی پەنیر ڕاما و ئیتر هیچم نەبینی، بەوپەڕی بێهواییەوە وتم:

"مردووی مریێ بۆ ئەم دەستوخەتەی! چەند کۆن و ناشیرینە، ئەگەر بە زەم نەبێت ئێرە تەنیا پێنج شانزەیەم پەنیر نووسراوە، شتی وا چۆن دەبێت؟ وەرن خۆتان سەیری بکەن."

خاوەنماڵ وەڵامی دایەوە:

- "بەڵێ ڕاهاتوون بەم جۆرە بنووسن، ئەم جۆرە پەنیرە هۆڵەندی و توونە، بۆ نا ڕاست نووسراوە! پێنج شانزەیەم دەکاتە پێنج ئۆنس[1]..."

قسەکەم پێ بڕی و وتم:

- "بەڵێ بابەتەکە زۆر باش تێدەگەم، بەڵام بەڕاستی سەری لێ دەرناکەم."

دیسان دەستم کردەوە بە کۆکردنەوە، چەند مانگێک لەمەوپێش لە یەک خولەکدا ئەمەی دەکرد، بەڵام ئێستا بەردەوام هەوڵم دەدا و ئارەقەم دەڕشت، هەموو سەرنجی خۆم خستبووە سەر ئەم ژمارە ئاڵۆزانە، چاوم بە حاڵەتی بیرکردنەوەوە تیژ دەکردەوە، بڕۆم گرژ دەکرد و زۆر بە وردی قووڵ دەبوومەوە.

لە کۆتاییدا ناچار بووم وازی لێ بهێنم، ئەم پێنج ئۆنس پەنیرە تێکی شکاندم! وەک ئەوەی ئەندامێکی ناو کاسەسەرم لەجێ چووبێت، بۆ ئەوەی خۆم وادەربخەم خەریکی ژماردنم، لێوەکانم دەجووڵاند و بە دەنگی بەرز ژمارەیەکم دەوتەوە، چاوم تا کۆتایی کاغەزەکە دەخشاند، وەک ئەوەی زۆری نەمابێت کێشەکە بدۆزمەوە و ئیشەکان باش دەڕوات، خانمی خاونماڵ چاوەڕوان بوو، لە کۆتاییدا وتم:

- "ئێستا هەموو وەسڵەکەم سەیر کرد، تا ئەو شوێنەی تێگەیشتم وادیارە هیچ هەڵەیەکی تیا نییە."
- "هەڵەی تیا نییە؟ کەواتە هەڵەی تیا نەبووا!"

بە دەنگیدا زانیم باوەڕ بە قسەکەم ناکات و قسەکانی بە بێباکیی سەیرەوە کرد، کە تا ئێستا لە ئەودا نەمبینیبوو، تەنانەت هەستم کرد دەیەوێت تانەیەکی سووکم تێ بگرێت، بۆ نموونە وتی ڕانەهاتووم ژمارە کەسرەکان حساب بکەم، دیسان وتییەوە دەبێ بچمە لای کەسێکی شارەزا تا وەسڵەکە باش سەیر بکات، هەڵبەت بە ناخۆشی

---

[1] Once: یەکەیەکی کۆن بۆ کێشانەکردن، کە تا ئێستاش لە زۆربەی وڵاتانی باکوری ئەوروپادا باوە، بەپێی وڵاتە جیاوازەکان ١٢ یان ١٦ ئۆنس، یەک "Livre"ـەیە و هەر "Livre"ـەیەک ٣٠ گرامە. (و.ف)

نەیوت، بە جۆرێک کە بیەوێت خەجاڵەتم بکات، بەڵکو بە شێوەیەکی جددی ئەم قسانەی کرد، ئەوکاتەش نزیک دەرگاکە کەوتەوە و ویستی بڕواتە دەرەوە سەیرێکی کردم و وتی:

"زۆر ببورن لە کاتم گرتن."

ماوەیەکی دواتر دەرگاکەی کردەوە و دیسان هاتە ژوورەوە، بێگومان لە ڕاڕەوەکە دوور نەکەوتۆتەوە، چونکە خێرا گەڕایەوە و وتی:

"ئەوەک ئەم قسەیە بە هەڵە تێبگەن، ویستم بپرسم قەرزێکی بچووکم لای ئێوە نییە؟ ئایا دوێنێ نەبوو بە سێ هەفتە کە هاتنە ئێرە؟ پێم وایە ئەوەندە بێت، خۆتان دەزانن بەم حاڵەی ئێستاوە بەڕێخستنی ئەم هەموو کرێچییە ئاسان نییە، چ جای ئەوەی بمەوێت کرێی دواخراویشم هەبێت و بەداخەوە..."

قسەکەیم بڕی و وتم:

"پێشتر پێم وتن خەریکە نووسینی وتارێکم، هەر لەگەڵ تەواوبوونی وتارەکە کرێکەتان دەدەم، هیچ بێتاقەتی ئەمە نەبن."

وتی:

"ڕاستە، بەڵام وتارەکەی ئێوە خۆ قەت تەواو نابێت..."

وتم:

"بەڕاستی وا بیر دەکەنەوە؟ هیچ دوور نییە سبەی ئیلهامێک بگات، ڕەنگە ئەمشەو، هەر ئەمشەو ڕەنگە خەیاڵم بخرۆشێت و ئەوپەڕی بە نیوسەعات وتارەکە تەواو بکەم، دەبینن کە شێوازی نووسینی من لەگەڵ ئەوانی تر جیاوازە، ناتوانم هەرجارەو لە شوێنێک دابنیشم و هەندێ نووسین فڕێ بدەم، من دەبێ ئەوەندە بوەستم تا هەستەکانم ئامادەی نووسین بێت، کەسیش ناتوانێت بڵێت لە چ ڕۆژ و سەعاتێکدا خەیاڵم دەبزوێت، ئەم کارە دەبێ خۆبەخۆ بکرێت."

خاوەنماڵ لە ژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە، بەڵام بێگومان بۆچوونی لەسەر من درزی تێکەوتبوو، هەر کە لە ژوورەکە تەنیا مامەوە،

یەکسەر لە جێگەکەی دەرپەڕیم و بێهوا دەستم بە قژمدا دەکرد و دەمڕنی.
نەخێر، لەگەڵ هەموو ئەمانەش ڕێگەچارەیەک نەبوو، مێشکم لەناوچوو بوو، ئاخۆ دەبێ ئەوەندە گەمژە بم کە تەنانەت نەتوانم حسابی نرخی پارچەپەنیرێکی هۆڵەندی بکەم؟ ئایا ئەگەر کەسێک بە داماوی خۆی بزانێت، دەتوانێت وێنای ئەوە بکات هەستەکانی لە دەست داوە؟ مەگەر لە کاتی حساباب بەوپەڕی وشارییەوە نەمزانیبوو خانمی خاوەنماڵ دووگیانە؟ هیچ هۆکارێک نەبوو بەم مەسەلەیە بزانم، چونکە پێشتر کەس بۆی باس نەکردبووم و بەکتوپڕی هاتە زەینمەوە، لەوەش زیاتر لە ناوجەرگەی نائومێدی و دڵتەنگی، ئەوکاتەی نوقمی حسابات و ژمارە بووم، گەیشتبوومە ئەو ئەنجامە، ئەی پاساوی ئەمەیان چییە؟ بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتم و سەیری دەرەوەم کرد، پەنجەرەی ژوورەکەم بەسەر کۆڵانی **ولاخدارەکان** دەکرایەوە، چەند منداڵێکی ورد کە جلوبەرگی شڕیان لەبەردابوو، لە ناو کۆڵانەکە کە نەگبەتی لێ دەباری یارییان دەکرد، بوتڵێکی بەتاڵیان دەستاودەست هەڵ دەدا و قاوقیژێکی زۆریان نابووەوە، لەناکاو ئەسپوعارەنەیەک پڕ لە کەلوپەلی ماڵ بەلایاندا تێپەڕی، ڕەنگە ئەم کەلوپەلە هیی خێزانێک بێت، کە ماڵبەدەر کراون و پێش کاتی دیاریکراو ماڵیان گواستۆتەوە، یەکسەر سەرنجم ڕۆیشتە سەر عارەبانەکە و لە ناویدا ئەم شتانەم بینی: کەلوپەلی ژوور و چرپا و چەند دۆلاب و کورسیی سێقاچ، کە بە سوور ڕەنگیان کردبوون، چەند خرتکەوپرتکەیەکی ئاسن، پێویستیی موبەق و کومبار و فەرش، کچێکی منداڵی زۆر ناشیرین بە لووتێکی چڵمنەوە لە سەر بارەکە دانیشتووە، لە ترسی ئەوەی نەوەک بکەوێتە خوار بە دەستە لاوازەکانی، کە بەهۆی سەرماوە مۆر ببووەوە، عارەبانەکەی گرتبوو، لە سەر چەند بەتانییەکی پیسی شێدار لەگەڵ چەند منداڵێکی تر پاڵ کەوتبوو، سەیری خوارەوەی دەکرد و چاوی بڕیبووە ئەو منداڵانەی

که بوتڵی بەتاڵیان بۆ یەکتر هەڵدەدا... منیش سەیری ئەم دیمەنەم دەکرد و بە ئاسانی وردەکارییەکانم لە زەینمدا دەپاراست، لەم کاتەدا که سەیری دەرەوەم دەکرد، گوێم لە دەنگی کارەکەری میوانخانەکە بوو، کە لە موبەقی تەنیشت ژوورەکەم گۆرانی دەوت، گورانییەکەم لەبەر بوو، بە وردی گوێم گرتبوو بزانم بە هەڵە دەیلێت یان نا، بە خۆم دەوت شکور ئەقڵم سەلامەتە، چونکە ئینسانی گێل و حەپۆل ئەم شتانە نابینێت و وا بیر ناکاتەوە.

لەناکاو لە خوارەوە لە ناو کۆڵانەکە، دوان لە کورێژگەکان پەلاماری یەکتر دەدەن، یەکێکیانم کە کوڕی خاوەنماڵ بوو دەناسی، پەنجەرەکە دەکەمەوە بۆ ئەوەی گوێم لە قسەکانیان بێت، یەکسەر هەندێ منداڵ لە خوارەوەی پەنجەرەکەم کۆ دەبنەوە، بە چاوی حەسرەتاوییەوە سەیری سەرەوە دەکەن، نازانم چاوەڕێی چی بوون، ڕەنگە بیانەوێ شتێک بۆ نموونە گوڵیکی سیس یان پارچەئێسقانێک یان قنەجگەرەیەک، شتێک کە بۆ خواردن بشێت یان بۆ یاریکردن بێت، لە سەرەوە بۆیان هەڵبدەن، بەو هیوایەوە بە دەموچاوی وا، کە لەتاو سەرما شین ببوونەوە، زەقزەق سەیری پەنجەرەکەیان دەکردم، بەڵام ئەو دوو منداڵەی تر وەک دوو دوژمن هێشتا خەریکی جنێوبارانکردنی یەکترن.

منداڵەکان دەمیان بە وشە و قسەی ناشیرین پیس دەبێت، قسەی ناخۆشی لەشفرۆشەکان و جنێوی مەلەوانەکان، کە ڕەنگە لە حەماڵەکانی بەندەرگاوە فێربوون، بێباکانە ڕەوانەی یەکتر دەکەن، لەم کاتەدا خانمی خاوەنماڵ بۆ ئەوەی بزانێت چی بووە دێتە دەرەوە و دەڕواتە لایان، بەڵام منداڵەکان بە جۆرێک خەریکی شەڕی دەستەویەخەن کە ئاگایان لە هاتنی نییە، بەڵام دوای ئەوەی دێنەوە هۆش خۆیان، کوڕی خاوەنماڵەکە بە دایکی دەڵێت:

"بەڵێ یەکەم جار ئەو قوڕگی گرتم!"

ماوەیەک هەناسەم سوار دەبێت و زۆری نەمابوو بخنێکم، دواتر دایکەکە بەرەو منداڵە زاڵم و دڵڕەقەکە، کە لەژێر لێوەوە پێدەکەنێت، دەگەڕێتەوە و بە تووڕەییەوە هاوار دەکات:

- "ون بە لە بەرچاوم گوێرەکەی خوێڕی! ئەم سواڵکەرە برسییە چۆن شەرم ناکات پەلاماری ماڵی خەڵکی دەدات! سەگباب هەر ئێستا دێم..."

دواتر ئەم ژنە دووگیانە بە ورگی دەرپەڕیو، کە هەموو کۆڵانەکەی گرتۆتەوە، کوڕە دەساڵانەکە دەگرێت و دەستی ڕادەکێشێت و دەڵێت:

- "بێدەنگ، وس! وابزانم هێشتا جنێو دەدەی، ئەوەندە بێشەرم و دەمپیسی دەڵێی ئەو هەموو ساڵە لە قەحبەخانە گەورە بووی، بەسە ئیتر بگەڕێوە بۆ ماڵی خۆتان!"

کوڕەکە دەڵێت:

- "نا، نامەوێ بڕۆم."

دایکەکەش دیسان دەڵێت:

- "نەخێر دەبێ بڕۆیت!"

لە پەنجەرەکەمەوە بە باشی دەبینم، کە خانمی خاوەنماڵ وردەوردە تووڕەتر دەبێت، منیش کە ئەم دیمەنە شەرمەزارییە دەبینم، زۆر تووڕە بووم و تاقەتم نەماوە بەسەر منداڵەکەدا هاوار دەکەم، یەک دەقە وەرە سەرەوە بۆ لای من و بۆ ئەوەی منداڵەکان بترسێنم و بەزمەکە ببڕێنمەوە، دیسان بە تووڕەیی بەسەریاندا دەقیڕێنم، جاری دووەم بە جۆرێک وەها بەرز هاوار دەکەم، کە دایکی منداڵەکەش حەپەساو و واقوڕماو ئاوڕ دەداتەوە، یەکسەر خۆی کۆ دەکاتەوە و بێشەرمانە سەیرێکم دەکات و بە دەنگی بەرز بە جۆرێک منیش گوێم لێ بێت، کوڕەکەی ئامۆژگاری و سەرکۆنە دەکات و دەڵێت:

- "ناشیرینە! شەرم ناکەی هەموو خەڵک بزانن چەند شەڕانیت!"

هەموو ئەم دیمەنەم بە وردی دەبینی، تەنانەت وردەکارییەکانیشی لە خەیاڵمدا لانەدەچوو، ئەوپەڕی هۆشیار و وریا بووم، بچووکترین

شتەکانم بە وردەکارییەکی تایبەتەوە لە یادەوەریمدا دەپاراست، بۆ هەر شتێک کە دەقەوما وێنا و بیرکردنەوەم هەبوو، بەم جۆرە مەحاڵە شتێک لە مێشکمدا تێکچوو‌بێت، چۆن دەکرێ ئەقڵم لە دەست دابێت! دواتر قسەم بە خۆم وت و وتم گوێت بکەرەوە، زۆر دەمێکە خەریکی ئەقڵتی و لەبەر ئەقڵت خەم و خەفەت دەخۆی، ئێستا کاتییەتی واز لەم خەیاڵ و بیرکردنەوە پووچانە بهێنی.

ئایا بینین و هەڵێنجانی ئەم هەموو شتانە، سەرنجدان لەم هەموو وردەکارییانە نیشانەی شێتییە؟ بەڕاستی حاڵی تۆ جێی پێکەنینە و کەمکەم خەریکە دەبێتە گاڵتەجاڕ، بۆ هەموو کەسێک ڕێی تێدەچێت نەتوانێت سادەترین کێشەکان چارەسەر بکات و مێشکی لە چالاکی بکەوێت، ئەمە ڕێکەوتێکی ڕووتە و نابێ بە هیچی تر لێکی بدەیتەوە، دیسان دووبارەی دەکەمەوە زۆری نەماوە کە بەڕاستی پێت پێبکەنم! کارامەترین ژمێریارەکانیش، ڕەنگە لە کاتی حساباتی بەقاڵی کۆلانەکە، یان باشتر بڵێم لە ئەژمارکردنی ئەم پەنیرە قوڕەدا گیر بخۆن و نەتوانن حسابەکە لێک بدەنەوە، لەڕاستیدا هەر ئەم پەنیرە ناچیزەی کە مێخەک و بیبەریان تێکەڵ کردووە، تەنیا بە بۆنکردنی دڵت تێکەڵ دێت، ڕەنگە تووشی بەلایەکی گەورت بکات، من خۆم بەڕاستی بەم پەنیرە تیژ و بۆندارە دڵم تێکەڵ هات... ئاخر شتێک بخەنە بەردەمم، ئینسان بتوانێت بیخوات!

لانیکەم ئەگەر پێنج شانزەیەم کەرەی نایابیان بخستایەتە بەردەمم کێشە نەبوو، بە جووڵە و ڕەفتاری خۆم پێکەنینم دێت، بینیم بەڕاستی قسەم خۆش بووە، لەڕاستیدا مێشکم هیچ کێشەی تیا نەبوو، بەتەواوی هۆشیار و ئاقڵ بووم، لە ژوورەکەم هەنگاوم دەنا و قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد، بەرەبەرە خۆشحاڵتر دەبووم، قاقام لێ دەدا، شێتانە دڵخۆش و کەیفساز بووم، وەک ئەوەی بەڕاستی پێویستم بەم ساتە دڵخۆشییە، کە ڕۆحمی لە خەم خاڵی دەکردەوە هەبوو، ڕەنگە هەر ئەمەش ببێتە هۆی ئەوەی مێشکی لەکارکەوتووم دەست بە کار

بکاتەوە، دواتر بە مەبەستی نووسینی چیرۆکەکە لە پشت مێزەکەوە دانیشتم، زۆر باش بووم و پاش ماوەیەکی زۆر هاتبوومەوە سەر زەوق، هەڵبەت خەیاڵم بەمزووانە نەدەکەوتەوە ئیش، بەڵام هەستم دەکرد هەرچی بنووسم، ئەگەر کورت و ئاساییش بێت زۆر نایاب و بێ کێشە دەردەچێت، هەربۆیە یەک سەعاتی بەردەوام بێهەستکردن بە ماندوویی نووسیم، ئێستا ڕێک گەیشتبوومە شوێنە هەستیارەکەی چیرۆکەکە، واتە بابەتی سووتانی کتێبخانەکە، ئەم خاڵە بەڕادەیەک بەلامەوە گرنگ بوو، کە بە هیچ شێوەیەک بەراورد نەدەکرا بەو شتانەی کە نووسیبووم، دەمویست بیرکردنەوە قووڵەکە بخەمەڕوو، کە ئەمە کتێب نەبوو کە دەسووتا، بەڵکو مێشکی پیاوە گەورە و زاناکان بوو کە بڵێسەی ئاگر هەڵی دەلووشی، دەمویست بە وێناکردنی ئەم مێشکە گڕگرتووانە، وێنەی سێن بارتێلمیی-ەکی[1] ڕاستەقینە لە بەرچاوی خوێنەرەکان زیندوو بکەمەوە... لەم کاتەدا لەناکاو دەرگا کرایەوە و خانمی خاوەنماڵ وەک کارەبا هاتە ژوورەوە، بێ ئەوەی هەڵوەستەیەک بکات بێ پێشەکی تا ناوەڕاستی ژوورەکە هاتە ناوەوە، هاوارێکی بەرزم کرد، وەک ئەوەی زەبرێکی نائاساییم بەرکەوتبێت. وتی:

- "بەڵێ؟ وام زانی شتێکتان وت؟ ڕاستییەکەی موسافیرێک هاتووە و ناچارین ژوورەکەی ئێوەی بۆ چۆڵ بکەین، ئێوە ئەمشەو وەرنە خوارەوە و لای خۆمان بخەون، کێشە نییە و جێخەوێکتان بۆ ڕێک دەخەین."

چاوەڕێی وەڵامی نەکرد و یەکسەر دەستی کرد بە دەستەکردن و ڕێکخستنی ئەو کاغەزانەی لە سەر مێزەکە بوون و تێکی دان،

---

[1] ئاماژەیە بۆ ڕووداوێکی خوێناوی بە ناوی (Saint-Bartelmy)، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە پرۆتستانەکانی پاریس و شوێنەکانی دیکەی فەرەنسا کۆمەڵکوژ کران، ئەم کوشتارە ترسناکە لە شەوی ٢٣ی ئووتی ١٥٧٢ بە فەرمانی شارلی نۆیەم، پاشای فەرەنسا ئەنجام درا. (و.ف)

خۆشحاڵیی پێشووم بە تەواوی لەناو چوو، یەکسەر بێهیوا و تورە لە جێگە هەستام و وازم لە ژنەکە هێنا مێزەکە پاک بکاتەوە، هیچ قسەم نەکرد و کاغەزەکانی دایە دەست خۆم، چار نەبوو جگە لە چۆڵکردنی ژوورەکە، ئەم ساتە گرنگ و گرانبەهایەش بەفیڕۆ چوو و نەما.

میوانە تازەکەشم کە کە گەنجیک بوو، لە سەر پلیکانەکان بینی، لەسەر دەستی دوو لەنگەری گەورەی کەشتی بە ڕەنگی شین کوتابوو، بەدوایدا حەماڵێک بە سندووقێکی دەریاییەوە دەهاتنە سەرەوە، وادیارە ئەم موسافیرە سەیرە دەریاوان بوو، دەکرا هەست بەوە بکەیت کە بەرێکەوت ڕێی کەوتۆتە ئێرە، میوانێکی یەکشەوەیە و بێگومان ماوەیەکی زۆر ژوورەکەم لێ داگیر ناکات، کێ چووزانێت ئەگەر سبەی بڕوات، دیسان هەمان دڵخۆشیی ئەمڕۆم بۆ ناگەڕێتەوە، تەنیا پێنج خولەکی ترم دەویست تا چیرۆکی ئاگرکەوتنەوەکە بگەیەنمە کۆتایی، وادیارە چار نەبوو جگە لەوەی مل بۆ چارەنووس بدەم.

تا ئەوکات نەڕۆیشتبوومە ماڵی خاوەنماڵ و خێزانەکەی، هەڵبەت ناتوانم بڵێم ماڵ، چونکە شوێنی ژیانی ئەوان ژوورێکی تایبەت بوو، کە هەموو ماڵەکە، ژنومێرد و باوکی ژنەکە و چوار منداڵ، شەووڕۆژ لەوێ دەژیان، تەنیا خزمەتکارەکە لە موبەقەکە دادەنیشت و شەوانیش هەر لەوێ دەخەوت.

بەهەرحاڵ بەوپەڕی بێزارییەوە لە ژوورەکە نزیک کەوتمەوە و لە دەرگام دا، وەڵام نەبوو، بەڵام دەنگی قسە لە ناو ژوورەکەوە دەهات، کە چوومە ژوورەوە پیاوەکە نە هیچی وت و نە وەڵامی سڵاوەکەشی دامەوە، تەنیا بە بێباکییەکی تایبەتەوە سەیری کردم، وەک ئەوەی بوون و نەبوونم لای ئەو هیچ بێت، هەروەها لەگەڵ کەسێک کە پێشتر لە قەراغ دەریا بینیبووم، خەریکی یاریی کاغەز بوو.

ئەم پیاوە دەلاڵیکی گەڕۆک بوو و بە بۆری چرا بانگیان دەکرد، لە سووچێک ساوایەکی شیرەخۆر لە جێگەیەک ڕاکشابوو و قیژەقیژی دەکرد، پیرەپیاوێکیش کە باوکی خانمی خاوەنماڵ بوو وەک ئەوەی

سینگ یان سکی ئازاری هەبێت نوشتابووەوە، بە گرمۆڵەیی لە سەر کورسییەکی بێشکەیی دانیشتبوو و سەری خستبووە بەینی دەستەکانییەوە، وەک مارێک کە گوێی لە دەنگێک گرتبێت فیشکەی دەهات و خۆی لوول دەکرد.

ڕووم لە مێردی خاوەنماڵەکە کرد و وتم:

- "بەداخەوە ئەمشەو هاتووم شوێنێکم بۆ دابین بکەن."
- "ژنەکەم وتوویەتی؟"
- "بەڵێ، چونکە میوانێکی تازەیان هێناوەتە ژوورەکەم."

پیاوەکە گرنگیی بە وەڵامەکەم نەدا و دیسانەوە خۆی بە یاریی کاغەزەوە خەریک کرد، ئیشی هەموو ڕۆژێکی ئەوە بوو لەگەڵ ئەوانەی دێنە ماڵەکەی یاری بکات، هەڵبەت قوماری نەدەکرد و زیاتر بۆ کاتبەسەربردن و بۆ ئەوەی هاوڕێکەشی بێتاقەت نەبێت، ئەمەی دەکرد، بەگشتی بەدرێژایی ڕۆژ هیچی نەدەکرد و ئەگەر هەر کات ئەندامە تەمبەڵەکانی بیانتوانیایە جووڵەیەکی دەکرد، لە کاتێکدا ژنەکە بەردەوام بە پلیکانەکاندا هاتوچۆی دەکرد و چەپوڕاست ئاگای لە هەموو شتێک بوو، وریا بوو مشتەرییەکی تازە بخاتە تۆڕەکەیەوە، لەگەڵ هەموو کرێکارەکانی بەندەرگا سەروسەودای هەبوو، بۆ هەر میوانێک کە دەیانهێنا شتێکی پێدەدان، هەندێ شەویش خۆیانی لە ئوتێل دەخەواند، بۆ نموونە ئەمڕۆ **بۆری چرا** ئەم میوانە تازەیەی بۆ هێنابوو.

لەم کاتەدا دوان لە منداڵەکانی هاتن، دوو کچی بچکۆلە بوون بە دەموچاوی باریک و شلەوە، کە ڕێک لە منالانی گەڕەک دەچوون، جلوبەرگی نیوەڕووت و شڕیان بە جەستەوە هەڵواسیبوو، ماوەیەک دواتر خانمی میوانخانەکە خۆیشی هاتە ژوورەوە و لێم پرسی شەو لە کوێ جێگەم بۆ ڕادەخات، بە کورتی وەڵامی دامەوە ئەگەر بمەوێت دەتوانم هەر لێرە لەگەڵ ئەوانی تر ڕۆژ بکەمەوە، یان ئەوەی لە سەر کورسییە بێشکەییەکە بخەوم، هەڵبەت پەیوەندیی بە مەیلی خۆشمەوە

هەیە، بەدەم وەڵامــــــدانەوەی مــــــنەوە بە ژوورەکەدا دەگەڕا و کەلوپەلەکـانی ڕێـک دەکـردەوە، تەنـانەت سەیریشکیشـی نەکـردم، لە وەڵامەکەی حەپەسـا بـووم و خـۆم بچـووک کـردەوە و لای دەرگـاکە وەستام، خۆم وادەرخست بە بەخشینی ژوورەکەم بۆ کەسێکی تر بۆ شەوێک ناڕازی نیم، دواتر لە ترسی ئەوەی نەوەک لێم بێزار بێت و لە میوانخـــانەکە دەرم بکـــات، بە ئەنقســـەت خـــۆم بە خزمەتکـــار و میهرەبان دەرخست و وتم:

"ئای خۆ ئەوەندەش گرنگ نییە، ئەخیرەن بە شێوەیەک چارەسـەری دەکەین!"

ئیتر بێدەنگ بووم، ئەو بەدەم گەڕان بە ژوورەکەدا سەرەتا وتی:

"جگە لەوەش دەبێ بزانن مـن پێم ناکرێت خـواردن و مـاڵی قەرز بە خەڵکی بدەم، پێم وایە پێشتر ئەمەم پێ وتوون."

وتم:

"هەڵـبەتە ڕاســت دەفەرمــوون، بەڵام چەنـد ڕۆژێکـی تـر دەرەفەتــم پێویســتە کە وتــارەکەم تەواو بێــت، دواتــر جــگە لە قەرزەکە پێــنج کرۆنیش بە زیادە و منەتەوە دەخەمە خزمەتتان."

بە شێوە و دەموچاویدا زانیم زۆر بـاوەڕی بە وتـارەکەی مـن نییە و بـاوەڕ بە تەواوبـوونی ناکـات، بەڵام بـاش نەبـوو خـۆم بە دڵڕەنجـاو و بێتـاقەت نیشـان بـدەم، لەبەر ئـازارێکی ڕاگـوزەر میوانخـانەکە بەجـێ بهێڵم، چونکە باش دەمزانی ئەگەر وابکەم وەزعم چۆن دەبێت.

چەنـد ڕۆژێـک بەمجـۆرە تێپەڕی، مـن لەخـوارەوە لەگەڵ خێـزانەکە دەژیـام، لەبەرئەوەی ژووره بچـوکەکەی پێشـــوە زۆپـای نەبــوو و هەواکەشـــی زۆر ســـارد بـــوو، شـــەوان هەر لەوێ لە ســـەر ئەرزەکە دەخەوم و دەریاوانە نەناسەکەش لە ژوورەکەمدا دەژیا، بەمزووانەش بە تەما نەبوو چۆڵی بکات، نیوەڕۆ خانمی خاوەنماڵ وتی:

- "تەنانەت کرێی مانگێکی پێشەکی داوە، چونکە پێش سەفەری دەریا دەیەوێت خولێک بخوێنێت و تاقیکردنەوەی کاپتنی بکات، هەربۆیە لە شاردا ماوەتەوە."

بەم هەواڵە زانیم کە دەبێ ئاو بێنم و دەست بشۆم، هەستم کرد ئیتر ژوورەکەم لە دەست داوە، یەکسەر ڕۆیشتمە ژوورە بچووکەکە و دانیشتم، ئەگەر بڕیار بێت شتێک بنووسم شوێنەکەی هەر ئەم ژوورە هێمن و چۆڵەیە، ئێستا ئیتر بابەتی چیرۆکەکە زۆر مێشکی سەرقاڵ نەدەکردم، بەڵکو بیرۆکەیەکی زۆر نایابم بۆ هاتبوو لەبارەی نووسینی شانۆنامەیەکی یەک پەردەیی، بە ناوی **نیشانی گاچ** کە پەیوەندیی بە سەدە ناوەڕاستەکانەوە هەبوو، تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری سەرەکیم تەواو دروست کردبوو، ئەم کاراکتەرە لەشفرۆشێکی عەیار و فریودەر بوو، کە نەک بەهۆی چێژ و لاوازی، بەڵکو بەهۆی دژایەتی خواوە لە ناو پەرستگایەک گوناهی کردبوو، بەو مانایەی کە لەسەر بەرماڵ و ڕوو لە میحراب ئەوەی لێ وەشابووەوە، مەبەستیشی تەنیا ئەو چێژە بێوێنەیە بوو کە لە سوکایەتیکردن بە خوا دەیبرد.

تا کات تێدەپەڕی ئەم کەسە وەهماوییە زیاتر لە بەرچاوم زیندووتر دەبوو، تا ئەو شوێنەی کە دواجار وەک بوونەوەرێکی ڕاستەقینە هەر بەوجۆرەی کە دمویست دەهاتە بەرچاوم، ئەم ژنە لەشفرۆشە بالابەرز و گەنمڕەنگ و باریکە کە ڕووخسارێکی گلاو و نەفرەتاوی هەبوو، هەر هەنگاوێکی هەڵدەگرت پووزە درێژەکەی لە دزری تەنوورەکەیەوە دەردەکەوت، بوونەوەرێکی وەها بێگومان دەبێ گوێچکەی گەورە و دەپەڕیوی هەبێت، بە کورتی نەک هەر چاو ئەزێت بدات، بەڵکو دەبێ بەرگەری بینینیشی نەگرین، بەهەرحاڵ ڕەهەندە سەرنجڕاکێشەکەی بێحەیاییە سەیرەکەی بوو، ئەم بوونەوەرە دێز و تۆقێنەرە بەسەر خەیاڵمدا زاڵ بووبوو، زەینمی تەواو بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. دوو سەعاتە خەریکی نووسینی

ئەم شـــانۆنامەیەم، بـێ ئەوەی قەڵەم لە ســـەر کـاغەز هەڵگـرم، دوا ڕەشکردنەوە دە یان دوانزە لاپەڕەم، کە هەندێجار بە زەحمەتی زۆر و هەندێجار بە وردبوونەوەی زۆر دەمنووسی، هەروەها ناوبەناویش کاغەزێکم لەخۆڕا ڕەش دەکردەوە و دەمدڕاند، هەستم بە ماندوویی دەکرد و سەرما گیانمی ڕەق و وشک کردبووەوە، سەرباری ئەوەش، لە نیوسـەعاتی پێشـووەوە منداڵەکەی ژووری تەنیشـت هـاواری لـێ بەرز ببووەوە و تەواو بێتاقەتی دەکردم، هەستم کرد لەمە زیاتر هیچ نانووسـرێت و هەسـتام و ڕۆیشـتمە دەرەوە، پیاسـەیەکی درێـژم بە دەوروبەری شـەقامی **درامن**دا کرد، تـا درەنگانی شـەو لەوێ بـووم، بەدەم ڕێگاوە بیرم دەکردەوە چۆن درێـژە بە شـانۆنامەکە بـدەم و بینووسـم، پێش گەڕانەوە بۆ مـاڵیش شـتێک ڕووی دا، لە خـوارەوەی شەقامی **کارل یۆهان** و نزیک شەقامی **ئاسنەڕێ**، لە بەردەم دووکانی پینەچییەکـدا وەسـتابووم، نـازانم بـۆچی لەخـۆمەوە لەوێ وەسـتام، بیرکــردنەوەم لە دنیـــایەکی دوور و پەرت بــوو، غافـڵ لەوەی کە پێویسـتییەکی زۆرم بە جووتێـک پـێڵاو هەبـوو سـەیری جامخـانەی دووکـانەکەم دەکـرد، کۆمەڵێک لە پشـتمەوە بەدەم قسـەوە تێپەڕین و یەک وشە لە قسـەکانیان حاڵی نەبووم، لەپڕ دەنگێکی بەرز بەرگوێم کەوت:

"شەوباش."

**یوومفرو** بـوو، وەڵامی سـڵاوەکەیم دایەوە، بەڵام بە جۆرێک بێئاگـا بووم، کە بۆ ناسینەوەی ناچار بووم ماوەیەک سەیری بکەم. پرسی:

"ئێ دەنگوباست چۆنە؟"

وتم:

"خراپ نییم... وەک هەمیشە."

دیسان پرسی:

"ئێستاش لای **کریستی** کار دەکەی؟"

وتم:

- "له مەبەستت تیناگەم کریستی کێیە؟"
- "پێم وایە جارێک وتت لە بازرگانخانەی کریستی سکرتێریت؟"
- "ئەها، بیرم کەوتەوە، بەڵام تەواو بوو، چونکە ئیشکردن لەگەڵ ئەو پیاوە زەحمەتە و هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە بابەتەکە لەخۆیەوە هەڵوەشایەوە."

پرسی:

- "باشە هۆکارەکەی چی بوو؟"
- "شتێکی گرنگ نەبوو؛ جارێک هەڵەیەک لە نووسیندا دروست بوو کە هۆکارەکەشی (زویریی) من بوو و دوای ئەوەش..."

پرسیاری کرد؛

- "وتت (تەزویر؟) یانی تۆ تەزویرت کردووە؟"

بەوپەڕی بێشەرمییەوە لە منی دەپرسی بەڵگەنامەم تەزویر کردووە، تەنانەت بەڕادەیەک حەزی لەم بابەتە بوو کە یەک لەسەر یەک قسەی لێ دەردەهێنام، ئەگەرچی زۆر بێتاقەت بووبووم لە وەڵامدا هیچم نەوت و دواتریش وەک دڵنەواییەک وتی:

- "دەی گوێی مەدەرێ! هەڵبەت هەموو پیاوێکی بێوەییش ڕەنگە ئەم شتانە بەرۆکی بگرێت، دیسان وای دەزانی بەڕاستی تەزویرم کردووە."

پرسیم:

- "مەبەستت لەوەی وتت "دەی گوێی مەدەرێ! هەڵبەت هەموو پیاوێکی بێوەییش ڕەنگە ئەم شتانە بەرۆکی بگرێت" چییە؟ ڕەنگە مەبەستت تەزویر بێت؟ کەواتە بە قوربان یەکەمجار باش گوێ بگرە، باوەڕ دەکەی منێک کە ئێستا لە بەردەمت وەستاوم شتی وام لێ وەشابێتەوە، کەس نا، من؟"

وتی:

- "ئاخر ئەزیزم بەم دوو گوێچکەیەی خۆم گوێم لێ بوو وتت..."

پشتم تێکرد و سەیری شەقامەکەم کرد، لەپڕ تەنوورەسوورێکم بینی کە نزیک دەکەوتەوە، کە باش ورد بوومەوە ژنێکم بینی کە لەگەڵ پیاوێک دێت، ئەگەر لەو کاتەدا **یوومفروم** نەدیبایە و قسەم لەگەڵ نەکردایە، ئەگەر گومانە قۆڕەکەی منی نەحەپەساندایە و سەرم وەرنەگێڕایە بەرەو شەقامەکە، بێگومان لە بینینی ئەم تەنوورەسووورە بێبەش دەبووم، ئێستا جا سوودی چییە! گریمان تەنوورەی خاتوو **ناگل** کارەکەری شازادەش بێت، بینینی کەڵکی چییە بۆ من؟

**یوومفرو**، دیسان لە بناگوێمدا قسەی دەکرد و بەتەما بوو گومان و سوکایەتییەی خۆی بڕەوێنێتەوە، بەڵام من هەر گوێم لێ نەدەگرت و چاوم لەسەر تەنوورەسوورەکە بوو، کە لە شەقامەکەوە دەهاتە پێشەوە، کزەیەکی نەرم و ڕاگوزەر کە هیی شڵەژان بوو، کەوتە دڵمەوە، وەک ئەوەی نووکی دەرزییەک چەقیبێتە دڵمەوە، بێ ئەوەی دڵ بجووڵێنم لە دڵەوە ناوی **ئیلایالی**م هێنا، لەم کاتەدا دیلاق پووریش گەڕایەوە، ئەو ژنوپیاوەی بینی و بە ئاماژەی چاو سڵاوێکی لێکردن، بەڵام من تێنەگەیشتم سڵاوی کردووە یان نا، دواتر تەنوورەسوور بەرەو سەرەوەی شەقامی کارل یۆهان ڕۆیشت و لە بەرچاو دیار نەما. **یوومفرو** پرسی:

"ئەوە کێ بوو لەگەڵ ئەو ژنە؟"

وەڵامم دایەوە:

"مەگەر نەتبینی **شازادە** بوو؟ ئەوەی کە ناویان ناوە **شازادە**، ژنەکە دەناسی؟"

"تارادەیەک دەیناسم، مەگەر تۆ نایناسی؟

"نەء."

"وام زانی لە بەرخۆتەوە سڵاوت لێکرد."

"چۆن، یانی من سڵاوم لێکرد؟"

"باش بیر بکەرەوە ڕەنگە سڵاوت کردبێت، زۆر سەیرە چونکە هەموو ئەو ماوەیە سەیری تۆی دەکرد."

- "تۆ چۆن دەیناسی؟"

ڕوونی کردەوە لەڕاستیدا وەکو خۆم نایناسم، بەڵکو بینینی ئەم ژنە یادەوەریی شەوێکی پاییزی ڕابردووی بیرهێناوەتەوە، مەسەلەکە ئەمەیە: درەنگانی یەکێک لە شەوەکانی پاییز، ئەو و دوو گەنجی سەرسەری و سەرخۆشی تر، ڕێک ئەوکاتەی لە گراند ئوتێل دەهاتنە دەرەوە، لەگەڵ ئەم خانمە کە تاکوتەنیا لای کتێبخانەی کامرمێر پیاسەی دەکرد قسەیان دامەزراندبوو، ژنەکە سەرەتا ئەوانی ڕەتکردبووەوە، بەڵام یەکێک لە هاوڕێکانیان کە گەنجێکی بوێر و قۆز و بێباک بوو و لە هیچ نەدەترسا، بەوپەڕی بێشەرمییەوە داوای لێکردبوو تا ماڵەوە لەگەڵی بڕوات، سوێندی خواردبوو تەنانەت دەستیش بەسەریدا نەهێنێت، سەلامەت و بێکێشە بیگەیەنێتە بەردەم ماڵەکەی، چونکە دەیویست دڵنیا بێت بێ هیچ کێشەیەک دەگاتەوە بەردەم ماڵەکەی، دەنا هەموو ئەو شەوە خەو ناچێتە چاوی، بەدەم ڕێوە یەک لەسەر یەک قسەی ڕێز دەکرد و درۆی دەڕیسا، بۆ نموونە دەیوت ناوی والدیمار ئاترداگە و پیشەکەی فۆتۆگرافییە، لە کۆتاییدا ژنەکەش لەگەڵ گەنجە سووکەسەرەکە سەرباری ڕەتکردنەوەش کۆڵی نەدابوو، ڕووی گەشابووەوە و تا ماڵەوەش قسەی لەگەڵ کردبوو.

کە چیرۆکەکە گەیشتە ئێرە هەناسەم لە سینگمدا قەپات کرد و پرسیم:

- "ئێ، ئەخیرەن گەیشتە چی؟"
- "حەیفت نەکرد، بۆ بە تەمای چی بووی، خراپ بیرمەکەرەوە چونکە ژنەکە کەسێکی بەڕێز بوو."

دواتر هەردووکمان ماوەیەک بێدەنگ بووین و دواتر بە حاڵەتێکی بیرکردنەوەوە وتی:

- "ئای کەواتە وتت ئەم کابرایە شازادە بوو؟"
- "بەڵێ، وادیارە خۆی بوو، ئێستا کە ئەم ژنە لەگەڵ ئەو پیاوە دەبینم بیرکردنەوەم لەسەری دەگۆڕێت."

من بێدەنگ بووم، بەڵێ ئێستا، هەر ئێستا شازادە خەریکییەتی، گریمان واشی بکردایە بۆچی بەلای منەوە گرنگە؟ من دەستم لە خۆی و جوانییەکەشی شۆردبوو، بەتەواویش دەستم لێ هەڵگرتبوو! خراپترین شتم لە خەیاڵمدا دەخستە پاڵ ئەم ژنە، هەوڵم دەدا خۆم هێمن بکەمەوە و بەوەی لە بیرکردنەوەمدا سووکی بکەم، چێژم وەردەگرت، تەنها شتێک ئازاری دەدام و ئەوەش ئەوە بوو کە بۆچی سڵاوم لێکردبوون، گریمان واشم کردبێت! بۆچی دەبێ کڵاوەکەم وەک ڕێزێک بۆ ئەم کەسانە لەسەر هەڵبگرم؟ هیچ خەفەتم بۆ ژنەکە نەدەخوارد چونکە بە هیچ شێوەیەک بەلامەوە جوان نەبوو، بەڵکو تەواو داچەکیو و ناشیرینیش بووبوو، سەیریش نەبوو کە هەر سەیری منی کردبێت، ڕەنگە کەمکەم هەستی بە پەشیمانی کردبێت، بەڵام ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت پێویستی نەدەکرد وەک گێلەکان بکەومە بەرقاچی و بۆی بنووشتێمەوە، بەتایبەتی لەبەرئەوەی ئەم دواییانە تەواو ناشیرین و ترشاو دەردەکەوت و جێبەزەیی بوو، بە کورتی پێشکەش بە شازادە بێت و خێری لێ ببینێت! دواجار ئەو ڕۆژەش دەبینم کە بێباکانە بە بەردەمیدا تێدەپەڕم و سەیریشی ناکەم، تەنانەت ئەگەر سەیری ناوچاویشم بکات و بەڕێکەوتیش هەر ئەم تەنوورە سوورەشی لە پێدا بێت؛ کەس چووزانێ ئەگەر ڕۆژێکی وانەبەیەت؟ بەڵێ، ئەوکاتە ڕۆژی سەرکەوتنی منە، من خۆم باش دەناسم؛ ئەو هێزەم هەیە هەر ئەمشەو شانۆنامەکەم بنووسم و لە هەفتەیەکدا بیخەمە سەرچۆک... بەڵێ، کچەکە بە هەموو جوانی و ویقارەکەیەوە بخەمە سەرچۆک.

لەم کاتەدا زۆر ساردوسڕ خواحافیزیم لە یوومفرو کرد، بەڵام نەیهێشت بڕۆم و پرسی:

"باشە ئەم ماوەیە خەریکی چیت؟"

"پرسیاری بۆچییە، دیارە خەریکی نووسینم، لەمە زیاتر چیم پێدەکرێت؟ بەمە نان دەخۆم، ئێستا خەریکی نووسینی شانۆنامەیەکی

مێژوویی گرنگم، کە تایبەت بە سەدەکانی ناوەڕاست و ناوی نیشانی خاچە...'

یوومفرو لە دڵەوە وتی:

- 'سەیرە! ئافەرین! ئەی کە تەواو کرد بە تەمای چیت...'

وەڵامم دایەوە:

- 'زۆر بیر لەمەیان ناکەمەوە، چونکە پێم وایە تا هەشت نۆ ڕۆژی تر ناوم لەهەموو شوێنێک بڵاو دەبێتەوە.'

بابەتەکەم لێرە براندەوە و لێی جیابوومەوە.

کە گەیشتمە ماڵەوە یەکسەر چوومە لای خاوەنماڵ و داوای چرایەکم کرد، چرا بۆ من گرنگ بوو چونکە ئەو شەوە بەتەمای خەوتن نەبووم، سەرم پڕ بوو لە بابەتی شانۆنامەکە، هیوایەکی زۆرم هەبوو تا سبەی بەیانی بتوانم بەشە هەستیار و گرنگەکەی بنووسم، بەوپەڕی لەخۆبردوویی و خاکەڕاییەوە ئەم داوایەم لە خاوەنماڵەکە کرد، چونکە ئەوکاتەی پێم نایە ناو ژوورەکە هەستم کرد بە بێتاقەتییەوە دەموچاوی گرژ کرد، ئێستا ئیتر وا خەریکە شانۆنامەیەکی زۆر نایاب تەواو دەکەم، تەنها چەند دیمەنێکی کۆتاییەکەی ماوە و ناڕاستەوخۆ وتم ڕەنگە لە هۆڵێکی شانۆییدا نمایشی بکەن، ئەگەر یارمەتییەکم بدات منیش لە کاتی.... بەڵام ژنی خاوەنماڵ چرای نەبوو، بیریشی کردەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک بیری نەدەهاتەوە لە شوێنێکی ئەم ماڵە چرای لێ بێت، ئەگەر تا دوای نیوەشەو چاوەڕێ بم، ڕەنگە بتوانم چرای موبەقەکە بهێنم. وتی:

- 'ئەی بۆچی مۆم ناکڕن؟'

بێدەنگ بووم چونکە ئەو لە من باشتر دەیزانی کە دە ئۆراشم نییە بۆ کڕینی مۆمێک، هەڵبەت دیسان وەختبوو دەستبەتاڵ دەرچم، کارەکەر لە ژوورەکەی خوارەوە لای ئێمە بوو و لە موبەقەکە ئیشی نەبوو، کەواتە چراکەی سەرەوە هەڵنەکراوە، لەمە زیاتر هیچم نەوت و کەوتمە بیرکردنەوە، کارەکەرەکە پرسیاری کرد:

"وابزانم ئیستا له کۆشکی پاشایەتی گەڕاونەتەوە و لەوێ داوەتی خوانی ئێوارە بوون؟"

دوای ئەم گاڵتە ڕەق و بێتامەش قاقایەکی کرد.

من هەر لەوێ دانیشتم و کاغەزەکانم دەرکرد، مەبەستم بوو یەکسەر لەوێ دەستبەکار بم و بزانم دوایی چی دەبێت، کاغەزەکانم لە سەر ئەژنۆم دانا و چاوم ڕێک بڕیبووە ئەرزەکە، بۆ ئەوەی هیچ شتێک سەرنجم نەبات، بەڵام ئەمەش بێکەڵک بوو و بە قەد سەرەدەرزییەک سوودی بۆ نووسینەکەم نەبوو، دوو کچە بچکۆلەکەی خاوەنماڵیش هاتنە ژوورەوە، گلۆلەبەنەکەیان هەڵگرت و ویستیان لەگەڵ پشیلەکە یاری بکەن، بەڵام ئەمە پشیلەیەش گیانەوەرێکی سەیر و نەخۆش بوو، کە نزیکەی هەموو تووکی جەستەی وەریبوو، ئەوکاتەش منداڵەکانیش فوویان لە چاوی دەکرد فرمێسکی لێ دەتکا و دەخزایە سەر لووتی، مێردی خاوەنماڵ لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە دەوری مێزێک دانیشتبوون و خەریکی یاریی کاغەز بوون، تەنیا ژنی خاوەنماڵ وەک هەمیشە سەرقاڵی ئیش بوو، خەریکی خەیاتی بوو و ئەگەرچی باش دەیبینی من ناتوانم لە ناو ئەم بەزم و فەرتەنەیەدا بنووسم، هیچ بەلایەوە گرنگ نەبوو، تەنانەت ئەوکاتەش کارەکەر پرسیی کە نانی ئێوارە لە **کۆشکی پاشا** میوان بووم، بزەیەکیشی کرد، هەموو خەڵکی ئەم ماڵە دژی من بوون، وەک ئەوەی ڕازیبوونم بە چۆڵکردنی ژوورەکەم بۆ کەسێکی تر، نەنگییەکی گەورەیە و لەوەبەدوا من لە بەرچاویان تەنیا میوانێکی ناوەخت بووم، بە جۆرێک کە ئەم کارەکەرە چەتوونە چاوڕەشە بەو مەمکە ساف و وشکەڵاتەو و قژە ئاڵۆزکاوەی، کە نانی مرەبا، واتە نانی شەوی پێدەدام، گاڵتەی پێ دەکردم، هەموو جارێک دەیبینیم یەکسەر پرسیاری دەکرد لە کوێ نان دەخۆم کەوا ئەو ئاگای لێی نییە، چونکە تا ئێستا لە بەردەم **گراند ئوتێل** نەمبینیوی، دوای نانی ئێوارە خەریکی پاککردنەوەی ددانت بیت؟!

هەڵبەت ئەو کە وردەکارییەکانی ژیانی چەرمەسەریی منی دەزانی، بەوەی بابەتێکی وا بداتەوە بە ڕوومدا چێژی زۆری دەبرد، لەپڕ بەڕادەیەک نوقمی ئەم بیرکردنەوانە دەبم، کە تەنانەت ناتوانم دێڕێک، تەنیا دێڕێک لە شانۆنامەکە بنووسم و هەوڵەکانیشم بێسوود و پووچ دەردەچوون، ناو سەرم بە شێوەیەکی سەیر دەنگی دەدایەوە و دواجار دەست لە نووسین هەڵدەگرم و تەسلیم دەبم، کاغەزەکان دەخەمە گیرفانمەوە و سەیری سەرەوە دەکەم، چاوم لە چاوی کارەکەرەکەی بەردەمم گیر دەبێت، سەیری پشتە باریک و شانە داچەکیوەکانی دەکەم، کە نەیتوانیوە بە باشی گەشە بکات، بۆچی وا هێرشم دەکاتە سەر؟ گریمان من لە کۆشکی پاشایەتی گەڕاومەتەوە چ پەیوەندییەکی بەمەوە هەبوو، ئایا ئەمە ئازارێک بوو بۆ ئەو؟ بۆ نموونە بەم دواییانە کە بەڕێکەوت قاچم گیرابووە پێچی پلیکانەکە یان بزمارێک لە چاکەتەکەم گیر بووە و دڕاندوویەتی، بەوپەڕی بێشەرمییەوە پێم پێکەنیبوو، هەر دوێنێ ڕەشنووسەکانمی کە لە ژوورە بچووکەکە بڵاو کرابوونەوە، بەتایبەت ئەو بەشانەی شانۆنامەکە کە پێداچوونەوەم بۆ کردبوو، دزی بووی و تەنها بۆ ڕابواردن بە دەنگی بەرز لە ژوورەکەدا بۆ ئەوانی تر خوێندبووەوە و لەبەردەم هەمووان گاڵتەی پێکردبووم. کەچی من بیرم نایەت هیچ کێشەیەکم بۆی هەبووبێت یان داوای شتێکم لێکردبێت، بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەی ئەزێتی نەدەم خۆم نوێنەکەم لە سەر ئەرزەکە ڕادەخست، هەروەها لەبەر وەرینی قژم قەشمەریی پێدەکردم، کە بەیانیان تاڵە قژەکانمی لە سەر دەستشۆرەکە دەبینی بێزی دەکردەوە و ڕقی هەڵدەسا، پێڵاوەکانیشم بووبوونە گاڵتە و ئەوکاتەی تاکێکیان کەوتبوونە ژێر تایەی عارەبانەکەوە، دەیوت: خوا جەنابتان و پێڵاوەکانتان لە کارەسات بپارێزێت! بۆ خاتری خوا سەیر بکەن وەک کولانەسەگ پان بوونەتەوە! هەقی خۆی بوو چونکە پاژنەی

پێڵاوەکانم دەرچووبوو و لارولەوێر و بەدقەوارە بووبوو، بەڵام چی بکەم نەمدەتوانی پێڵاوێکی تر بکڕم.
بەدەم نوقمبوون لەم بیرکردنەوانەدا و واقوڕمان لە خراپەی بێباکانەی کارەکەرەکە، منداڵەکان خەریکی بێزارکردنی پیاوەپیرەکەی سەر کورسییە بێشکەییەکە بوون، هەردووکیان بە دەوریدا فڕکەفڕکیان بوو و ماندوو نەدەبوون، هەریەکەیان پەڕێکی دەهێنا و دەیبردە ناو کونەلووتی کابرا پیرەکەوە، من ئەگەرچی بینەری ئەم دیمەنە بووم، بەڵام خۆم تێهەڵنەقورتاند.
پیرەپیاوەکە تەنانەت پەنجەشی بۆ بەرگریکردن لە خۆی نەدەجوڵاند، تەنیا ئەوکاتەی نوقورچیان لێ دەگرت چاوەکانی بە تووڕەییەوە ڕوو دەکرد منداڵەکان، ئەوکاتەش پەڕەکەیان دەبردە ناو کونەلووتییەوە بە ڕاوەشاندنی سەری، پەڕەکەی دەکردە دەرەوە، سەیرکردنی ئەم دیمەنە زیاتر دەیشڵەژاندم و تواناشم نەبوو چاوی لەسەر لابەم، باوکی خێزانەکە لە پشت کاغەزەیارییەکانی دەستییەوە، بە گاڵتەی منداڵەکانی پێکەنی و تەنانەت پیاوەکانیشی لە مەسەلەکە تێکەیاند.
ئەی بۆچی پیرەپیاوەکە نەدەجولا و بە دەستی منداڵەکانی دوورنەدەخستەوە؟ هەر کە هەنگاوێک لە چرپاکە نزیک کەوتمەوە پیاوی خاوەنماڵ وتی:
"وازیان لێ بێنە! وازیان لێ بێنە! کابرا ئیفلیجە..."
منیش لە ترسی ئەوەی دەست بخەمە ناو مەسەلەکەوە و نەوەک کابرا بێزار بێت، بەم درەنگانی شەوە لە ماڵەکە دەرم بکەن بێدەنگ لە جێگەکەم دانیشتم و نقەم نەهات، بۆ دەبێ لەبەر دەستێوەردانێکی بێهۆ لە کێشەی خێزانی ئەواندا خواردن و جێگەم بخەمە مەترسییەوە؟ بۆ لەبەر پیرەپیاوێکی نیوەگیان، گەمژەیی بنوێنم؟ بەوەی کە دڵم وەک بەرد ڕەق بووبوو خۆشحاڵ بووم، بەڵام منداڵە هاروهاجەکان دەستبەردار نەبوون، وەڕس بوون لەوەی بۆچی پیرەپیاوەکە سەری ڕادەوەشێنێت، خەریکی کونەلووت و چاوی بوون،

ئەو کە نەیدەتوانی دەستی بجولێنێت بێ ئەوەی دەم بکاتەوە، بە نیگایەکی مات سەیری دەکردن، لەپڕ بەشی سەرەوەی لەشی جولاند و تفێکی کردە یەکێکیان، دواتر دیسان خۆی ڕاوەشاند و تفێکی تریشی ڕەوانەی دووەمیان کرد، بەڵام بەر دەموچاوی نەکەوت، لەپڕ بینیم خاوەنماڵ کە دەموچاوی سووربووەوە، کاغەزەکانی فڕێدایە سەر مێزەکە و بەرەو جێخەوەکە ڕۆیشت و هاواری کرد:

- "پیری کەڵتەکۆن! شەرم ناکەی تف دەکەیتە ناوچاوی ئەو منداڵە بچووکانە!"

من لە خۆمەوە هاتمە دەنگ و وتم:

- "ئاخر خواش ئەمەی پێخۆش نییە، یەک دەقە نایەڵن ئیسراحەت بکات."

بەڵام لە کاتی وتنی ئەم قسانەدا دەترسام بمکەنە دەرەوە، لەبەرئەوەش نەک هەر دەنگم هەڵنەبڕی، بەڵکو زۆر هێواش و کاوەخۆ قسەکەم کرد، بەڵام ئەوەندە توڕە بووم هەموو گیانم دەلەرزی.

پیاوەکە ڕووی لە من کرد و وتی:

- "دە وەرە گوێ لەمە بگرە! فەرموو بزانم پەیوەندی بە ئێوەوە چییە؟ تاکە داوای من لە جەنابت ئەوەیە باش دەرگاکە داخە و قوفڵی بکە، چونکە ئەمە باشترە بۆ جەنابت."

دواتر دەنگی ژنی خاوەنماڵ لەم کەینوبەینەدا بەرزبووەوە و فەرتەنەیەک دروست بوو، ئەویش هاواری کرد:

- "پەنا بەخوا! وابزانم هەمووتان شێتووێتن و جنۆکە دەستی لێوەشاندوون! هەر دووکتان ئاگادار دەکەمەوە، ئەگەر دەتانەوێ لێرە بمێننەوە بێدەنگ و ئاقڵانە لە شوێنی خۆتان دانیشن، ڕێوشوێن و گۆشت و قوزەڵقورت دەدەمە ئەم سواڵکەرانە و دەشیکەن بە بەزم و فەرتەنە، ئیتر دووبارە نەبێتەوە، دەمتان دابخەن، هۆی منداڵی خوێڕی! ئەگەر دەمتان دانەخەن خۆتان بەرپرسن، من لەم جۆرە زەلامانەم ناوێت، ئەسپێونانە یەک فلسیان نییە هیچ بکڕن، نیوەشەو خۆیان لە

کۆلانەوە دەکەن بە ئێرەدا و خۆیان تێکەڵ بە خێزانی ماڵەکە دەکەن و بەزم دەنێـنەوە. گـوێ بگـرن، مـن لەم شـتانەم ناوێـت لەم مـاڵە و کەسێکیش ئێرەی پێخۆش نییە، فەرموو با شـەقێ لە خـۆی هەڵدا و بـڕواتە دەرەوە، مـن دەمەوێ لەم کـاولبووەدا ئیسـراحەت بـم، تێگەیشتن؟"

من هیچم نەوت و نقەم نەکرد، بەڵکو گەڕامەوە لای دەرگاکە دانیشتم و گوێم لە بەزموفەرتەنەیە گرتبوو.

هەمـوان تەنـانەت منـداڵەکانیش قاوقیژیـان نـابووەوە، کـارەکەرەکەش دەویست ڕوونی بکاتەوە شـەڕەکە چۆن دەستی پێ کرد. ئەگەر من کەڕولاڵ لە جێگەکەی خۆم دابنشـیم و هیچ نەڵێم شـەڕەکە بەرەبەرە هـێمن دەبێتەوە، کار لە کـار ناترازێت، باشـە مەگەر چیم پێ دەکرا؟ مەگەر ئاگـام لە سـەرمای دەرەوە نەبـوو و نەمـدەزانی شـەوە، مەگەر بەم درەنگانە کاتی ئەوەیە شـەڕ بکەیت و بکێشـیت بەسـەر مێزدا؟ بە خـۆم دەوت نەکەی خـۆت کەر بکەیـت! بە هـیچ شـێوەیەک! هـێمن و بێبـاک لە جـێگەکەم دانیشـتبووم، لەگەڵ ئەوەی ناڕاسـتەوخۆ دەریـان کردبووم، نەمدویست بڕۆمە دەرەوە و بە چاوەکانم کە چاویلکەیەکی بەسـەرەوە بوو، تەماشـای وێنەی ڕەنگاوڕەنگی مەسـیحم دەکـرد، لە سەر دیوارەکە و لە بەردەم تڕۆهاتی خانمی خاوەنماڵ هیچم نەدەوت.

یەکێک لە یاریچییەکان وتی:

"خـانم ئەگەر مەبەسـتتان ئەوەیە حسـابتان لەگەڵ مـن سـاف بـکەن، ئامادەم بڕۆم."

لە جێگەکەی هەستا و یەکێکی تریشیان لەگەڵیدا هەستایە سەرپێ.

خانمی خاوەنماڵ وەڵامی هەر دووکیانی دایەوە:

"نەخێـر مەبەسـتم تـۆ نەبـوو! تـۆش نـا! ئەگەر پێویسـت بکـات خـۆم دەتـوانم بڵـێم ڕووی دەمـم لە کێیە، تێـدەگەن! ئەگەر پێویسـت بکـات پێتان دەڵێم مەبەستم کێیە..."

قسەکانی پچڕپچڕ دەکرد، ناوبەناو قسەکانی درێژ دەکرد و تانەیەکی دەگرتە من، تا باشتر تێیان بگەیەنێت مەبەستی کێیە، بە خۆم دەوت بێدەنگ بە و هیچ مەڵێ! ئەو خۆی بە ئاشکرا دەری نەکردبووم، هەربۆیە دەبێ وریا بم و لەخۆمەوە خۆم گیف نەکەمەوە و غرووروم لەخۆوە نەجووڵێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەش قژی مەسیح لە وێنەکەدا ڕەنگێکی سەوزی تایبەتی هەبوو، کە زۆر دوور نەبوو لە ڕەنگی گیا، بە ناسکانەتر دەتوانین بڵێین بەرەو مەیلەوسەوزی تێری گیای دەشتودۆڵەکان دەچوو... چەند چواندنێکی سەیرم دۆزییەوە! لەم کاتەدا هەندێک بیرکردنەوە وەک بایەکی پڕ لە مانای جۆراوجۆر بە مێشکمدا ڕەت بوون، بیرم کردەوە کە یەکێک لە ئایەتەکانی کتێبی پیرۆز دەڵێت: کە ژیانی ئادەمی وەک وشکەگیایەکە، کە بڵێسەی خەڵوز تێی دەئاڵێت و لەوێوە کەوتمە بیری ڕۆژی قیامەت، کە تەڕووشک پێکەوە دەسووتێن، دواتر بیرکردنەوەیەکی تر هات و دوای ئەوەش خەیاڵم ڕۆیشتە لای بوومەلەرزەی **لشبۆنە**[1]، لەوێوە بە ناڕوونی کەوتمەوە بیری قاپێکی نەخشێنراو بە دەستی مسکارێکی ئیسپانیا، قەڵەمدارێکی لە دارئیبۆنی تاشراو، کە لە ماڵی **ئیلایالی** بینیبووم، جەخار کە هەموو شتێک لەرزۆک و ناجێگیرە! بەڵێ کۆتایی هەموو شتێکیش چوار تەختە و کفنێکە و ناونیشانەکەش دیارە؛ خانمی ئەندرسۆن لای ڕاست لە ژێر دەرگا گەورەکە.

سەیر ئەوەبوو کە ئەم بیرکردنەوانە، لەو ساتە پرشنگدارەی کە خاوەنماڵ زۆری نەمابوو لە دەرگاکەوە بمکاتە دەرەوە، هاتە مێشکمەوە، لەپڕ گوێم لێ بوو ژنەکە هاوار دەکات:

- 'وادیارە گوێ ناداتێ، دەڵێم دەبێ لەم ماڵە بڕۆنە دەرەوە، ئێستا تێگەیشتن؟ شەیتان بە نەحلەت بێت! وابزانم کابرا تەواو شێت بووە!

---

[1] لشبۆنە، یەکێک لە شارە دێرینەکانی ئەورووپا و پایتەختی پورتوگال، کە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم بە هۆی بومەلەرزەیەکی ئێجگار گەورە و ترسناکەوە وێران بوو، یادی ئەم بوومەلەرزەیە لە مێژوودا ماوەتەوە. (و.ف)

لەوە زیاتر پێویست ناکات هیچ بڵێم، ئێستا ئیتر دەبێ بێ چەلەحانێ بڕۆنە دەرەوە."

سەیرێکی دەرگاکەم کرد، بەڵام بە مەبەستی ڕۆیشتن نا، چونکە بە هیچ شێوەیەک بە تەمای ڕۆیشتن نەبووم، خەیاڵێکی ترسناک هاتە مێشکمەوە، ئەگەر کلیلەکە بە دەرگاکەوە بوایە بۆ ئەوەی خۆم لە ڕۆشتنە دەرەوە بەدوور بگرم، دەرگای ماڵەکەم بەسەر خۆم و هەموانـدا دادەخست، چونکە کە بیرم لە کۆڵانەکە دەکردەوە مووچڕکێکی عەسەبی ترسناک هەموو گیانی دەگرتەوە، بەڵام کلیلەکە بە دەرگاکەوە نەبوو و منیش لە جێگەکەم هەستام، ئیتر هیچ دەرچەیەکی هیوا بوونی نەبوو، لەپڕ دەنگی خاوەنماڵ و ژنەکەی تێکەڵ بوو.

من حەپەساو دەوەستم و بینەری ڕووداوێکی سەیرم، ئەم پیاوە کە پێشتر هەڕەشەی لێکردبووم ئێستا لایەنی من دەگرێت و بە ژنەکەی دەڵێت:

"دەزانی ناخۆشە کرێچییەک شەو لە ماڵەکەت دەربکەی، ئەم کارە تاوانە و بەپێی یاسا سزای خۆی هەیە."

هەر باوەڕم نەدەکرد و ئاگام لەوە نەبوو ئەمە تاوان بێت، بەڵام وادیارە وایە، ژنەکە یەکسەر هەستی بە تووڕەیی خۆی کرد و دامرکایەوە و ئیتر هیچی لەگەڵ نەوتم، تەنانەت دوو نانی مرەباییشی بۆ هێنام بەڵام قبوڵم نەکرد، هەڵبەت وەک سوپاسێک بۆ مێردەکەی وەرم نەگرت، بیانووم هێنایەوە کە لەدەرەوە نانم خواردووە، دواجاریش کە بۆ خەوتن ڕۆیشتمە ژوورە بچووکەکە ژنی خاوەنماڵ دوام کەوت، لە بەردەم دەرگاکە وەستا و لە کاتێکدا ورگی دووگیانی ڕوو لە من دەرپەڕاندبوو، بە دەنگی بەرز وتی:

"ئاگادارتان دەکەمەوە ئەمشەو دواهەمین شەوە لەم شوێنە دەخەون."

وەڵامم دایەوە:

"زۆر باشە هیچ قسەیەکم نییە!"

ئەگەر بەڕاستی هەوڵم بدایە ڕەنگە بمتوانیایە چۆن بووە بۆ سبەی شەو شوێنێک بدۆزمەوە، بەهەرحاڵ خۆشحاڵ بووم کە ئەمشەو ناچار نیم لە دەرەوە بخەوم.

*****

ڕێک تا سەعات پێنج یان شەشی بەیانی خەوتم، کە هەستام هێشتا خۆر نەکەوتبوو، بەڵام یەکسەر لە چرپاکەم هاتمە دەرەوە، لەبەرئەوەی هیچم نەبوو بیدەم بە خۆمدا لە ترسی سەرما بە جلەوە خەوتبووم، قومێک ئاوم خواردەوە و بە هێمنی دەرگاکەم کردەوە، لە ترسی ئەوەی دیسان ژنی خاوەنماڵ ببینم یەکسەر ڕۆیشتمە دەرەوە، لە هەندێ شوێن پاسەوانی شەوگەڕ دەگەڕان، بەڵام جگە لەوان هیچ بوونەوەرێکی تر بە دەرەوە نەبوو، کەمێک دواتر دوو کەس هاتن و دەستیان کرد بە کوژانەوەی چراگازەکانی ئەو ناوە. بێ هیچ هۆیەک بەرەو شەقامی **کلێسا** ڕۆیشتم، لە شەقامێکەوە کە بەرەو **قەڵای سەربازی** دەڕۆیشت بەرەو خوارەوە شۆڕ بوومەوە، ڕەق بووبوومەوە و زۆر برسیم بوو، ئەژنۆ و پشتم بەهۆی ئەم ڕێپێوانە درێژەوە داهێزاربوو، شلوشەوێڵ و خەواڵوو لە سەر کورسییەک لێی کەوتم، ماوەیەک چاوم چووە خەو، سێ هەفتەی پێشوو خواردنەکەم تەنیا ئەو نانەمرەبابییانە بوو، کە نیوەڕۆ و ئێوارە و بەیانی دەرخواردیان دەدام، دواهەمین خواردنیشم بیستوچوار سەعات لەمەوبەر خواردبوو، برسێتی دیسانەوە قووڵ ئازاری دەدام و دەبوو تا زووە چارەی بکەم.
بیرم لەمە دەکردەوە کە لەناکاو لە سەر کورسییەکە خەوم لێکەوت... دەنگی قسەکردن لە چواردەورەوە خەبەری کردمەوە، کە هاتمەوە سەرخۆم بینیم ماوەیەک لە ڕۆژ لایداوە و خەڵکی کەوتوونەتە جموجۆڵ، هەتاو بە سەربانەکانەوە دیار بوو و ئاسمان کەمڕەنگ و چڕ دەینواند، دوای چەندین هەفتەی بەردەوام کە هەوا لێڵ و خنکاو

بوو، له خۆشی ئەم هەتاوەدا هەموو خەم و خەفەتم لە بیر کرد، هێنامە پێش چاوم کە چەندین جار ڕۆژی لەمە ناخۆشترم بینیوە، چەند بۆکسێکم کێشا بە سینگمدا و لەخۆمەوە لەژێر لێوەوە گۆرانیم وت، دەنگم ئەوەندە نووسا بوو کە بە بیستنی دەنگم، بەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە و قوڵپی گریانێک گەرووی گرتم، ئەم ڕۆژە خۆشە و ئاسمانە کاڵەوەبووە، کە نوقمی ڕووناکی بوو زۆر کاری لێکردم، بە دەنگی بەرز دەستم کرد بە گریان، پیاوێک لەوێوە تێپەڕی و پرسیی چی بووە؟ وەڵامم نەدایەوە، دەموچاوم داپۆشی و ڕووم کردە خوارەوە تا گەیشتمە کەنار بەندەرگاکە، کەشتییەکی گەورە بە سێ دووکەڵکێشەوە، کە ئاڵای ڕووسیای هەڵکردبوو، خەریکی داگرتنی خەڵوز بوو، لە سەر جەستەی وشەی **کۆپگۆرۆ**[1] نەخشێنرابوو، ماوەیەک خۆم بە تەماشای ئەم کەشتییە بیانییەوە سەرقاڵ کرد، وادیار بوو زۆری نەماوە بارەکەی تەواو داگرێت، ئەگەرچی پێشتریش باری بردبوو، لە سەر جەستەی ژمارە دە پێ[2] نووسرابوو، هەر دوای ئەوەی حەماڵەکان بە جزمەی گەورە و ئەستوورەوە لە سەر پردەکە هاتوچۆیان دەکرد، ئاوازێکی خاڵی و خنکاو لە هەموو کەشتییەکەدا دەنگی دەدایەوە، هەتاو و ڕووناکی و بۆنی ئاوی سوێری دەریا، کە پڕبوو لە خرۆشانێکی خۆش و وزەبەخش هێزێکی تازەی دایەوە بە گیانم، خوێنێکی تازە بە دەمارەکانما گەڕ، لەپڕ هاتە خەیاڵمەوە بەدەم دانیشتنەوە چەند لاپەڕەیەک لە شانۆنامەکەم بنووسم و تەواوی بکەم، لەبەر ئەمەش کاغەزەکانم لە گیرفانم دەرهێنا، خۆشم تەرخان کرد کە لە زمانی قەشەیەکەوە وەڵامێک بنووسم، ئەم وەڵامەش دەبوو بە ڕەقی بوترێت و نیشانەی سەختی و قورسی ئایین بێت، بەڵام لەبەرئەوەی نەمتوانی بینووسم وازم لە قەشەکە هێنا، ویستم دادوەرێک سزای ژنی گوناهکار بدات، کە نیو

---

[1] Copegoro

[2] ئاماژەیە بۆ بەرزیی کەشتییەکە.

لاپەڕەییم نووسی وازم لەوەش هێنا، چونکە وشەی باش و شایستەی ئەو دۆخ و حاڵەتەم نەدۆزییەوە، جموجوڵێک کە لە چواردەورمەوە دەبینرا و دەنگی گۆرانیی کرێکارەکان، کە بە گوریس بەلەمەکانیان رادەکێشایە قەراغ، خرەخرەی بەکرەکان و تەقوتۆقی بەردەوامی فارگۆنەکانی بار، بەرادەیەک لەگەڵ ژینگەی کۆن و تاریک و بەویقاری سەدەکانی ناوەڕاستی شانۆییەکە ناکۆک بوو، کە وێناکردنی مەحاڵ بوو، هەربۆیە کاغەزەکانم کۆکردەوە و لە جێگەکەم هەستام، بەڵام زەوقم هەبوو و هەستم دەکرد ئەگەر دەرفەتێکی باش برەخسێت دەتوانم شتێک بنووسم، خۆزگە لانیکەم شوێنێکی هێمنم هەبوایە! لە ناوەڕاستی شەقامەکە دانیشتم و بیرم لەمە دەکردەوە، بەڵام سەیرم کرد لە هەموو ئەو شارە سوچێکی هێمن نییە بتوانم بە بێدەنگی تیای دابنیشم، تاکەچارە ئەوە بوو کە بگەڕێمەوە بۆ هەمان ژووری میوانخانەکەی گەرەکی واترلاند، بەڵام لە دڵەوە حەزم نەدەکرد و بە خۆم دەوت ئاخر چۆن شتی وا دەبێت! لەگەڵ ئەمەش بەڕێوە بووم بۆ ئەو شوێنە کە وەک "ناوچەی قەدەغە" بوو بۆ من، هەڵبەت خۆشم دەمزانی کە بەڕاستی کارێکی قێزەون دەکەم، بەڵام هیچ چارەیەک نەبوو.

بەڵێ، غرور و گەورەیی خۆم خستە لاوە، تەنانەت ئەگەر زێدەڕۆیی نەبێت، دەتوانم بڵێم ئەو ڕۆژە و ئەو ساتە خۆم بە زەلیلترین ئینسانی سەر زەوی دەبینی، بەرگەی هەموو جۆرە سووکبوونێکم دەگرت، ئەم بابەتەم لە خۆم حاڵی کرد و کەوتمەڕێ، لە بەردەم دەرگای میوانخانەکە جارێکی تر دڕدۆنگ بووم و وەستام، بەڵام دواجار وتم بە جەهەنەم چی دەبێ با ببێ...! لە ڕاستیدا بابەتەکە زۆر بێبایەخ بوو، چونکە یەکەم تەنیا چەند سەعاتێک ئیشم هەبوو. دووەم سوێندم بە خوای خۆم خواردبوو، کە لەوە بەدوا جارێکی تر پێ نەنێمەوە ئەو شوێنە، دواتر هەر جۆرێک بێت چوومە حەوشەکە، تەنانەت ئەوکاتەش بە سەر بەردڕێژی نارێکی حەوشەکەدا دەڕۆیشتم، دیسان

دوودڵ بووم و کە گەیشتمە بەر دەرگاکە ئامادەی گەڕانەوە بووم، بەڵام ددانم جیڕ کردەوە و وتم نا! نابێ لەخۆڕا لەخۆبایی بم، ئەوپەڕی ئەوەیە بیانوویەک بۆ هاتنەکەم دابتاشم، بڵێم هاتووم بە فەرمی داوای مۆڵەتی پشوو بکەم، هەروەها دەمویست بەروارێکیش بۆ دانەوەی قەرزەکانم دابنێم، دەرگای ژوورەکەم کردەوە، کە ڕۆیشتمە ژوورەوە چاوەڕێ بووم، بێدەنگ و هێمن لە شوێنەکەی خۆم وەستام، دوو هەنگاو دوورتر، لە بەردەم من پیاوەی خاوەنماڵ بێ چاکەت و بێ کڵاو وەستابوو، لە کونی کلیلی دەرگاکەوە سەیری ناو ژوورەکەی دەکرد و پێدەکەنی، بە پێکەنینەوە پێی وتم: "وەرە ئێرە." من لە سەر پەنجەپێ نزیک کەوتمەوە، وتی: "ئێستا سەیرکە" و دەستی کردەوە بە پێکەنین، پێکەنینێکی هێمن و بێدەنگ، بەڵام لە دڵەوە دەهاتە دەر، دیسان ئاماژەی بۆ کردمەوە لە کونەکە سەیر بکەم: "هاهاها؟ لە باوەشی یەکتر خەوتوون! سەیری پیرەمێردەکە بکە، باش دەیبینی؟"

بەڵێ، لەسەر جێخەوەکە، ڕێک لای وێنەکەی مەسیح، دوو جەستە بەرچاو دەکەوت: ژنی خاوەنماڵ و دەریاوانی بێگانە، لنگی ژنەکە وەک پەڵەیەکی سپی بەسەر سەرینە ڕەشەکەوە دیار بوو، لە سەر جێخەوەکەی تر کە نووسابوو بە دیوارەکەوە، باوکی – پیرەپیاوە پەککەوتەکە- وەک هەمیشە سەرکز بۆ پێشەوە نوشتابوویەوە، قورسایی خستبووە سەر دەستی و هەرچەند توانای جووڵەی نەبوو، تەماشای دەکردن، ڕووم کردە پیاوی خاوەنماڵ و بینیم بە توندی لووتی گرتووە، نەوەک بە دەنگی بەرز قاقا لێ بدات. بە چپەوە پێی وتم:

"پیرەپیاوەکەت بینی؟ پەنا بەخوا! بینیت چۆن دانیشتووە و خەریکە سەیریان دەکات؟"

ئەمەی وت و دیسان لە کونی کلیلەکەوە سەیری کردەوە، منیش بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتم، ئەم دیمەنە تەواو وڕی کردبووم و هەموو

ئیلهامەکەی لەناو بردم، باشە ئەمانە پەیوەندیی بە منەوە چییە؟ کە مێردەکەی خۆی بە خەیاڵیدا نەدەهات و زۆریشی پێخۆشە، ئیتر بۆچی من بحەپەسێم و بێتاقەت بم، لەولاشەوە پیرەپیاوێکی لە ئیشکەوتوو، کە ڕەنگە بەلاشیەوە گرنگ نەبێت و هەروا دانیشتووە و خەوی لێکەوتووە، ڕەنگە هەر خەوێکی تاهەتاییش خەوتبێت، بە کورتی ئەم مەسەلەیە هیچ ئازارێکی ویژدانی بۆ من تیا نەبوو.

جارێکی تر کاغەزەکانم گرت بە دەستمەوە، بڕیارم دا خەیاڵی پڕوپوچ لە خۆم دووربخەمەوە و خەریکی نووسین بم، لە ناوەڕاستی نووسینەکەدا گیرم خواردبوو و تیامابووم، دێڕەکەش ئەمە بوو "بەپێی حوکمی خواوەند و فتوای یاسا و ڕای ڕاوێژکارانی باوەڕپێکراو و بانگی ویژدان..." ئەوسا لە پەنجەرەکەوە سەیری خوارەوەم کرد بزانم ویژدانی دادوەر فەرمانی چی دەردەکات، لە ژوورەکەوە گوێم لە دەنگێکی کز بوو، بەڵام وتم پەیوەندیی بە منەوە چییە، ئەوپەڕی پیاوەپیرەکە مردبێت یان ڕەنگە سەرلەبەیانیش مردبێت، کەواتە ئەم دەنگە پەیوەندی بە منەوە چییە، بۆچی دەبێ مێشکم بۆ ئەم بابەتە بڕوات، بە خۆم وت پەشیمان بەرەوە و دان بەخۆتدا بگرە، دیسان دەگەڕێمەوە بۆ دێڕەکە؛ بەڵێ "... و بانگی ویژدان..."

بەڵام وادیارە هەموو شتەکان دژی من ڕێکەوتوون، چونکە دیسان مێشکم لە ئیش کەوتەوە، پیاوەکە لە بەردەم کونی دەرگاکە ئۆقرەی لێ بڕابوو، ناوبەناو گوێم لە پێکەنینەکەی بوو، دەمبینی لەناو پێکەنین لوول بووە، لە کۆڵانەکەش شت ڕووی دەدا، هۆشم بە تەواوی شێواو و شڵەژا بوو، کوڕێکی بچکۆلە لە سەر شۆستەکەی ئەوبەر تاکوتەنیا دانیشتبوو و یاری دەکرد، بەو مانایەی ئیلاقەی کەسی نەبوو، تەنها قردێلەی کاغەزی گرێ دەدا، لەپڕ بە جنێوەوە دەردەپەڕێت و خۆی دەکشێنێتە دواوە، سەیری پیاوێک دەکات لە سەرەوە، ئەم پیاوە ئاقڵە پیاوێکە بە ڕیشی خەنەییەوە، سەیری لە پەنجەرەکە هێناوەتە دەرەوە

و تف ڕۆ دەکاتە خوارەوە، بۆ سەر سەری کوڕەکە... کوڕەکە لەتاو تووڕەیی دەگری، داماو جنێوی بۆ دەنێرێت و پیاوەکەش زەقزەق سەیری دەکات و پێدەکەنێت، ئەم وەزعە پێنج دەقەی خایاند، من ڕووی خۆم وەرگێڕا کە شینوڕۆڕی منداڵەکە نەبینم و دیسان لە دڵەوە وتم: بەڵێ "...بانگی ویژدان..." بەڵام درێژەی دێڕەکەم بۆ نەهات و مەحاڵ بوو بتوانم لەمە زیاتر بنووسم، دواجار ئەرزوئاسمان لە بەرچاومدا دەستی کرد بە خولانەوە، هەستم کرد ئەوەی نووسیومە قسەی قۆڕە و بەکەڵکی هیچ نایەت، لە سەدەکانی ناوەڕاست ناتوانین باسی ویژدان بکەین، چونکە مەسەلەی ویژدان لە لایەن شکسپیرەوە هاتۆتە ناو ئەدەب و بۆتە شتێکی باو، هەربۆیە بناغەی وتاری دادوەرەکەم بە بۆش و بێبنەما زانی و دەبوو ئەم کاغەزانە بدڕێنم، جارێکی تر تا کۆتایی خوێندمەوە و یەکسەر گومانم نەما، چونکە شوێنی زۆر نایابی تیا بوو، هەندێک لە شوێنەکان کە بەڕاستی داهێنەرانە بوو، دەیهێنامە سەر زەوق و مەیلێکی قووڵی بۆ دروست دەکردم، دیسانەوە دەست پێ بکەم و شانۆنامەکە تەواو بکەم، هەستام و گوێم بە ئامۆژەکانی کابرای خاوەنماڵ نەدەدا، کە تکای دەکرد لەسەرخۆ هەنگاو بنێم، زۆر ئاسایی دەڕۆیشتم، بە پێداگرییەوە لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە و ڕۆیشتمە نهۆمی یەکەم و ڕۆیشتمە ناو ژوورەکەی پێشووم، چونکە دەمزانی کابرا لەوێ نییە، دەمتوانی لەوێ بێدەنگ دابنیشم، دەست بۆ کەلوپەلی ژوورەکە نابەم و تەنانەت لە سەر مێزەکەش نانووسم، هەر ئەوەندەم بەسە لە سەر کورسیی لای دەرگاکە دابنیشم، کاغەزەکانم بە گەرموگوڕییەوە لە سەر ئەژنۆم بڵاو کردەوە و دەست پێ دەکەم، ماوەیەکی کورت شتەکان باش دەڕۆیشت، دێڕەکان یەکبەیەک لە مێشکمدا دەنەخشا و بێ وەستان دەمنووسی، خێرا لاپەڕە دوای لاپەڕەم ڕەش دەکردەوە، لە بێهۆشی و خرۆشدام، لە دڵخۆشیدا ئاگام لە خۆم نامێنێت، لە بێدەنگی ژوورەکەدا گوێم لە هاواری دڵخۆشی خۆمە، بابەتێکی تازە و نایابیشم دێتە

خەیاڵ، ئەوەش ئەوەیە کە لە بەشێکی شانۆییەکەدا دەنگی زەنگی کڵێسا بەکار بهێنم، لەم کاتەدا گوێم لە دەنگی پێیە لە پلیکانەکانەوە، لەپڕ دەلەرزم و خەیاڵم دەپچڕێت، لەتاو برسێتی تام هەیە و تۆقیو و ترساو خۆم ئامادەی ڕاکردن دەکەم، گوێ قوڵاخم، بە تووڕەییەوە گوێ دەگرم و قەڵەمەکەم بەدەستەوە دەگرم، لە کەمیندا دانیشتووم و ناتوانم یەک وشە بنووسم، لەناکاو دەرگا دەکرێتەوە و ئەو ژن و پیاوەی ئێستا لە ژوورەکەی خوارەوە بوون دێنە سەرەوە، هێشتا زمانم بۆ داوای لێبووردن نەکردبووەوە، کە ژنی خاوەنماڵ هەر منی بینی ڕاچڵەکا و هاواری کرد:

- "ئەی هاوار پەنا بەخوا کابرا لێرەیە!"

من چیم کرد شتێک بڵێم نەمتوانی، تەنها وشەی ببورە هەتا سەر زمانم، دەرگاکەی خستە سەر پشت و قیژاندی:

- "ئەگەر یەکسەر لێرە نەڕۆنە دەرەوە، بە نەحلەت بم ئەگەر پاسەوانێکتان بۆ نەهێنم!"

بە ناچاری هەستام و وتم:

- "مەبەستم هیچ نەبوو، هاتووم خواحافیزییەک بکەم، لەبەرئەوەی لێرە نەبوون ناچار بووم چاوەڕێ بکەم بێن، دەستم بۆ هیچ نەبردووە و تەنیا لە سەر کورسییەکە دانیشتبووم."

کابرای دەریاوان وتی:

- "ئێ خۆ هیچی نەکردووە، کێشە نییە، وازی لێ بێنن!

کە لە پلیکانەکانەوە دەهاتمە خوارەوە، ڕق و تووڕەییەکی زۆرم بۆ ئەم ژنە ورگزلە هەبوو، کە هەنگاو بە هەنگاو دوام کەوتبوو، دەیویست تا زووە بمکاتە دەرەوە، لەگەڵ ئەوەی ناخۆشترین جنێوەکانم لەسەر زمان بوو، بەڵام دەمم نەکردەوە و بێدەنگ بووم، هەڵبەت بێدەنگیی من وەک سوپاسێک بوو بۆ پیاوە نەناسەکە، نەمدەویست لە بەردەم ئەودا قسەیەکی ناشیرینم کردبێت، بەڵام ژنی خاوەنماڵ دوام کەوتبوو و چی بەدەمدا هات پێی وتم، تووڕەییەکەم تا دەهات زیاتر دەبوو، هەر

سێکمان دواجار گەیشتینە حەوشەکە، من بە هێواشی هەنگاوم دەنا و لە بەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە، لەگەڵ ژنی خاوەنماڵ دەستەویەخە بم یان نا، چونکە ئەوەندە توڕە بووم زۆری نەمابوو خوێن بڕژم، حەزم دەکرد یەک لەقەی چاک بکێشم بە ورگیدا و بە مەبەستی کوشتن لێی بدەم، لە بەردەم دەرگاکە پیاوێکم بینی، سڵاوێکی کرد، بەڵام جوابی سڵاوەکەم نەدایەوە، بیستم لە دواوە قسە لەگەڵ ژنی خاوەنماڵ دەکات و بەدوای مندا دەگەڕێت، بەڵام ئاوڕم نەدایەوە، دوای ئەوەی چەند هەنگاوێک دەنێم، دیسان دێتە لام و سڵاو دەکات، ڕێگەم لێ دەگرێت و پاکەتێک دەداتە دەستم، پاکەتەکە بە بێزارییەوە دەکەمەوە، کاغەزی تیا نییە، بەڵام دە کرۆنییەکی لێ دەکەوێتە خوارەوە، سەیرێکی پیاوەکە دەکەم و دەپرسم:

"ئەم گاڵتەکردنە چییە؟ کێ ئەمەی ناردووە؟"

لە وەڵامدا دەڵێت:

"خانمێک ئەم پاکەتەی ناردووە و لەوە زیاتر ئاگام لە هیچ نییە."

من لە شوێنەکەی خۆم دەوەستم و نامەبەرەکەش ڕۆیشت، پارەکە دەخەمەوە ناو پاکەتەوە و پاکەتەکە گرمۆڵە دەکەم، ڕوودەکەمە ژنی خاوەنماڵ کە ئێستاش نیگەرانە و بێ ئەوەی هیچ بڵێم دەیگرمە ناوچاوی، پێش ئەوەی دوور بکەمەوە بینیم خەریکی سەیرکردنی پاکەتەکە گرمۆڵەکراوەکەیە...

هەر بەڕاستی ئەمە ئیشێکی پیاوانە و ئاقڵانەیە! مرۆڤ بێ ئەوەی لەگەڵ ئەم کەسە سووک و هیچوپووچانە دەستەویەخە بێت و یەک وشەیان لەگەڵ بڵێت، دەبێ بێباکانە پارەکە لە دەستیا گرمۆڵە بکات و بیگرێتە ناوچاوی ئەوانەی ئازاری دەدەن، ناوی ئەم کارە لەخۆبردوویی و گەورەییە و لەگەڵ چوارپێکاندا هەر ئەمە دەکرێت...

نوقمی ئەم بیرکردنەوانە بووم، کە گەیشتمە کۆڵانی تامت خۆم لە مەیدانی ئاسنەڕێدا بینیەوە، لەپڕ کۆڵانەکە بە دەوری سەرمدا خولایەوە و بەرچاوم ڕەش بوو، سەرم دەنگی دەدایەوە، پاڵم بە

دیـواری مـاڵیکەوە دا و بێهـۆش کەوتـم، هێـزی ڕۆیشـتم نەمـابوو و نەمـدەتوانی هـیچ هەوڵێـک بـۆ ڕزگـاربوونم بـدەم، پشـتم کردبـووە دیوارەکە و خەریکبوو دەبوورامەوە، برسێتیش خراپتری دەکردم و تـوڕەییەکەمی زیـاتر دەکـرد، پـێم بەرز کـردەوە و کێشـام بە شۆستەکەدا، بە هەموو شێوەیەک خۆم ناچار کرد بجووڵێم، بەڵکو ڕەنگە هێزی لەدەستچووم بدۆزمەوە، ددانەکانم لە یەکتر گیر دەکرد، ناوچاوم گرژ دەکرد و چاوەکانم بێهیوا ڕوو دەکردە هەموو لایەک، ئەم جووڵانە کەمکەم کاریگەرییان دەرکەوت، بە جۆرێک کە هەستم ئەوەندە ڕووناک بوویەوە، تێگەیشتم نزیکە بکەوم بە ئەرزا، پاڵم بە دیوارەکەوە نا و لە دیوارەکە دوورکەوتمەوە، کۆڵانەکەش لەگەڵ من دەخـولایەوە و سـەرم گێـژ بووبـوو، لە توڕەییـدا تووشـی نـزگەرە بووبووم، بەوپەڕی هێزەوە هەوڵی ڕزگاربوونی خۆم دەدا و تەقەلام بوو نەکەوم، حەزم نەدەکرد کەوتوو و ئاوەژوو بمرم، دەمویست بە پێوە و سەربەرز گیانم دەرچێت، ئەسپوعارەبانەیەک بە ئەسپایی بە بەردەممدا تێپەڕی، ئەگەرچی دەبینم بارەکەی پەتاتەیە، بە ئینکارییەوە بە خۆم دەڵێم ئەمە کەلەرمە نەک پەتاتە، سوێندی قورس دەخۆم کە بێگومـان بـاری عارەبـانەکە کەلەرمە، گوێم لە قسەکانی خۆم بـوو و بەردەوام درۆکەی خۆم بە سوێندەوە دووبارە دەکردەوە، تەنیا بەم جۆرە دڵخۆش و کەیفساز دەبووم.

پەنـجەم بەرز کـردەوە و بە لێـوی وشـک و لەرزۆکەوە، بە بـاوک و ڕۆحـی پیـرۆز سـوێندم خـوارد، کە بـاری عارەبـانەکە کەلەرمە و چێژێکـی زۆرم لەم گونـاهە ئاشـکرایەم وەردەگـرت، زۆری نەبـرد لە بەردەم پلیکانەکـانی بەردەم ماڵێـک کەوتـم، ئـارەقەی شـانومل و ناوچـاوم سـڕی و هەناسـەیەکی قـووڵم هەڵمـژی، بێجـووڵە و هـێمن مامەوە، هەتاو بە ئاسمانەوە و عەسریش نزیک بوو، دیسان دەستم بە بیرکـردنەوە کـرد لە چارەنووسـی خـۆم، بەڵـێ! بەرگەی برسـێتیم نەدەگرت و چەند سەعاتێکی تریش شـەو دادەهات، دەبوو تـا درەنـگ

نەبووە شتێک بکەم، بیرکردنەوە لەو ژوورەی لێی دەرکرابووم وازی لــێ نەدەهێنــام، ئەگەرچــی نەمدەویســت بگەڕێــمەوە بــۆ ئەوێ، بەڵام نەمدەتوانی بیریشی لێ نەکەمەوە.

ئێستا ئەگەر باش بیر بکەینەوە ژنەکە هەقی خۆی بوو دەری کردم، نــابێ چــاوەڕێ بــم بەخــۆڕایی شــوێن و مەنــزڵم بــداتێ، جگە لەوەش ناوبەنــاو خواردنی پێدەدام، تەنــانەت دوێنێشــەو کە ئەوەندە تووڕە بوو، دیسان دوو نانی مرەبایی بۆ هێنام، ئەمە جگە لە میهرەبانی هیچــی تر نیــیە، چــونکە خۆیشــی دەیزانــی کە زۆر برســیمە، کەواتە بــۆچی لە خۆمەوە گلەیی لێ بکەم؟

بەدەم دانیشتنەوە لە سەر پلیکانەکان، لە دەروونمــدا ڕووم تێدەکرد و تکام دەکرد بمبەخشــێت، بە تــایبەت زۆر بەداخ و پەشــیمان بــووم، کە نانخۆری سفرەدڕ بــووم و زەرفەکەم گرتە ناوچــاوی، لە ژێر لێوەوە دەموت دە کرۆن پارە! بە هێواشی فیکەم لــێ دەدا، لەم کــاتەدا زۆر بە ڕۆشنی بیرم لەو پارەیە دەکردەوە، لە خــۆم دەپرســی ئــاخۆ کێ ئەم پارەیەی ناردبێت، شتەکانم پێکەوە دەلکاند و گریمــانەی جۆراوجۆرم دەکرد، لەپڕ لە شەرمــا خەجاڵەت بووم و ناوی **ئیلایــالی**م هێنــا، مەگەر هەر دوێنێ بڕیارم نەدابوو ئەوپەڕی بێباک بم بۆ ئەو، لەخۆباییــانە بە بەردەمیدا بڕۆم، ئێستا دەبینم بەزەیی پێمدا هــاتۆتەوە، تەنــانەت ناچــار بووە خێرم پێ بکات، نەخێر سووکی و زەلیلی من نــابڕێتەوە! تەنــانەت لە بەرچــاوی ئەویــش کەوتــووم، پــێگەی بەرزی خــۆم لە بەرچاویــدا دۆڕانــــدوە، بە ئاشــــکرا کەوتنــــی خــــۆم دەبینــــی و لە هەر لایەکەوە دەڕۆیشــتم دەکەوتــمە ســەر ئەرز، ئیتــر جگە لە مــردن ڕێگەچــارەیەکم نەبــوو، لە بەدنــاوی و بێحەیاییــدا نــوقم بووبــووم، دەمزانــی لە پــێ کەوتــووم و هەرگیــز هەڵناســمەوە، قوڕبەســەری لەوە زیــاتر چیــیە، ئینسان دە کرۆن خێر وەربگرێت و خێرۆمەندەکە نەناسێت قەرەبووی بکــاتەوە؟ چ بەڵایەک لەوە گەورەترە پــارەکەت لە خــۆوە فــڕێ بــدەیت، یان بیپارێزیت و بێ ویستی خۆت بیدەیتە کرێی ماڵەکەت!

ئایا نەدەکرا هەر چۆنێک بێت ئەم دە کرۆن پارە فەوتاوە بگەڕێنمەوە؟ ڕۆیشتن بۆ میوانخانە و داواکردنی پارەکە بێگومان بێسوودە، ڕێگەیەکی تر هەیە، بەڵام دەبێ بیر بکەمەوە و زەحمەتی وردبوونەوە بدەم بە خۆم، خوایە مەسەلەکە چۆن ئاڵۆزکا! ڕێگەی ئاسایی سوودی نەبوو، دەبوو ئەقڵ و بەرچاوڕوونیی پیاوانەم بخەمە کار و ڕێگەچارەیەک بدۆزمەوە، ئەوسا بەوپەڕی توانامەوە بیرم لە ڕێگەچارەیەک کردەوە، دوو سەعاتی تر دەبووە چواری پاشنیوەڕۆ، لانیکەم دەمتوانم شانۆییەکەم تەواو بکەم و بەڕێوبەری هۆڵی شانۆ ببینم، خێرا ڕەشنووسەکەم لە گیرفانم دەرکرد، بڕیارم دا هەرچۆنێک بێت دیمەنی کۆتاییش بنووسم.

چەند زۆر لە مێشکم دەکەم و گیان دەدەم و ئارەقە دەڕژم هیچم بۆ نانووسرێت، قسە بە خۆم دەڵێم ئێستا کاتی قیرسیچمەیی نییە و تەرکیز بکە! لەناکاو بێ قەلەقی و وردبوونەوە دەست بە نووسین دەکەم، چیم بە خەیاڵدا بێت دەیخەمە سەر کاغەز، دەبوو خێرا بیبڕێنمەوە و بڕۆم، دەمویست لە خۆشم تێبگەیەنم کە زۆر باشم، بە ئاشکرا درۆم لەگەڵ خۆم دەکرد، بە جۆرێک خێرا دەمنووسی وەک ئەوەی بۆ وشە ناگەڕێم، لە بەرخۆمەوە دەڵێم بەڕاستی شێوازێکی باشت بۆ نووسین دۆزیوەتەوە، ئەم هەلە بقۆزەرەوە و چی لە دڵتدایە بینووسە و بیر لە هیچ مەکەرەوە! بەڵام گومانم لەم وشانەی کۆتایی هەبوو کە نووسیبووم، چونکە لەگەڵ دیالۆگەکانی دیمەنی یەکەمدا جیاوازییەکی زۆری هەیە، جگە لەوەش قسەی قەشەکە ڕەنگوبۆی سەدەکانی ناوەڕاستی نییە، بە یەک جووڵە لە جێگەکەم دەردەپەڕم و قەڵەکەم لە بەینی ددانما دەشکێنم، کاغەز و نووسینەکان هەمووی دەدڕێنم، کڵاوەکەم فڕێ دەدەمە سەر شەقامەکە و دەیەخەمە ژێر قاچم، بەدەم پانکردنەوەی کڵاوەکەوە هاوار دەکەم:

"ئەی پیاوان، ئەی ژنان! بەڕێزان! بزانن و ئاگادار بن کە من لە ناوچووم، من تێکشکام!"

دواتر بێدەنگ دەبم و دەم ناکەمەوە.
پۆلیس چەند هەنگاوێک دوورتر وەستاوە و تەماشام دەکات، ڕێک لە ناوەڕاستی شەقامەکە چەقیوە و چاوی تێبڕیوم، کە سەر هەڵدەبڕم چاومان لە یەکتر گیر دەبێت، ڕەنگە ماوەیەکی زۆرتریش سەیری کردبێتم؟ کڵاوەکەم لە سەر ئەرزەکە هەڵدەگرمەوە و ڕێک دەڕۆمە لای و لێی دەپرسم:
"سەعات چەندە؟"
کەمێک دەوەستێت و دواتر سەعاتەکەی دەردەهێنێت و بە چاوی ڕاماوەوە دەڵێت:
"نزیکەی سەعات چوارە."
وتم:
"زۆرباشە، نزیکەی چوارە، زۆر ڕاست دەفەرموون و دیارە باش ئاگاتان لە ئیشەکەی خۆتانە، ئەم یارمەتییەی جەنابتانم بیر ناچێت."
ئەمەم وت و لێی دوورکەوتمەوە، بە جووڵەکانی من وا حەپەسابوو، کە بە دەمی داچەقاو چاوی لەسەر هەڵنەدەگرتم، کە گەیشتمە بەردەم **ئوتێل ڕۆیاڵ** گەڕامەوە و دیسان سەیری دواوەم کرد، بەڵێ، لەگەڵ چوارپێ دەبێ بەم جۆرە ڕەفتار بکەیت و بە زمانی ناشیرینی خۆیان قسەیان لەگەڵ بکەیت، ئەم شێوازەیە کە کار لە حەیوانەکان دەکات و ملکەچ و بێدەنگیان دەکات... زۆر دڵم بەمە خۆش دەبێت و لەژێر لێوەوە دەستم کرد بە گۆرانییەک، ئەعسابم وا ورووژابوو کە هەستم بە بچووکترین دەرد و ئازار نەدەکرد، هیچ قەلەقییەکم نەبوو، وەک پەڕەکایەک هێمن و سووکەڵە دەڕۆیشتم، بە هەموو بازاڕدا تێپەڕیم و دواتر بەرەو **عەمباری گۆشت** پێچم کردەوە، لای کڵێسای **ڤۆرفێلسرن** لە سەر کورسییەک دانیشتم، ئەی ناردنی پارەکە سوودی چی بوو، چونکە بێگومان کەسێکی دەستکورت و هەژار نەیناردووە و ئێستاش بووە بە هی من.

هەروەها نابێ لە وەرگرتنی دوودڵ بم، چونکە ڕێکورەوان و ئاشکرا بۆ من ڕەوانە کرابوو، ئەگەرنا پیاوە نەناسەکە هەڵی دەگرێت، جگە لەوەش ئەگەر مەبەستێکی وام هەبوایە ئەو پارەیەم دەگەڕاندەوە، ئێستا ئیتر کار لە کار ترازابوو، هەوڵم دا خۆم بە شتی پڕوپووچەوە سەرقاڵ بکەم، واز لەم خەیالاتە بێنم و خۆم بە سەیری خەڵکی ناو بازاڕەوە بخەڵەتێنم، بەڵام بەردەوام دالغەم دەگەڕایەوە بۆ پارە دە کرۆنییەکە و نەمتوانی لە خەیاڵمی دەربکەم، دواجار پەنجەکانم گرێدا و بە توڕەییەوە وتم ئەگەر پارەکە بگەڕێنمەوە بێگومان پێی ناخۆش دەبێت، ئەی من چی بکەم؟

بۆ دەبێ هەمیشە خۆم لەخۆبایی و سەربەرز دەربخەم، لە بەردەم هەموو شتێک بەوپەڕی نەفسبەرزییەوە سەر ڕاوەشێنم و بڵێم نەخێر سوپاس نامەوێت! ئێستا بە چاوی خۆم دەمبینی ئەم لە خۆبردووییەوە دەگاتە کوێ، ئاکامەکەشی ئەوەیە ئێستا دەبێ بە کۆڵان و بازاڕدا سەرگەردان بم، چونکە تەنانەت باشترین هەلیشم نەقۆستەوە، بە بچووکترین قسە هەڵدەچووم و ملم بۆ لەخۆباییبوون و ئینکاری دەدا، لە کۆتاییشدا دە کرۆنەکەم لە خۆمەوە لە کیس چوو و ڕۆیشتم... لەم کاتەدا زۆر بە قورسی خۆم سەرکۆنە دەکرد، کە بۆچی بێ هیچ هۆکارێک ژووری میوانخانەکەم چۆڵ کرد، دیسان خۆم تووشی ئەم بەڵا و سەرگەردانییە کرد.

بەڵام ئیتر پەشیمانی سوودی نابێت، چونکە ئەم دە کرۆنەم بە زۆر وەرنەگرتبوو، ئەوکاتەش گەیشتبوومە دەستم بەخشیم بە کەسانێک کە هەرگیز نایانبینمەوە و دەستم لێ شۆرد، بەڵێ کێشەکە ئەخلاقی خۆم بوو، من لەو کەسانە بووم کە لەوپەڕی دارمانەدا مستیلە زومرودەکەی خۆیان لە پەنجە دەردەهێنن و دەیبەخشن، ئەخلاقی ئیلایالیشم باش دەناسی و دەمزانی پەشیمان نییە کە ئەو پارەیەی ناردووە، کەواتە بۆچی دەبێ مەسەلەکە ئەوەندە گەورە بکەم و سەری خۆم بێنمە ژان، ڕەنگە لای خۆی وابیری کردۆتەوە کەمترین

یارمەتییەک بتوانێت پێشکەشم بکات ئەوەیە جاروبار دە کرۆنم بۆ بنێرێت، داماوە عاشق و شەیدای من بووە و تەنانەت گیانی خۆشی لەم پێناوەدا دەبەخشی! بەم خەیاڵە پاکەوە لە خۆم تورە بووم و خۆم گەورەتر هاتە پێش چاو، بێگومان ئەم کچە داماوە منی خۆش دەویست...

سەعات پێنجی عەسر بوو، پاش ئەو شڵەژانە و خرۆشانە زۆرە، دیسان ناو سەرم دەنگی دەدایەوە و کەوتمە سەر زەوی و بە چاوی ماتەوە لە بەرامبەرم سەیری دەرمانخانەی **فیل**م دەکرد، برسێتی بەوپەڕی توندوتیژییەوە وێرانی کردبووم و زۆر ئازام دەچەشت، لەپڕ لە بەرچاوی مات و لێڵم دەموچاوێک کەمکەم و بەهێواشی دەردەکەوێت، ئاشکرا دەبێت و دەیناسمەوە؛ ئەمە دەموچاوی ژنی شیرینیفرۆشە کە لای دەرمانخانی **فیل** دانیشتووە! دەحەپەسێم و لە سەر کورسییەکە هەڵدەسم و بیر دەکەمەوە، نەخێر هەڵەم نەکردووە، هەر ئەو ژنەیە کە لە بەردەم هەمان مێز و هەمان شوێن دانیشتووە، لەتاو واقوڕمان چەند فیکەیەکی کورت لێ دەدەم و پەنجەکانم لە یەک گیر دەکەم، هەڵدەسم و بەرەو دەرمانخانەکە دەڕۆم و بە خۆم دەڵێم: خۆت بێ ئەقڵ مەکە! بۆ تۆ دراوی باوی وڵاتی نەرویج و پارەی **کێنگسبێرگ** گرنگە، ئیتر ئەم پارەیە هیی شاگردی بەقاڵەکە بێت یان پارەی پاکی بەقاڵەکە، خۆی کەی کێشەیە! لە خۆمەوە نابێ خۆم نەجیب و بێوەی دەربخەم، لەخۆباییبونی ختوخۆڕایی بەم گەنجییە دەمکوژێت و لەبەر هیچ خۆت تیا دەبەی...

سەیری ژنەکە دەکەم و دەڕۆمە پێشەوە و لە بەردەمی دەوەستم، بزەیەک دەکەم و بە جۆرێک قسە دادمەزرێنم، وەک ئەوەی بڕیار وابووە هەر ڕۆژێک بگەڕێمەوە بۆ لای.

سڵاوم کرد و پرسیم:

"نامناسیتەوە؟"

بەدەم سەیرکردنەوە بە هێواشی وتی:

- "نەخێر."

دیسان بزەیەکی زیاترم خستە سەر لێوم و خۆم وادەرخست قسەکەی بە جیدی وەرناگرم و وتم:

- "بیرت نییە جارێک چنگێک پارەم پێدای؟ ئەگەر لە بیرم نەچووبێت ئەوکاتەش هیچم نەوت، چونکە ڕانەهاتووم لەو کاتانەدا هیچ بڵێم، ئەگەر بزانێت سەروکارت لەگەڵ کەسێکی پاک و بێوەیدایە، بێگومان گفتی لێوەرناگرێت و بۆ ئەم پارە کەمەش وەسڵیان لێ وەرناگرێت، بەڵام لە بیرمە من بە دەستی خۆم ئەو پارەیەم پێدای..."

شیرینفرۆش وەڵامی دایەوە:

- "کەواتە ئەوە تۆ بووی ئەها! ئێستا باش ئێوەم بیر کەوتەوە."

بۆ ئەوەی دەستپێشخەری بکەم و نەهێڵم سوپاسم بکات و منەتباری نەکەم، لە کاتێکدا بە چاو بۆ خواردنێک لە سەر سینییەکەی دەگەڕام، بێ پێشەکی وتم:

- "ئێستا کەمێک شیرینیم دەوێت."

لەبەرئەوەی لە مەبەستی دەروونیی من تێناگات، قسەکەم دەست پێدەکەمەوە و دەڵێم:

- "بەڵێ ئێستا هاتووم شیرینی ببەم، بەهەرحاڵ لەبەرئەوەی ئەمڕۆ هەموو شیرینییەکانم ناوێت جارێ کەمێک وەک قیستی یەکەمی قەرزەکەم هەڵدەگرم."

پرسی:

- "کەواتە بۆ بردنی شیرینی هاتووی؟"

من قاقا پێکەنیم، چونکە وام دەزانی مەسەلەکە وەک ڕۆژ ڕووناکە.

- "بێگومان بۆ بردنی شیرینی هاتووم... ئەمە پرسیاری بۆچییە."

یەکسەر شیرینییەکی نەرم لە سەر مێزەکە هەڵدەگرم و دەست دەکەم بە خواردن، ژنەکە کە ئەم وەزعە دەبینێت بێگومان بێدەنگ دانانیشێت و بۆ پاراستنی کەسابەتەکەی تەقەلا دەکات، تێم دەگەیەنێت کە بە هیچ شێوەیەک ئامادە نیم هەموو شتەکانی تاڵان بکەم.

"بەڕاستی ڕازی نیت؟"

بینیم کە ژنە داماوەکە نیوەگیانە و بە حاڵ ڕۆحی تیا ماوە، لە هەموو تەمەنیدا شتی وای نەبینیوە کەسێک خێری پێ بکات و لە بەرامبەردا شتێکی لێ داوا بکات، ڕەنگە وای زانیبێت منیش ئەو پارەیەم لە شوێنێک دزیوە، بۆیە ئاوا دەستبڵاو و بێباک پارەکەم خستە چنگییەوە، هەڵبەت دەبێ شکور بم کە ئاوا خراپ بیری لە من کردبووەوە، تاکە گەورەییەک لە هەقی مندا نواندی ئەوە بوو، کە لانیکەم بە کەسێکی پاک و بێوەیی زانیم، هەر بەڕاستی ڕەحمەت لە باوکی ژنێکی چاک بوو!

کە گەیشتمە ئێرە پرسیارم کرد:

"ئەی کەواتە خۆ نەخۆش نەبووم پارەی بەلاش بخەمە دەستتانەوە؟"

یەکسەر ژنەکە هەڵچوو و هاتوهاواری نایەوە، بەناچاری خێرا بۆم ڕوون کردەوە ئەم پارەیەم بۆیە ئاوا بە بەلاش خستۆتە بەردەمی، چونکە من خۆم بە مرۆڤایەتی گەشبینم و داوای بەڵگەنامە و گرێبەست لە کەس ناکەم، بۆ قەرزەکانیشم وەسڵی لێ وەرناگرم، خوا ئاگادارە لەگەڵ هەموان ئاوا مامەڵە دەکەم، بەلام ئەی هاوار ژنەکە لەم شتانە حاڵی نابێت، دواتر ڕێگەیەکی ترم گرتەبەر، یانی بۆ ئەوەی لەو وەهمە دەریبهێنم پرسیارم کرد:

"ئایا تا ئێستا کەس بێ وەسڵ و کاغەز قەرزی پێنەداون، کە دواتر داوای بکاتەوە، بۆ نموونە تا ئێستا ئێشت لەگەڵ ئەو بزنسمانە دەوڵەمەندانە نەکردووە؟ گریمان تۆ ئاگاداری ئەم مامەڵە بێ بەڵگانە نیت، بۆچی دەبێ زەرەرەکەی بۆ من بێت و سزاکەی وەربگرم؟ لە هەندەرانیش ئەم جۆرە مامەڵانە زۆر کۆن و باوە."

بەلام ڕەنگە ئەو هێشتا پێی نەخستبێتە ئەو دیو سنووری ئەم وڵاتەوە، نا! هەر بەڕاستی ناخۆشی کردووە و هەر لە حسابوکتاب تێناگات!... دیسان چەند شیرینییەکم لە سەر مێزەکە هەڵگرت، ژنەکە بە تووڕەییەوە بۆڵاندی و نەیهێشت دەست بۆ مێزەکەی ببەم، تەنانەت

یەکێک لە شیرینییەکانی لە دەستم سەند و خستییەوە شوێنی خۆی، ئەوەندە تورە بووم کە کێشام بەسەر مێزەکەدا، هەڕەشەم لێکرد پۆلیس بانگ دەکەم و پێم وت زۆر خاترم گرتووە، چونکە ئەگەر بمەوێت هەموو قەرزەکەم وەربگرمەوە، دەبێ هەموو ئەوەی هەیەتی لەبری پارەکەم لێی وەربگرم، بەڵام بێویژدان نەبووم و تەنیا بە قەد نیوەی قەرزەکەم شتم دەویست، دوای ئەوەش دەمدایە دەست خوا، بەڵام خوا فریام بکەوێ چونکە ئەم ژنە لە بێحەیاکان بوو!

لە کۆتاییدا چوار پێنج دانە شیرینی هەڵگرت، دوای ئەوەی گرانترین نرخی (گرانترین نرخ تا ئەو سەردەمە) خستە سەر و پێی دام، داوای لێکردم بڕۆم و لە کۆڵی ببمەوە، منیش بە بیانووی ئەوەی قۆڵی بڕیوم و کرۆنێک لێ خواردووم چەلەحانێم لەگەڵ کرد و وتم:

- "دەزانی ئەم جۆرە دەستبڕینە سزای یاسایی هەیە؟ ئەی پیرەژنی بێمێشک! دەزانی مەگەر خوا فریا بکەوێت، ئەگەرنا بەوجۆرە تا کۆتایی تەمەن لە زیندان و تاراوگە دەژی."

شیرینییەکی تری بۆ هەڵدام و بەدەم جیڕکردنەوەی ددانەکانی دیسان داوای کرد لە کۆڵی ببمەوە، منیش لەوە زیاتر زۆرم لێ نەکرد و ڕۆیشتم، هەرگیز کاسبێکی ئاوا بێچاوڕووم نەبینیبوو، دواتر لە کاتێکدا شیرینییەکە لە دەمما بوو و بە بازاڕدا دەڕیشتم، بە دەنگی بەرز قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد، بیری بێشەرمی و بێحەیایی ئەو ژنەم دەکەوتەوە، هەموو ئەو قسانەی پێکەوە کردبوومان دەموتەوە و خۆشحاڵ بووم، کە باش هەقی خۆم لێ وەرگرتەوە و هاوکات بەشی پیاوەتی و جوامێریم تیا هێشتبووەوە، بە زمانی خۆم بەسەرهاتەکەم دەگێڕایەوە، لە بەردەم چاوی هەموو خەڵکی شیرینییەکانم یەک لەدوای یەک دەخستە دەممەوە و دەمخوارد، دەتوت تێر نابم و ئەوەی دەمخوارد سوودی نەبوو، ئەوەندە هار بووبووم کە زۆری نەمابوو پەلاماری شیرینیفرۆشێکی تر بدەم، چونکە هەر لە سەرەتاوە نییەتم ئەوە بوو یەکێکیان هەڵبگرم بۆ ئەو کوڕەبچووکەی کۆڵانی

ولاخدارەکان، کە پیرەپیاوە ڕیشخەنەییەکە تفی ڕۆدەکردە سەر سەری، دەموچاوی لە بەرچاوم بوو، حاڵەتە تایبەتییەکەشی ئەوکاتەی لە جێگەکەی دەرپەڕی و بە گریانەوە جنێوی دەدا لە بیرم نەدەچوو، ئەو کاتەی پیاوەکە تفی بۆ هەڵدا، ڕووی کردە پەنجەرەکەی منیش و دەیویست بزانێت منیش بەم کارەی پێدەکەنم یان نا، بەلام دڵنیا نەبووم هێشتا لە کۆڵانەکە مابێت، هەوڵم دا زووتر خۆم بگەیەنمە کۆڵانی ولاخدارەکان، لەو شوێنەی کە لەوێ نووسینەکەم دڕاندبوو تێپەڕیم، هێشتا چەند پارچە کاغەزێکی لێ مابوو، بەلای ئەو پاسەوانەش کە ڕەفتار و جووڵەکانم حەپەساندبووی ڕۆیشتم، دواجار گەیشتمە ئەو پلیکانەیەی کە کوڕە منداڵەکە لە سەری دانیشتبوو، بەلام کۆڵانەکە چۆڵ بوو و منداڵەکەم نەمبینی، ڕەنگە ڕۆیشتبێتە ماڵەوە، بەهەرحاڵ شیرینییەکەم بە وریایی لە پشت دەرگای ماڵەکەیان دانا و بە توندی پیامکێشا و ڕۆیشتم، بێگومان شیرینییەکە دەگاتە دەستی! ڕەنگە کە لە ماڵەوە هاتە دەرەوە یەکەم ئیشی ئەوە بێت شیرینییەکە هەڵبگرێت، بە بیرکردنەوەی لەمە دڵخۆشییەکی پووچ و بێمانام بۆ دروست بوو، دیسانەوە گەڕامەوە بۆ مەیدانی ئاسنەڕێ، برسێتیم نەمابوو، بەلام شیرینییەکە دڵی خستبوومە پەلەپەل، دیسانەوە بیرکردنەوەی شێتانە و شێواو لە مێشکمدا تێکەڵوپێکەڵ دەبوون، بۆ نموونە لە کەللەی دام بێ ئەوەی کەس بزانێت گوریسی یەکێک لە کەشتییەکان ببڕم، تەنانەت بیرم لەوە کردەوە لە خۆمەوە هاوار بکەم هۆی خەڵکینە وەرن گڕی گرت! لای دەریاکە هەنگاو دەنا و دەمەوێ سندوقێک بدۆزمەوە و لە سەری دابنیشم و کەمێک بحەوێمەوە، دەستەکانم خستە سەر یەک و هەستم دەکرد کەمکەم خەریکە حاڵم تێکەچێت و سەرم دەخولێتەوە، بچووکترین جووڵە ناکەم هیچ جۆرە بەرگرییەک ناکەم بۆ ئەوەی بە پێوە بمێنمەوە و نەکەوم.

له سووچێک وەستام و چاو له کەشتییەکی گەورەی ڕووسی، که سێ دووکەڵکێشــی هەیه هەڵنــاگرم، لەم کــاتەدا کەســێک دەبیــنم لای کەشـتییەکه وەسـتاوه و چـرای سـووری سـەر جەسـتەی کەشـتییەکه لەسەرەوه، دەموچاوی ڕووناک کردۆتەوه، هەڵدەسم و دەڕۆمه لای و بێ مەبەستی پێشوەخت قسەی لەگەڵ دادەمەزرێنم، تەنانەت چاوەڕێی وەڵامیش ناکەم.

- "جەنابی کاپتن ئەمشەو کەشتییەکه دەڕوات؟"
- "بەڵێ زۆری نەماوه بۆ ڕۆیشتن"

لەبەرئەوەی به زمـانی سـویدی قسـەی دەکـرد، به خـۆم وت ڕەنـگه خەڵکی فینلاند بێت.

دیسان پرسیم:

- "ئێوه بۆ کاروباری کەشتی پێویستتان به کەس نییه؟"

وەڵامەکەی بەلامەوه یەکسـان بـوو و ئەگەر قبـوڵی بکـردایه یـان نـا، جیـاوازی نەبـوو بەلامەوه، تەنیـا سـەیرم دەکـرد و چـاوەڕێی وەڵام بووم.

- "جـارێ نـا، مەگەر ئەوەی کەسـێکی نەشـارەزا بێـت، مەبەسـتم ئەوەیه پسپۆڕ نەبێت و کاری ئاسایی بکات."

به بیســتنی ئەم وەڵامه خـۆم قیتـوقنج کـردەوه، بـێ ئەوەی بزانێـت چاویلکەکەم داگرت و خستمه گیرفانمەوه، دواتر پلیکانەی کەشتییەکەم ڕەت کرد و ڕۆیشتمه ئەولاتر و وتم:

- "مـن له کـاری تەکنیکیـی کەشـتی نـازانم، بەلام کـاری تـر چـی بڵـێن دەیکەم، تەنها پێم بڵێن کەشتییەکه بەرەو کوێ دەڕوات؟"
- "ئێمه بەرەو خۆرهەلات و بەندەری **لیدز**[١] دەڕۆین، لەوێ خەڵوز بـار دەکەین و دەیبەین بۆ **قادس**[٢]."

---

[١] Leeds: یەکێک له بەندەره بەناوبانگەکانی کەناری خۆرهەلاتی ئینگلتەرا. (و.ف)

[٢] Cadix: یەکێک له بەندەر و شـاره مێژووییەکانی ئەندلوسـی ئیسـپانیا، که کەنـاری زەریای ئەتڵەسیدایه. (و.ف)

لەبەرئەوەی دەمویست هەرچۆنێک بێت خۆم بسەپێنم بەسەر پیاوەکەدا وتم:
"زۆرباشە، کەشتییەکە بۆ کوێ بڕوات گرنگ نییە، چونکە من خەریکی کاری خۆم دەبم."
ماوەیەک وەستا، سەیری کردم و کەوتە بیرکردنەوەوە. لێی پرسیم:
"تا ئێستا دەریاوانیت نەکردووە؟"
"نەخێر، بەڵام چیم پێ بڵێن دەیکەم چونکە هەموو شتێکم کردووە."
ئەو دیسان کەوتەوە بیرکردنەوە، ڕۆیشتنەکەم بە ئاشکرا و یەکلابووەوە دەزانی، بۆیە لە گومانەکەی ترسام و نەوەک لە کەشتییەکە دامبەزێنێت، لە کۆتاییدا پرسیارم کرد:
"ئیتر نازانم ڕای جەنابتان چییە، بەڕاستی هەموو شتێک دەکەم، ڕەنگە تاڕادەیەکیش ئەو ئیشەی پێم دەسپێرن بتوانم بیکەم، چیتان عەزر بکەم؟ بۆ نموونە دەتوانم دوو شەفت یانی هەشت سەعات نەخەوم و بحەپێنم.
ئەم قسەیەم خستییە پێکەنین و وتی:
"ئێستا با بزانین، بەهەرحاڵ ئەگەر کارەکەت باش نەبوو، کە گەیشتینە کەنارەکانی ئینگلتەرا داتدەبەزێنین و بەجێت دەهێڵین."
منی بردە ناو کەشتییەکە و ئیشێکی پێ سپاردم.

*****

ئەوکاتەی کەشتییەکە لە فیۆردەوە[1] تێپەڕی، کەمێک بە پێوە وەستام و لە کاتێکدا بە دەست ماندوویی و تاوە، سەر تا پێم بە ئارەقە خووسابوو، سەیرێکی وشکانییم کرد وماڵئاواییم لە شاری "کریستیانیا" کرد، شارێک کە دەرچە و پەنجەرەی ماڵەکانی نوقمی ڕووناکی بوون، ڕووناکییەکی سەیر لە دەرگا و دیوارەکەی دەچۆڕا.

---

[1] Fjord: کەنداوە تەنگەبەر و قووڵەکانی کەنارەکانی نەرویج، لەبەرئەوەی ئەم وشەیە تەنیا تایبەتە بە نەرویج وەک خۆی دامانناوە.

# هونەری برسێتی

به قەڵەمی پۆل ئاوستەر

*"پێم وایە ئەوەی گرنگە بەرگری نییە لەو کلتوورەی کە بوونەکەی تا ئێستا سکی برسییەکی تێر نەکردووە، بەڵکو هەڵگۆزینی ئایدیایە لە دڵی ئەو شتەی پێی دەوترێت کلتوور، کە هێزە سەرسوڕهێنەرەکەیان لە ئاستی هێزی برسێتییدایە."*

(ئەنتۆن ئارتۆ)

پیاوێک پێی دەنێتە شارەوە، ناوی نییە، ماڵی نییە، ئیشوکاری نییە، هاتۆتە ئەم شارەوە تا بنووسێت، ئەو دەنووسێت، یان بە مانایەکی وردتر ئەو نانووسێت. ئەو تا ئاستی مردن برسێتی دەچێژێت.
ئەم شارە **کریستیانیا** (ئۆسلۆ)یە، ساڵی ١٨٩٠ پیاوەکە لە شەقامەکاندا پیاسە دەکات، شارەکە تووناوتونی برسێتییە و هەموو ڕۆژەکانی پیاوەکەش یەکسانن، ئەو بۆ ڕۆژنامەیەکی نیوخۆیی، بێ داوای ڕۆژنامەکە، وتار دەنووسێت، نیگەرانیی کرێماڵەکەیەتی، نیگەرانیی جلوبەرگە شڕەکەی، نیگەرانی دەستخستنی خواردنێک بۆ ژەمی دواتر، ئەو ئازار دەچێژێت، بە نزیکەیی دەگاتە ئاستی شێتبوون، هەمیشە تەنیا یەک هەنگاو لە کەوتنی تەواو دوورە.

بەڵام هەر دەنووسێت، ناوبەناو سەردەکەوێت و پاداشتی وتارێک وەردەگرێت، تا لیقەومانەکەی بە شێوەیەکی کاتی دوابخات، بەڵام ئەو لەوە لاوازترە کە بەردەوام بنووسێت، بە دەگمەن دەتوانێت ئەو برگانەی دەستی پێکردووە تەواو بکات، لەناو ئەم بەرهەمە تەواونەکراوانەیدا، چەند نووسینێک هەیە بە ناوەکانی "تاوانەکانی ئایندە، وتارێکی فەلسەفی دەربارەی ئازادیی ئیرادە، چیرۆکێک دەربارەی ئاگرکەوتنەوە لە کتێبفرۆشیدا (کتێبەکان هەمان مێشکەکانن)، شانۆنامەیەک کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕوودەدات بە ناوی **نیشانەی خاچ**، ئەم ڕەوتە بەردەوام دەبێت؛ دەبێ شتێک بخوات بۆ ئەوەی بتوانێت بنووسێت، بەڵام ئەگەر نەتوانێت بنووسێت، ناشتوانێت هیچ بخوات و ئەگەر نەتوانێت بخوات، ناشتوانێت بنووسێت، ناتوانێت بنووسێت.

دەنووسێت، دەنووسێت، لە شەقامەکانی شاردا پیاسە دەکات، لە ناو خەڵکدا لە بەرخۆیەوە و لەگەڵ خۆی قسە دەکات، خەڵکی دەترسێنێت و دەیانتۆرێنێت، کە بەڕێکەوت پارەیەکی دەست دەکەوێت، بە فیڕۆی دەدات، لە ژوورەکەی دەری دەکەن، دەخوات و ئەوەی خواردوویەتی دیرشێنێتەوە، ماوەیەک کورت لەگەڵ کچێک دەبێت، بەڵام ئەنجامەکەی هیچ نییە جگە لە سووکایەتی، برسێتی دەچێژێت، جنێو بە هەموو جیهان دەدات، نامرێت، لە کۆتاییدا بێ ئەوەی بزانین بۆچی، سوار کەشتییەک دەبێت و شارەکە بەجێ دەهێڵێت.

ئەمە پەیکەری یەکەمین ڕۆمانی **کنۆت هامسۆن**ـە بە ناوی **برسێتی**، ئەم ڕۆمانە بەرهەمێک بێ پلۆت، بێ ڕووداو و بێ پاڵەوانە (جگە لە گێڕەوەی ڕۆمانەکە)، بە پێوەرەکانی سەدەی نۆزدە، بەرهەمێکە کە هیچی تێدا ڕوونادات، زەینی ڕادیکاڵی گێڕەرەوە بێ دوودڵی و قەلەقییەکانی ڕۆمانی کۆن لەبەرچاو ناگرێت، وەکو کاراکتەری ڕۆمانەکە کە دەیەوێت بۆ بەرکەوتن لەگەڵ مەسەلەی شوێن و کات، لە وتارێکیدا "ناوبڕێکی نادیار" دروست بکات، هامسۆنیش لەوەدا

سەردەکەویت خۆی لە کاتی میژوویی (کە بنەڕەتی سەرەکی ڕۆمانی سەدەی نۆزدەیەمە) ڕزگار بکات، ئەو تەنها ناخۆشترین ململانێکانی پاڵەوانەکەی لەگەڵ برسیتیدا دەگیڕێتەوە، هەندێ ڕۆژی قورسیش کە برسیتییەکە نەماوە (سەرباری ئەوەی کە هەندێ جار ئەم ڕۆژانە تەنانەت زیاد لە هەفتەیەک دەخایەنن)، بەڵام بە یەک دوو دێڕی کورت لیی دەگوزەریت، کاتی میژوویی لە بەرژەوەندی کاتی دەروونیدا کشاوەتەوە، ڕۆمانەکە بە دەستپێکێکی خۆویستانە و کۆتاییەکی خۆویستانە، بە وەفایەکی تەواوەوە خەریکی وردەکاریی هەموو مەیلەکانی زەینی گێڕەرەوە دەبێت، هەموو بیرکردنەوەیەک لە خاڵی پرنهێنییەوە، لەو پێچوپەنایانەی کە لێی تێپەڕ دەبێت، شیتەڵ دەکات تا ئەوەی لەیەک بپسێت و بیرکردنەوەیەکی تر دەست پێ بکات، ئەوەی ڕوودەدات، ڕێگەی پێ دراوە ڕووبدات.

ئەم ڕۆمانە تەنانەت بانگەشەی ئەوە ناکات، کە نرخێکی کۆمەڵایەتی ڕزگاریبەخشی هەیە، ئەگەرچی برسیتی دەمانباتە هەناوی لێقەومان و چارەڕەشییەوە، بەڵام بە زۆری شیکاری بۆ ناکات، هیچ بانگەشەیەک بۆ کردەی سیاسی ناکات، هامسۆن، کە لە پیریدا و لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم ڕووی لە فاشیزم کرد، هەرگیز خۆی لە قەرەی کیشەی نایەکسانی و چینایەتی نەدا، پاڵەوان/گێڕەرەوەکەشی وەک ڕاسکۆلینکۆفی دۆستۆیڤسکی زیاتر دێسویکی ڕۆشنبیرانەیە نەک کەسێکی ستەملێکراو، لە برسیتیدا بەزەیی جێی نابێتەوە، پاڵەوان ئازار دەچێژێت، بەڵام تەنیا لەبەرئەوەی کە ئازاری هەڵبژاردووە؛ هونەری هامسۆن بە جۆرێکە کە بە توندی نایەڵێت هاوسۆزی پاڵەوانی ڕۆمانەکەی بین، هەر لە سەرەتاوە ڕای دەگەیەنێت پاڵەوانەکەی پێویستی بە چەشتنی برسیتی نییە، ڕێگەچارەیەک هەیە، لە شاریشدا نەبێت، لە دوورکەوتنەوە لیی، بەڵام کوڕە گەنجەکە بە ڕەفتارگەلێک، کە بنەماکەی غروری خۆوێرانکەر و وەسواسییە، بەردەوام گاڵتە بە بەرژەوەندیی و مەیلەکانی خۆی دەکات.

*"دەستم کرد بە ڕاکردن، بە غار کۆڵان و شەقامەکانم تەی دەکرد و قسەم بەخۆم دەوت، هەرکات توانام نەدەما و مەیلی وەستانم دەکرد، بەوپەڕی تــوڕەییەوە بە گــژ خۆمــدا دەچــوومەوە، لە کەینــوبەینەدا گەیشتمە سەرەوەی کۆڵانی پایل، بەناچاری وەستام، چونکە ئیدی توانای ڕاکردنم نەبوو و زۆری نەمابوو بگریم، هەموو گیانم دەلەرزی و ئەوەنـدە شـەکەت بـووم، لە بەرپلیکـانەی ماڵێکـدا کەوتـم، فەرمـانی وەستانم بە خـۆم دا و بۆ ئەوەی باش ئـازار بچێژم، بە یەک جـووڵە هەستام و خۆم ناچار بە وەستان کرد، لەم کاتەدا بە خـۆم پێدەکەنیم و لەزەتم لەو ماندووبیە زۆرەم وەردەگرت، دواجـار مـاوەیەکی زۆری خایاند کە بە جووڵەی سەر مۆڵەتی دانیشتنم بە خۆم دا، بەڵام دیسان ناخۆشترین شوێنی سەر پلیکانەکانم هەڵبژارد".*

ئەو لە خۆیدا بۆ ئاستەمترین شتەکان دەگەڕێت، تەمەننـای ئـازار و ناخۆشـی دەکـات، وەک چۆن خەڵکـانی تـر عەوداڵـی لەزەتـن، برسـێتی دەچێژێـت، نەک لەبەرئەوەی ناچــارە، بەڵکــو لەبەر قێزهــاتنەوەیەکی دەروونــی، وەک ئەوەی دژ بە خــۆی دەســتی بە مــانگرتن کــردووە، بەرلەوەی کتێبەکە دەست پێ بکات، بەرلەوەی خوێنەر ببێتە بینەرێکی فەخـری بۆ ئاکامەکەی، ڕەوتـی کردار و کارەکـانی پاڵەوانەکە دیـاری کراون، پرۆسـەیەک پێشـوەخت دەسـتی پێکردوە، ئەگەرچـی قارەمـان ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات، بەو مانایە نییە کە نازانێت چی دەکات.

*"ئەگەرچی لەوکاتەدا ئاگام لە خۆم نەمابوو، گیرۆدەی هێزێکـی سـەیر و تەمومژاوی بووم، بەڵام بچووکترین شتم لە دەوروبەرمدا دەبینـی و ئاگاداری بووم".*

ئەو خۆی خزاندۆتە نێو گۆشـەگیرییەکی تەواوەوە، لە یەک کاتدا دەبێتە سـوبێکت و ئـۆبێکتی ئەزمـوونەکەی، ئەم دابـڕانە بەهـۆی برسـێتییەوە سەردەگرێت، کە بە مانایەک ڕایەڵی هۆشیارییەکی گۆڕاوە.

*"بە دروستی وردبووبوومەوە، هەر کات ماوەیەکی زۆر برسێتیم بچەشتایە، مێشکم بەهێواشی لە ئیش دەکەوت و لەناو کاسەسەرمدا بەتاڵ دەبوویەوە، کاسەسەرم ئەوەندە بۆش و سووکەڵە دەبوو، کە قورساییەکەیم لەسەر لەشم هەست پێنەدەکرد، وەک ئەوەی جەستەم سەری پێوە نەمابێت..."*

بەڵام ئەگەر ئەمە تاقیکردنەوەیەکیش بێت، **هیچ پەیوەندییەکی** بە میتۆدی زانستییەوە نییە، **هیچ کۆنترۆڵێک، هیچ خاڵێکی گەڕانەوە** بۆ پەنابردن بوونی نییە، تەنیا و تەنیا گۆڕاوەکان بوونیان هەیە، بەڵام ناتوانین جیابوونەوەی زەین و جەستەش کورت بکەینەوە بۆ ئەبستراکتێکی فەلسەفی، ئێمە لێرەدا لە پانتایی ئایدیا و بیرکردنەوەدا نین، ئەم دۆخە جەستەییە کە لە ژێر کاریگەریی جەبری زیاد لە پێویستیدا بەرهەم هاتووە، زەین و جەستە لاواز بوون، پاڵەوانەکە کۆنترۆڵی کار و بیرکردنەوەی لە دەستداوە، لەگەڵ ئەمەشدا مکوڕە لەسەر کۆنترۆڵکردنی چارەنووس، پارادۆکسەکە لێرەدایە؛ یاریی لۆجیکێکی بازنەیی کە لەناو لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدایە، لای پاڵەوان لەم دۆخەدا نە ڕێگەی گەڕانەوە بوونی هەیە و نە ڕێگەی بەرەوپێشچوون، چونکە ئەو بە ئەنقەست خۆی گەیاندۆتە لێواری مەترسی، دەستشۆردن لە برسێتی بەمانای سەرکەوتن نایەت، بەڵکو تەنیا ئەو مانایە دەگەیەنێت کە یارییەکە تەواو بووە، ئەو دەیەوێت زیندوو بێت و بمێنێتەوە، بەڵام تەنیا لە ژێر کاریگەریی هەلومەرجێکدا، کە خۆی دیاری دەکات و دەیخوازێت؛ مانەوەیەک کە ڕووبەڕووی مەرگی دەکاتەوە.

ئەو بەڕۆژوو دەبێت، بەڵام وەک مەسیحییەک، ژیانی زەوی لە پێناو ژیانی ئاسمان ڕەتناکاتەوە، بەڵکو تەنیا ژین لەو ژیانەدا ڕەت دەکاتەوە، کە پێشکەشی کراوە و تا ئەو ڕۆژووەشی زیاتر بەردەوام بێت، سێبەری مەرگ لەسەر ژیانی تۆختر دەبێتەوە، لە مردن نزیک

دەبێتەوە، بەرەو لێواری هەڵدێرەکە دەڕوات، کە دەگاتە ئەوێ خۆی پێدا هەڵدەواسێت، نە بۆ پێشەوە دەڕوات و نە دەگەڕێتەوە. برسێتی، کە ئەم درز و کەلێنە دەکاتەوە، توانای داخستن و داپۆشینی درزەکەی نییە، ساتەوەختی ڕاگوزەری دەهشەتی پاسکالی دەبێتە دۆخێکی بەردەوام و هەمیشەیی.

کەواتە ڕۆژووەکەشی پارداکۆسکیاڵ و دژخوازە، پێداگربوون لەسەری، وەک مەرگ وایە و مەرگیش بە مانای کۆتایی ڕۆژووەکەیە، کەواتە دەبێت زیندوو بێت، بەڵام تا ئەو شوێنەی کە لەسەر لێواری مەرگدا بیهێڵێتەوە، لە بەردەم بیرۆکەی کۆتاییدا خۆی ڕادەگرێت، تا ئەگەری هەمیشەیی کۆتایی بەردەوام بێت، بەوپێیەی ڕۆژووەکەی نە ئامانجێکی هەیە و نە بەڵێنی سەرفرازی، دژیەکییەکانی دەبێ بە کراوەیی و چارەنەکراوی بمێنێتەوە. بەم جۆرە، ئەم وێنەی نائومێدییە هەمان خرۆشی خۆوێرانکردن دەیهێڵێتەوە، کە لە نەخۆشییەکی مەرگئاکامدا بۆی دەگەڕێین، ڕۆح، لە نائومێدیی خۆیدا بە دوای ئەوەدا دەگەڕێت، کە خۆی هەڵبلووشێت و بەوپێیەی کە ناتوانێت بیکات - ڕێک لەبەر نائومێدبوونی- زیاتر لە نائومێدییدا نوقم دەبێت.

بەپێچەوانەی هونەری دینییەوە، کە تیایدا خۆئازاردان دەتوانێت لە کۆتاییدا بگاتە پاکبوونەوەی ڕۆح، (بۆ نموونە شیعری موکاشەفاتی سەدەی حەڤدەیەم)، برسێتی تەنیا دیالێکتی دەربازبوون دەخاتە ڕوو، لە شیعری **فۆلک گرۆیل** Fulke Greville "لە قووڵاییی شەڕانیەتی مندا" شاعر دەتوانێت بڕوانێتە "ئاوێنەی وێرانکەری ڕەزاڵەت" کە "مرۆڤ وەک میوەی داوەشانی خۆی نیشان دەدات"، بەڵام ئەو دەزانێت ئەمە تەنیا یەکەم هەنگاوە لە پرۆسەیەکی دوو قۆناغیدا، چونکە هەر لەم ئاوێنەیەدا مەسیحیش دەردەکەوێت "لەبەر ئەو گوناهانەی کە مرد، لە هەمان دۆزەخەوە کە لێی دەترسم بۆ ڕزگاربوونی من دێت..."، بەڵام لە ڕۆمانەی **هامسن**دا، ئەو کاتەی قووڵاییەکانی ڕەزاڵەت دەرکەون، ئاوێنەی موکاشەفات (Revelation) خاڵی دەمێنێتەوە.

ئەو لە قووڵاییدا دەمێنێتەوە و هیچ خوایەک بۆ ڕزگارکردنی ئەم پیاوە گەنجە نایەت، ئەو تەنانەت ناتوانێت پشت بە پەناگەی عورفی کۆمەڵایەتی ببەستێت تا خۆی بە پێوە ڕابگرێت، ئەو بێ ڕەگوڕیشەیە، بێ هیچ هاوڕێیەک، ڕووتبووەوە لە شتەکان، لای ئەو ڕێکخستن نادیار و هەموو شتێک بۆتە ڕێکەوت، کردەکانی هەڵقولاوی هیچ نین، جگە لە ئارەزوو و هەستی زەرووەتی ناڕاستەنەکراو؛ کلۆڵبوونی بێزارکەری نارەزایەتیی ئەنەرشیستی، ئەو هێلەکەکەی دەخاتە ڕەهەنەوە تا خێر بە سواڵکەرێک بکات، ئەسپوعارەبانەیەک بەکرێ دەگرێت تا بۆ ناسیاوێکی خەیاڵی بگەڕێت، لە دەرگای ماڵی غەریبەکان دەدات، بەردەوام پرسیاری سەعات چەندە لە پۆلیسەکان دەکات، تەنها لەبەرئەوەی پێی خۆشە و هیچی تر، بەڵام چێژ لەم کارانە وەرناگرێت، ئەم کارانە قوول دەیشڵەژێنن، ئەو شێتانە هەوڵ دەدا ڕێکخستنێک بداتە ژیانی، سەرلێشێواوییەکەی ببڕێنێتەوە، ژوورێک دەستەبەر بکات و داسەکنێت و بنووسێت، بەڵام ئەو ڕۆژووەی گرتوویەتی ڕێگری ئەم کارانەیە، ئەوکاتەی برسێتی دەست پێدەکات، ئەم ڕزگارکەر/قوربانییە خۆی دەرباز ناکات، تا ئەم وانەیە بۆ قوربانییەکەی بکاتە وانەیەکی ئاسان و لەبیرنەکراو. پاڵەوان بە پێچەوانەی خواستی خۆیەوە، گیرۆدەی هێزێکی خۆساز دەبێت و ناچارە کاردانەوەی بۆ خواستەکانی هەبێت.

ئەو هەموو شتێک دەدۆڕێنێت، تەنانەت خۆیشی، دەگاتە قووڵایی دۆزەخێکی بێ خوا و شوناسی دەسڕدرێتەوە، بەڕێکەوت نییە کە پاڵەوانەکەی **هامسۆن** ناوی نییە؛ تا کات تێدەپەڕێت، بەڕاستی لەخۆی خاڵی دەبێتەوە، ئەو ناوانەی لە خۆی دەنێت، هەموویان ساختەن و لەبەر پاڵنەری ساتەوەختی و ڕاگوزەر دروستکراون، ناتوانێت بڵێت کێیە چونکە خۆیشی نازانێت، ناوەکەی درۆیە و بەم درۆیە واقیعی جیهانەکەی دیار نامێنێت.

ئەو دەخزێتە نێو تاریکییەکەوە کە برسێتی بۆی دروست کردووە، ئەوەی دەستی دەکەوێت درزی زمانە، لای ئەو، واقیع بۆتە تێکەڵێک لە ناوی بێ شت و شتی بێناو، پەیوەندی نێوان خود و جیهان لەیەک پساوە.

*"ماوەیەک ڕاکشاو لە تاریکییەکە ڕامام، بەو تاریکییە قووڵەی بڕانەوەی نەبوو، زەینم توانای وێناکردنی چییەتییەکەی نەبوو، ئەقڵم بە هەقیقەتەکەی نەدەشکا، ڕەشییەکەی لەڕادەبەدەر بوو و وێناکردنی ئازاری دەدام، چاوم داخست و لە بەرخۆمەوە کەوتمە ورتەورت، بۆ خۆخەڵەفاندن لە سەر چرپا کۆنەکە کەوتبووم و تەپاوتلم دەکرد، بەڵام سوودی نەبوو، تاریکی دەستبەردار نەبوو و بیرکردنەوەی شڵەژاندبووم، بیرم دەکردەوە بوونم لە تاریکیدا لەناو چووە، ئایا خۆشم بەشێک نەبووم لەو تاریکییە و ئاوێتەی تاریکی نەبووم؟"*

لەو ساتەی کە تەواو ترساوە ئیتر خاوەنی خۆی نەبێت، لەناکاو وشەیەکی تازە دێتە ناو خەیاڵییەوە؛ **کۆبۆوا**، وشەیەک کە لە هیچ زمانێکدا نییە، وشەیەکی بێمانا.

*لە وەجد و خۆشییەکی بێوێنەدا بووم، ژەنگی پیسی و گومان لە ویژدانمدا دەسڕایەوە، مێشکم پاک و ڕووناک بوو.*

ئەو هەوڵ دەدات بۆ وشە داهێنراوەکەی مانایەک بدۆزێتەوە، بەڵام تەنها دەتوانێت بڵێت ئەم مانایانەی نییە، نە "خوا"، نە "باخەکانی تیڤوولی، نە "ئاژەڵداری"، "نە قوفڵ"، نە "هەڵهاتنی خۆر"، نە "کۆچ"، نە "کارگەی جگەرە"، نە "گڵۆڵەی شلیلە".

*"لە ڕاستیدا پێکهات و چییەتی وشەیەکی وەها وا حوکم دەکات، نیشانەی هەستوسۆزی ناوەکی بێت، حاڵەتێکی ڕۆحی تایبەت وەسف بکات... باش ئاگام لەم حاڵە بوو، دواتر لە یادەوەریی خۆمدا دەگەڕێم، کە ڕەنگە حاڵەتێکی ڕۆحی دیاریکراو بدۆزمەوە و ئەم وشەیە بۆ دەرخستنی ئەو حاڵەتە بخەمەکار و بیبڕم بە سەریدا."*

بەلام سەرناکەوێت، ئەو دەنگانەی کە هیی ئەو نین جارسی دەکەن، سەری لێ دەشێوێنن و زیاتر لە گێژاودا نوقمی دەکەن، دوای شڵەژانێکی قورس و قووڵ، کە بەهۆیەوە خۆی لە مەرگ نزیک دەبینێت، هەموو شتێک دەوەستێت و هیچ دەنگێک نایەت جگە لە دەنگی خۆی، کە بەر دیوار دەکەوێت و دەگەڕێتەوە.

ئەم بەشە ڕەنگە بەئازارترین بەشی کتێبەکە بێت، بەلام ئەمە تەنها یەکێکە لە نموونەکانی شیزۆفرینیای زمانی پاڵەوانەکە، لە درێژەی گێرانەوەدا، گاڵتەجاڕییەکانی زۆر جار وەک درۆیان لێ دێت، ئەو کاتەی بۆ قەڵەمە ونبووەکەی سەردانی دووکانی ڕەهنەکە دەکات، (بەڕێکەوت قەڵەمەکە لە گیرفانی هێلەکەکەی کە بە ڕەهن دایناوە جێ دەهێڵێت)، بە خاوەن دووکانەکە دەڵێت بەو قەڵەمە سێ بەرگی مەعریفەی فەلسەفی نووسیوە، دەڵێت ئەم قەڵەمە، قەڵەمێکی تایبەت نییە، بەلام حەزی لێیەتی، بۆ ئەو پیرەپیاوەی کە لە سەر کورسییەکی پارک دانیشتووە، چیرۆکێکی خەیاڵی دەگێڕێتەوە، چیرۆکی کەسێکی خەیاڵی بە ناوی هاپۆلاتی، کە داهێنەری نزای ئەلیکترۆنییە، داوا لە کارمەندی فرۆشگایەک دەکات، کە تاکە شتێک کە بۆی ماوەتەوە، واتە بەتانییە سەوزە پەڕپووتەکەی، بپێچێتەوە، چونکە لە ڕووی نایەت هەر بەو جۆرە بە دەستییەوە بیگرێت، دواتر دەڵێت مەسەلەکە بەتانییەکە نییە، بەڵکو ئینجانەیەکی گرانبەهایە لە ناو بەتانییەکە، تەنانەت ئەو کچەش کە دەیەوێت دڵی بەرێت، لەم چیرۆکانە بە دوور نابێت، ئەو ناوێک بۆ کچەکە هەڵدەبژێرێت _ ناوێک لەبەرئەوەی جوانە خۆشیشە_ ئامادە نییە بە ناوێکی تر بانگی بکات.

ئەم درۆیانە مانایەکی زیاتریان هەیە، لەو تەنزە ساتەوەختییەی کە دەردەکەوێت، لە پانتایی زماندا، درۆ هەمان پەیوەندیی لەگەڵ هەقیقەت هەیە، کە خراپە لەگەڵ چاکە لە پانتایی ئەخلاقدا هەیەتی، وا باوە و ئەگەر باوەڕمان بەمە هەبێت دەگەینە شتێک، بەلام پاڵەوانەکەی هامسون ئیتر باوەڕی بە هیچ شتێک نییە، لای ئەو درۆ

و راستی یەکسانن، برسیتی بەرەو تاریکی پەلکیشی کردووە، ڕێگەی گەڕانەوە بوونی نییە، ئەم هاوکێشەیەی زمان و ئەخلاق، دەگۆڕێت بۆ کرۆکی دوا بەشی ڕۆمانەکە.

*"پێم بەرز کردەوە و کێشام بە شۆستەکەدا، بە هەموو شێوەیەک خۆم ناچار کرد بجووڵێم، بەڵکو ڕەنگە هێزی لەدەستچووم بدۆزمەوە، ددانەکانم لە یەکتر گیر دەکرد، ناوچاوم گرژ دەکرد، چاوەکانم بێهیوا ڕوو دەکردە هەموو لایەک، ئەم جووڵانە کەمەکەم کاریگەرییان دەرکەوت، بە جۆرێک کە هەستم ئەوەندە ڕووناک بوویەوە تێگەیشتم نزیکە بکەوم بە ئەرزا، پاڵم بە دیوارەکەوە نا و لە دیوارەکە دوورکەوتمەوە، کۆڵانەکەش لەگەڵ من دەخولایەوە و سەرم گێژ بووبوو، لە تورەییدا تووشی نزگەرە بووبووم و بەوپەڕی هێزەوە هەوڵی ڕزگاربوونی خۆم دەدا و تەقەلام بوو نەکەوم، حەزم نەدەکرد کەوتوو و ئاوەژوو بمرم، دەمویست بە پێوە و سەربەرز گیانم دەرچێت، ئەسپوعارەبانەیەک بە ئەسپایی بە بەردەممدا تێپەڕی، ئەگەرچی دەبینم بارەکەی پەتاتەیە، بە ئینکارییەوە بە خۆم دەڵێم ئەمە کەلەرمە نەک پەتاتە، سوێندی قورس دەخۆم کە بێگومان باری عارەبانەکە کەلەرمە."*

ئەمەش کۆتاییە، ئێستا ئیدی تەنها دوو ئەگەر لە بەردەمیدا ماوەتەوە: ژیان یان مەرگ و ئەو ژیان هەڵدەبژێرێت، ئەو نایەکی بە کۆمەڵگا وتووە، نایەک بۆ خوا و بۆ وشەکانی خۆیشی، کەمێک دواتر لە هەمان ڕۆژ، شارەکە بەجێ دەهێڵێت، ئیتر پێویست بە درێژەدانی ڕۆژوو ناکات، کارەکەی گەیشتۆتە ئەنجام.

**برسیتی** یان **وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا** [لە نووسینی جیمس جۆیس]، بەڵام ئەم ڕاهێنانە لەگەڵ **هەوڵە** بەرابییەکانی دیکەی نووسەرانی تر جیاوازی سەرەکی هەیە، پاڵەوانی **هامسۆن**، **ستیڤن دیدالۆس** نییە، لە ڕۆمانی **برسیتی**شدا وشەیەک لەسەر تیۆریای جوانیناسی ناوترێت،

جیهانی هونەر بۆتە جیهانی جەستە و دەقە سەرەکییەکە وەلا نراوە، برسیتی خوازەیەک نییە، بەڵکو ناوەڕۆک و کرۆکە سەرەکییەکەیە، ئەگەر ئەوانی تر، بۆ نموونە **رامبۆ** و بەرنامەکەی، بۆ شلەژانی خۆویستانەی هەستەکان، بە شێوازی خۆی جەستەی بۆ بنەڕەتێکی جوانیناسی گۆڕی بێت، قارەمانی **هامسۆن** بە پێداگرییەوە ئەم دەرفەتە ڕەت دەکاتەوە، کە نوقسانییەکانی لە بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە، ئەو لاوازە، جڵەوی بیرکردنەوەی پچڕاوە، بەڵام بەردەوام هەوڵی شەفافبوونی نووسینەکەی دەدات، بەڵام برسیتی بە هەمان ڕادەی ژیانیش کاریگەریی لەسەر شێوازی نووسینەکەشی دادەنێت، ئەگەرچی دەیەوێت هەموو شتێک بۆ هونەرەکەی قوربانی بکات، تەنانەت مل بداتە بەر خراپترین شێوازەکانی سووکێتی، تاکە شتێک کە بەڕاستی کردوویەتی، بە مەحاڵکردنی نووسینە بۆ خۆی، بە سکی برسییەوە ناتوانی بنووسی، ئیتر گرنگ نییە چەندیش هەوڵ بدەی، بەڵام هەڵەیە کە پاڵەوانی **برسیتی** وەک پیاوێکی گێل یان شێت وەلا بخەین، سەرباری هەموو پێوەرەکان، بە ئاشکرا دەزانێت چی دەکات، نایەوێت سەربکەوێت، دەیەوێت شکست بهێنێت.
لێرەدا شتێکی تازە لە قەومانداییە، لە ڕۆمانی **برسیتی**دا جۆرێک بیرکردنەوەی تازە لەبارەی چییەتی هونەر دەخرێتەڕوو، سەرەتا، هونەر لە هونەرمەندەکەی جیا نابێتەوە، ئەمە بەو مانایە نییە کە بڵێین ئەم هونەرە درێژدانە بە ژیاننامەنووسی، بەڵکو ئەمە هونەرێکە کە خستنەڕووی ڕاستەوخۆی هەوڵێکە بۆ خستنەڕووی خود، بە واتایەکی تر، هونەری برسیتی واتە هونەری پێویستی، هونەری ناچاربوون، هونەری مەیل، یەکلابوونەوە مل بۆ گومان دەدات و فۆڕمیش تەسلیمی پرۆسە دەبێت، بە هیچ شێوەیەک ناتوانین ڕێکخستنێکی خۆویستانەی بەسەردا بسەپێنین و سەرباری ئەمەش، زیاد لە هەموو شوێنەکانی تر، جەبرێک هەیە بۆ دەستخستنی شەفافیەت و ڕوونی، ئەمە هونەرێکە کە بەو مەعریفەیە دەست پێدەکات، کە هیچ وەڵامێکی دروست بوونی نییە، هەربۆیە پێویستە

پرســـــیاری دروســـــت بکەیــــن، ئەم پرســــــیارانەش لە ڕێـــــگەی ئەزمونکردنیانەوە دەدۆزرێنەوە، **سامۆیل بیکێت** دەڵێت:

*"ئەوەی دەیڵـێم بەو مانـایە نیـیە کە لەمە بەدوا لە هـونەردا فۆرمێـک بوونی نییە، ماناکەی تەنیا ئەوەیە کە فۆرمێکی نوێ دێتە کایەوە، ئەم فـۆرمەش لەو جـۆرانەیە کە ئاشـووب قبـوڵ دەکـات و هەوڵ نـادات بیخـاتە بـری دانەیەکـی تـر... ئەمـڕۆ ئەرکـی هونەرمەنـد دۆزینەوەی فۆرمێکە کە ئاشووب و گێژاو لە دڵ و هەناوی خۆیدا جێ بکاتەوە"*

**هامسۆن** وێنەی قۆناغە بەرایییەکانی گەشەکردنی ئەم هونەرمەندەمان بۆ دەخاتە ڕوو، بەڵام لە چیرۆکەکەی **کافکادا (هونەرمەندی برسێتی)** جوانیناسیی برسێتی دەگاتە وردترین لێکدانەوە و شیکاری خۆی، لێرەدا پارادۆکسـی ڕۆژوویەک کە پـاڵەوانی **هامسـۆن** گرتـوویی -بنبەسـتێکی هونەری کە پێی دەگات- لە چیرۆکێکدا لەیەک دەبەسترێن، کە هـونەری هونەرمەنـد هەمـان ڕۆژووگرتنەکەیەتـی، هونەرمەنـدی برسـێتی هەم هونەرمەنـدە و هەم هونەرمەنـد نیـیە، ئەگەرچـی دەیەوێـت نمایشـەکەی ستایش بکرێت، بەڵام پێداگری دەکات کە نابێ ستایش بکرێت، چونکە کـارەکەی هـیچ پەیوەنـدییەکی بە هـونەرەوە نیـیە، ئەو بڕیـاری ڕۆژووی داوە، چـونکە ناتوانێـت خواردنێـک بـدۆزێتەوە کە پێـی خـۆش بێـت، لەم لایەنەوە، نمایشـەکانی، نمایشـێک نـین بـۆ سـەرقاڵکردنی خەڵکـی، بەڵکـو زمانحاڵی نائومێدییەکی شەخسییە کە لێگەڕاوە خەڵکی تەماشای بکەن.
وەک پاڵەوانەکەی **هامسۆن**، **هونەرمەندی برسێتی**ش ئیرادەی بەسەر خۆیدا نییە، هونەرەکەی ئەو هیچ نییە جگە لە نمایشکردنی دانیشتن لە قەفەز و دابڕاو لە ژیـانی، تەنـانەت ئەگەر ئەکتەریش نەبـوایە، ژیـانی نەدەگۆڕا، ئەو نایەوێت کەس بەختەوەر و خۆشـحاڵ بکات، لەڕاسـتیدا هەر ناکرێ لە نمایشەکەی تێبگەیت یان قەدری بزانیت.

*"هیچ کەس ناتوانێت، بە بەردەوامی، شەووڕۆژ، بینەری هونەرمەندی برسێتی بێت، هەر لەبەرئەمەش کەس ناتوانێت شایەتی بدات، کە ئەم ڕووژووگرتنە پێداگر و بەردەوام بووە؛ هیچ کەس، مەگەر هونەرمەند خۆی، ئاگای لەم شتە نییە، هەربۆیە ئەو بە ناچاری تاکە بینەری ڕازی و بێگەیی ڕۆژووەکەی خۆیەتی" (کافکا. هونەرمەندی برسێتی)*

بەڵام ئەمە چیرۆکی کلاسیکی هونەرمەندێک نییە کە لێی تێناگەن، چونکە خودی چییەتی ڕۆژووگرتن خۆی ناداتە دەست تێگەیشتن، ئەمە پرۆسەیەکە هەر لە سەرەتاوە بە مەحاڵبوونی خۆی دەزانێت، خۆی بە شکستێکی حەتمی مەحکوم دەکات، کە هەمیشە لە جووڵەدا بەرەو مەرگ دەگاتە لێوارەکەی، چارەنووسەکەشی نە گەیشتنە بە ئاکام و نە لەناوچوون، لە چیرۆکەکەی **کافکادا**، هونەرمەندی برسێتی دەمرێت، بەڵام تەنها لەبەرئەوەی کە واز لە هونەرەکەی دەهێنێت، واز لە سنوور و ئاستەنگی سەپێندراوی بەڕێوەبەرەکەی دەهێنێت، هونەرمەندی برسێتی زێدەڕۆیی دەکات، بەڵام ئەمە مەترسیی ناوەکی هەموو کردەیەکی هونەرییە: دەبێ ئامادەی دەستشۆردن بیت لە ژیانت.

لە کۆتاییدا، دەکرێ هونەری برسێتی وەک هونەری ئەگزیستانسیالیستی وەسف بکەین، ئەم هونەرە جۆرێک ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ مەرگ، مەبەستم لە مەرگ، مەرگێکە کە ئەمرۆ ژینی دەکەین و ئەزموونی دەکەین؛ بە بێ خوا، بەبێ ئومێدی دەربازبوون، مەرگ وەک کۆتایی لەناکاو و پووچی ژیان.

پێم وانییە یەک هەنگاو لەمە زیاتر بەرەو پێشەوە چووبین، تەنانەت ڕەنگە زۆر زیاتر لەوەی پێمان قبوڵ دەکرێت لەم خاڵەدا چەقیبین، بەڵام لە هەموو ئەم ماوەیەدا، هونەرمەندانێک توانیویانە ئەم خاڵە بناسنەوە، تێگەشتنێکی وا، ناسینەوەیەکی وا، پێویستی بە ئازایەتییە و زۆر نین ئەوانەی کە ئامادە بن، هەموو شتێک لە پێناوی هیچدا بخەنە مەترسییەوە، بەڵام ئەمە شتێکە کە لە **برسێتی**دا ڕوودەدات، ڕۆمانێک کە

له سالی ۱۸۹۰ نووسراوە، پاڵەوانەکەی **هامسۆن** بە شێوەی ڕێکخراو، خۆی لە کۆتوبەندی هەموو باوەڕ و سیستمێک دەرباز دەکات. لە کۆتاییدا، بەهۆی برسێتییەکەوە کە بەری داوەتە گیانی خۆی، دەگاتە هیچ، هیچ شتێک نییە ناچار بە بەردەوامیی بکات، بەڵام بەهەرحاڵ بەردەوام دەبێت و ڕێک پێ دەنێتە ناو سەدەی بیستەمەوە.

The Art of Hunger - Paul Auster -1981

سوپاسی ئەم هاوڕێیانە دەکەم کە هاندەر و پشتگیرییان کردم:
(سەرکەوت جەبار، بەیان ڕەشیدی، شاهۆ عارف، زانا ئیبراهیم، ئەکبەر حەسەن، بڕیار محەمەد، ئەحسەن ئیبراهیم، ئازادە ڕەحمانی)



من دەستم گرتبوو بە قۆڵمەوە و شێتانە پێدەکەنیم و قاقام لێ دەدا. زۆر سەیر پێدەکەنیم؛ چونکە بچوکترین دەنگ لە گەروومەوە دەرنەدەهات، پێکەنینێکی بێدەنگ و پڕئازار بوو. وەکئەوەی ئاهێکی پڕسوێ بێت کە لە سینەمەوە دێتە دەر یان قوڵپی گریانێک.

**THE HUNGER**
**KNUT HAMSUN**
**TRANSLATED TO KURDISH: MOHAMMED Q. ABED**

غەزەلنووس